عەلی باپیر

# ئەدەب و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان

## لەبەر تیشکی وەحی و عەقڵ دا



1442-2020

# ئەدەب و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لەبەر تیشکی وەحیی و عەقڵ دا

نووسینی: عەلی باپیر



چاپی یەکەم ١٤٤٢ك-٢٠٢٠ز



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
ئـــەدەب و ڕەوشـــتە کۆمەڵایەتییـــەکان لەبـــەر تیشـــکی وەحیـــی و عـــەقڵ دا ،
عەلی باپیر(نووسەر)

٣٧٦ لاپەڕە،
١٧ * ٢٤ سم
بابەت، ئایینی
ISBN: 978-9933-593-89-6

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢١٨) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نییە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین : جمعە صدیق کاکە
خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

بسم الله الرحمن الرحيم

{ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ }

الفرقان: ٦٣



# پێشکەش بێ

بەو خوشك و برا مسوڵمانانەی لەسایەی ئیمانی قووڵ و پارێزكاریی بەپێزیانەوە، لە هەڵس و كەوتەكانی ژیانی ڕۆژانەیان لەنێو كۆمەڵگادا، خۆیان بە ئەدەب و ڕەوشتە بەرز و پەسندەكان دەڕازێننەوەو، بە زمانی كردار و حاڵ: ئاكارە پەسند و خەسڵەتە ڕەندەكانی: پێغەمبەری خوا (محمد) صلى الله عليه وسلم و هاوەڵە بەڕێز و دڵسۆزەكانی و پێشینی چاك، لەخۆیان دا بەرجەستە دەكەن و دەژیەننەوە.

# پێشەکی و ڕێخۆشکردن

إنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَن يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾ النساء.



﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ:

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلاَمُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار.

بەڕێزان!

خوشك‌و برایانی مسوڵمانی خۆشەویست، ئەمە زنجیرە دەرسێکە بە ناوونیشانی: (ڕەوشت‌و ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان)، ئەم زنجیرە دەرسە، سی (٣٠) ئاڵقەیەو، لەو سی (٣٠) ئاڵقەیەدا هەوڵمان داوە: ژمارەیەکی بەرچاو لە گرنگترین و هەستیارترین ڕەوشت‌و ئەدەبی بەرزو پەسند، باس بکەین، کە شەریعەت پێویستی کردوون، یاخود بەلای کەمەوە بە پەسندی داناون، کە مسوڵمانان لە ژیان‌و، گوزەران‌و، لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی کۆمەڵایەتیی خۆیاندا بەکاریان بێنن.

هەڵبەتە هەر کامێك لەو ئەدەب‌و ڕەوشتانە، کە ئێمە قسەیان لێ دەکەین، هەڵدەگرێ لە چەند ئاڵقەیەکدا باس بکرێ، بگرە هەر کامێکیان هەڵدەگرێ، کە کتێبێکی لەبارەوە بنووسرێ، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین زۆر بە گوشراویی‌و،



پوختییو، بە زمانێکی سادەو ڕەوان، کە خوا پشتیوان بێ هەموو کەس لێی حاڵی بێ، باسی ئەو ئەدەبو ڕەوشتانە بکەین، ئەویش وەك ئەنجامدانی بەشێك لە ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە بەرنامە تێروتەواوی خوا (ئیسلام)و، بەرانبەر بە کۆمەڵگایەکەشمان.

شایانی باسیشە ئێمە لە مەوسووعەی: {ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا} سەد و پەنجاو پێنج (١٥٥) خەسڵەت و ئاکاری بەرز و پەسندی مسوڵمانانەمان باسکردووە، لە هەرسێك بوارەکانی:

١- مامەڵە لەگەڵ خۆدا.

٢- مامەڵە لەگەڵ خوادا.

٣- مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا.

بەڵام هەستم کرد, کە پێویستە تیشکێکی باشیش بخەینەسەر: ئەو ئەدەب و ڕەوشتانەی, کە پێویستە مسوڵمانان لە بواری هەڵس و کەوتە کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی ڕۆژانەیان دا، ڕەچاویان بکەن و خۆیانیان پێ برازێننەوە.

بۆیە دەتوانین بڵێین:

مەوسووعەی ناوبراوو ئەم زنجیرە دەرسە، تەواوکاری یەکدین و، دەگونجێ لە داهاتوودا پێکەوە لەژێر ناونیشانی: {ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی و ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان}دا چاپ بکرێنەوە، وەك مەوسووعەیەکی گشتگیر لەو بوارەدا.

شایانی باسیشە ئەم زنجیرە دەرسە بە سی (٣٠) ئەڵقەو،[١] لە کـەناڵی ئاسمـانیی پەیامەوە لە شەوانی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٤٠ك- ٢٠١٩ز)دا پێشـکەش کراون و، دواتر لەلایەن برایەکی دڵسۆز-خوا پاداشتی بداتەوە- هێنراونـە سـەر کاغەز و تایپ کراون و، پاش پێداچوونەوەی وردی خۆم، بوونەتـە ئـەم کتێبـەی بەردەستت.

هیواداریشم ئەم کتێبە ڕۆڵێکی گرنگ و کاریگـەر بگێـڕێ، لـە ڕاسـتکردنەوەی گەلێك هەڵەوپەڵەی زۆرێك لە خوشك و برایانی مسوڵمان، لـە بـواری هـەڵس و کەوتە کۆمەڵایەتییەکان داو، بـە گشـتییش هۆکـاری چـاو بـەخۆدا گێڕانـەوەو پابەندیی باشتر بێ، بـە شـەریعەت و ڕەوشـت و ئەدەبـە بـەرز و پەسـندەکانی، چونکە گومانی تێدانیە کە وێڕای ئەوەی: ڕەوشت و ئەدەبە بەرز و پەسـندەکان، سەنگی مـەحەکی مسوڵمانەتیی و دینداریین، هۆکارێکی یـەکجار کاریگەریشـن بۆ زیـاتر تۆکمـە و تونـدوتۆڵکردنی کۆمـەڵگا و، پاراسـتنی لـەو نەخۆشـیی و دەردانەی دەبنە مایەی پووچەڵبوون و داڕووخانی.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين، والحمدلله رب العالمين.

٢٠٢٠/١/٢٤ز
١٤٤١/٥/٢٩ك
هەولێر



١) سەرجەم دەرسەکان لە کەناڵی تایبەتیی خۆم لە (یوتیوب)یش دانراون، کە ئەمە لینکەکەیەتی:
https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwt36jhixW33p9rjq60exzQA

ئاڵقەی یەکەم :

# پێناسەو گرنگیی ڕەوشت و ئەدەبە کۆمەڵا یەتییەکان



بەڕێزان!

ئەم دەرسەمان لە دوو بڕگەدا دەتوێژینەوە:

بڕگەی یەكەم: پێناسەی (ئەدەبو ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكان)ی تێدا دەكەین، كە مەبەست پێیان چییە؟.

بڕگەی دووەم: باسی گرنگیی‌و پێویستیی (ڕەوشتو ئەدەبە كۆمەڵایەتییەكان)ی تێدا دەكەین.

## بڕگەی یەكەم: پێناسەی ئەدەبو ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكان:

ئێمە دوو وشە بەكاردێنین: ڕەوشتو ئەدەب.

أ- ڕەوشت:

ڕەوشت: لە زمانی عەرەبییدا (خُلُق)ی پێ دەگوترێ، كە بە (أخلاق) كۆدەكرێتەوە.

١)- (راغب الأصفهاني) لە پێناسەی (خُلُق)دا، كە بە كوردیی (ڕەوشت)ە، یان (ئاكار)، دەڵێ: {الخَلْقُ، والخُلُقُ والخُلْقُ في الأصل واحِدٌ، كالشَّربِ والشُّرب، والصَّرم والصُّرْمِ، لكن خُصَّ الخَلْق بالهيئات والأشكال والصور المُدْرَكة بالبَصَرِ، وخُصَّ الخُلُقُ بالقوى والسَّجايا المُدْرَكَةِ بالبصيرة}[١].

واتە: وشەی (خَلْق) و (خُلُق) یان (خُلْق) لە ڕیشەدا یەكن، وەك (شَرْب) و (شُرُب) هەردووكیان بە مانای خواردنەوە دێن، هەروەها (صَرْمُ) و (صُرُم)

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ١٥٨.

هەردووکیان بە مانای بڕین دێن، بەڵام وشەی (خَلْق) تایبەت کراوە بەو شێوەو دیمەنانەوە کە بەچاو دەبیندرێن، بە چاوی سەر و، وشەی (خُلُق)یش تایبەت کراوە، بەو هێزە پەنهانانەو، بەو خەسڵەتانەوە, کە بە عەقڵ‌و بەصیرەت دەرك دەکرێن.

لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە، کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەماشای ئاوێنەی دەکرد، دەیفەرموو: {أَللَّهُمَّ كَمَا أَحْسَنْتَ خَلْقِي فَأَحْسِنْ خُلُقِي} [1]، واتە: ئەی خوایە! وەك چۆن شکڵ‌و دیمەنت، {یاخود جەستەت} باش دروست کردووم، ڕەوشتیشم جوان بکە.

٢)- (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆی (الجامع لأحكام القرآن)دا دەڵێ: {حقيقة الخُلُقِ في اللغة: هو ما يأخذ به الإنسان نفسه من الأدب، ويسمى خُلُقاً لأنه يصير كالخِلقة فيه} [2]، واتە: لە ڕاستییدا لە ڕووی زمانەوە، وشەی (الخُلُق) ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی لەسەر ڕادەهێنێ لە ئەدەبو خەسڵەتی جوان، بۆیەش گوتراوە: (خُلُق) چونکە لە مرۆڤدا دەبێتە بەشێك لە سروشتی.

ب- ئەدەب:

وشەی (أدب) کە لەزمانی کوردییش دا بەکاردێ، شارەزایانی زمان ئاوای پێناسە دەکەن:

١- (المعجم الوسيط) [3]، کە فەرهەنگێکی ناوداری زمانی عەرەبییە.

٢- فەرهەنگی مەزنی (لسان العرب) [4] ئاوا وشەی ئەدەب شیی دەکەنەوە:

---

١) أخرجه أحمد: ٣٨٢٣، والأدب المفرد: ٢٩٠، وابن حبان: ٩٥٩، وَصَحَّحَهُ الألباني في إرواء الغليل: ٧٤.

٢) الجامع لأحكام القرآن، ج٨/، ص٢٢٧.

٣) ص٩.

٤) ج١، ص (٩٣ و ٩٤).

{الأدب رياضة النفس بالتعليم والتهذيب على ما ينبغي والأدب: جملة ما ينبغي لذي الصناعة أو الفن، أن يتمسَّك به، كأدب القاضي، وأدب الكاتب، والجميل من النظم والنثر، أدُبَ فلانٌ يأدُبُ أدباً: راضَ نَفْسَه على المحاسن، وحَذِقَ فنون الأدب فهو أديب، وأدَّبه راضَه على محاسن الأخلاق}.

ئەمە كۆی قسەی هەردووكیانە: دەڵێن: ئەدەب بریتیە لە مەشق پێ كردنی خۆ، لەسەر فێربوون و خۆپاڵفتە كردن و خۆڕاهێنان لەسەر ئاكارو ڕەوشتێك كە پێویستە، هەروەها (ئەدەب) بریتیە لەوەی كە هەر خاوەن پیشەیەك پێویستیی پێیەتی، یان هەر خاوەن هونەرێك پێویستیی پێیەتی، كاری پێ بكات، وەك ئەدەب و ئاكاری دادوەر، دەبێ چۆن مامەڵە بكا لەگەڵ ئەوانەی كە دێن بۆ لایو دادوەرییان لەنێواندا بكا، هەروەها ئەدەبی نووسەر دەبێ چۆن بنووسێ.

هەروەها وشەی ئەدەب بۆ هەر پەخشانو شیعرێكی جوان بەكاردەهێندرێ، دەگوترێ: (أدُب فلانٌ) واتە: فلان كەس خۆی ڕاهێنا لەسەر ڕەوشتە جوانەكان و، لە هونەرەكانی ئەدەب دا سەرڕاستو كارامە بوو، بۆیە پێی دەگوترێ: ئەدیب، (أَدَّبَهُ)ش واتە: غەیری خۆی ڕاهێنا، لەسەر ڕەوشتی جوانو ئاكاری پەسند.

لە شیعردا لەبارەی ئەدەبو ڕەوشتی جوانەوە هاتوە:

**كُن ابنَ مَنْ شِئتَ واكتَسِب أدَباً يُغنيكَ مَأثُورُهُ عَنِ النَسَبِ**
**فإنَّ الفَتى مَن يَقولُ: ها أنا ذا وَليسَ الفَتى مَن يَقولُ: كانَ أبي**

واتە: كوڕی هەر كەسێك دەبی ببە، بەڵام ئەدەب وە دەست بێنە، ئەو كاتە ئەو ئەدەبە تۆ بێنیاز دەكا، لە ڕەچەڵەك، كوڕ ئەو كوڕەیە بڵێ: من ئەوەتام، كوڕ ئەو كوڕە نیە بڵێ: بابم فلان كەس بوو.

واتە: هەوڵبدە ڕەوشتو ئەدەبی جوان لەخۆتدا کۆ بکەیەوەو، خۆتیان پێ برازێنیەوە، ئەوە تۆ بێ نیاز دەکا لە ڕەچەڵەكو، لەوە کە کوڕی فلان کەسو، فیسار کەسی.

## پەیوەندیی نێوان ڕەوشت و ئەدەب:

شایانی باسە: هەردووك وشەی: ڕەوشتو ئەدەب (خُلُق) و (أدب)، کە ئێمە لە کوردیدا بۆ (أَدَبْ) هەر وشەی {ئەدەب} بەکاردێنین، بەڵام بۆ وشەی (خُلُق) {ڕەوشت} بەکاردێنین، خاڵی پێکگەیشتنیان زۆرن و زۆر ئاوێتەو تێکهەڵکێشن، بۆیە منیش لەم زنجیرە وانەیەدا، هەر بە تێکهەڵکێش هێناومن، بەڵام دەتوانین بڵێین: وشەی ئەدەب زیاتر حاڵەتی کردەیی هەیە و، وشەی ڕەوشت (خُلُق) زیاتر حاڵەتی ئاکارو سیفەت هەبوونی هەیە، جیاوازییەکی دیکەشیان ئەوەیە، کە وشەی ئەدەب زیاتر هەڵسوکەوتی وردو پەنهان دەگرێتەوە، وەك: ئەدەبی نانخواردن، ئەدەبی خەوتن، ئەدەبی بەرومەجلیس، وەك دوایی باسیان دەکەین.

لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی ئەدەبەوە هاتوە: {مَا نَحَلَ وَالِدٌ وَلَدَهُ أَفْضَلَ مِنْ أَدَبٍ حَسَنٍ} [1]، واتە: هیچ بابێك دیارییەکی باشتر لە ئەدەبی جوانی بە ڕۆڵەکەی خۆی نەبەخشیوە.

بەڵێ، ئەگەر بابو دایك منداڵی خۆیان، ڕۆڵەی خۆیان لەسەر ئەدەبو ڕەوشتو ئاکاری پەسند بار بێنن، باشترین دیارییو خەڵاتیان پێ داوە.

١) أخرجه أحمد ١٥٤٣٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف لضعف عامر بن صالح بن رستم، وأخرجه الحاكم: ٧٦٧٩، وقال الذهبي في التلخيص: مرسل ضعيف.

دیارە ڕەوشتو ئەدەبە كۆمەڵایەتییەكان واتە: ئەو ئەدەبو ڕەوشتو ئاكارە بەرزو پەسندو جوانانەی، كە چینو توێژەكانی كۆمەڵگاو، تاكەكانی كۆمەڵگا مامەڵەیان پێ لەگەڵ یەكدیدا دەكەن، چونكە وەك چۆن ڕەوشتی كۆمەڵایەتیی هەیە، ڕەوشتی سیاسییش هەیە و، ڕەوشتی ئابوورییش هەیەو، ڕەوشتی خێزانییش هەیە، هەڵبەتە ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكان، كەمو زۆر پەیوەستن بە هەموو بوارەكانی ژیانەوە: تاكیی، خێزانیی، كۆمەڵایەتیی، سیاسیی، ئابووریی، بەڵام ئێمە زیاتر مەبەستمان پێیان ئەو بوارەیە كە لە ڕووی مامەڵەی كۆمەڵایەتییەوە تاكەكانی كۆمەڵگاو، چینو توێژەكانی كۆمەڵگا لەنێو خۆیاندا بەرپای دەكەن.

## بڕگەی دووەم: گرنگیی ئەدەبو ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكان:

بە تەئكید ئێمە كە دەڵێین: ڕەوشتو ئەدەبە كۆمەڵایەتییەكان، واتە: ڕەوشتو ئەدەبە پەسندو بەرزو جوانە كۆمەڵایەتییەكان، ئنجا هەركام لە: وشەی ڕەوشت و، وشەی ئەدەبیش، زیاتر بۆ خەسڵەتە بەرزەكان، بۆ ئاكارە پەسندو جوانەكان بەكار دەهێنرێن، ئەگەرنا لە ئەسڵی زماندا: وشەی (خُلُق) ڕەوشت، دەگونجێ مەبەست پێی ڕەوشتی خراپ بێ، یاخود چاك بێ، بەڵام لە عورفو باوی خەڵكدا، وشەی: ڕەوشت، زیاتر بۆ ڕەوشتی بەرزو جوان بەكاردێ، واتە بۆ (حُسنُ الخُلُق)، ئەگەرنا لە ڕاستییدا لە ئەسڵی زماندا، وشەی (خُلُق) دەگونجێ مەبەست پێی (الخُلُق السیئ) ڕەوشتی خراپ و ئاكاری خراپ و هەڵسوكەوتی خراپ بێ.

بە نسبەت گرنگیی ئەدەبو ڕەوشتی بەرزەوە، دەتوانین لە پێنج خاڵان دا بەخێرایی ئاماژەی پێ بکەین:

**١- ڕەوشتو ئەدەبی بەرزو جوان، عیبادەتێکە مرۆڤ بۆ خوا ئەنجامی دەدا:**

پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە دەفەرموێ: {إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ} [1]، واتە: بێگومان بڕوادار بە ڕەوشتی جوانی، دەگاتە پلەی کەسێك، کە هەمیشە بەڕۆژووەو، هەمیشەش شەونوێژ دەکات.

واتە: کەسێك کە ڕۆژووە سوننەتەکان نابوێرێ و، شەونوێژیش ناپەڕێنێ، پلەکەی چەندە؟ کەسێکیش کە ڕەوشتو ئەدەبی بەرزو جوانە، با ئەو عیبادەتەشی نەبێ، دەگاتە پلەی وی، کەواتە: ڕەوشتو ئەدەبی جوانیش، جۆرێکە لە گوێڕایەڵیو عیبادەت، بۆ خوا ئەنجام دەدرێت.

**٢- ڕەوشتو ئەدەبی جوان، هۆکاری نزیکییە لە خوا (سبحانه وتعالی):**

ئێمە بەچیی لە خوا نزیك دەبینەوە؟ بە تەئکید بەوە کە گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بین بۆ خوا، ئنجا خوا (سبحانه وتعالی) وەك چۆن فەرمانی پێ کردووین: بیپەرستین، فەرمانیشی پێ کردوین کە ڕەوشتمان بەرزو جوان بێ، بۆ وێنە:

أ- خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ آل عمران: ١٤٦، واتە: بێگومان خوا خۆڕاگرانی خۆشدەوێن.

---

١) أخرجه أبو دَاوُدَ: ٤٧٩٨، وصححه الألباني.

ب- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾ البقرة: ٢٢٢، واتە: بێگومان خوا گەڕاوانی خۆشدەوێن و خۆپاککەرەوانی خۆش دەوێن.

ج- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾ آل عمران:١٥، واتە: بەدڵنیایی خوا پشت بەخوابەستوانی خۆشدەوێن.

د- ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ آل عمران: ١٣٤، واتە: خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن.

هـ- ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ آل عمران: ٧٦، واتە: ئنجا خوا بەدڵنیایی پارێزکارانی خۆشدەوێن.

کەواتە: ئەگەر ئەهلی صەبر بین، ئەهلی ئیحسان بین، ئەهلی تەقوا بین، ئەهلی تەوەککول بین، خۆ پاککەرەوە بین، ئەهلی تەوبەو گەڕانەوە بین بۆ لای خوا، مانای وایە خوای پەروەردگار خۆشی دەوێین، کەواتە: بەهۆی ڕەوشتی بەرزو ئەدەبی جوانەوە، لەخوا نزیك دەبینەوەو، دەبینە خۆشەویستی خوای پەروەردگار.

### ٣- ئەدەبو ڕەوشتی جوان لە خودی خۆیدا فەزیلەتە:

بۆ وێنە: ڕاستگۆیی (صدق) ئەگەر گریمان پەیوەستیش نەبێتەوە بەپاداشتی خواوە، هەر لە خودی خۆیدا ڕاستگۆیی فەزیلەتە، خەڵك ڕاستگۆییو ڕاستگۆیانی خۆش دەوێت، هەروەها ئەمانەت پارێزیی فەزیلەتە، خەڵك ئینسانی ئەمینی خۆش دەوێ، هەروەك ڕقی لە ئینسانی خائین هەڵدەستێ، دیسان دادگەریی فەزیلەتە، خەڵك دادگەرانی خۆش دەوێن، بەپێچەوانەوە: خەڵکی ستەمکاری ڕق لێ دەبێتەوە.

هەروەها پاکیی‌و چاکیی سیفەتی چاکن و، خەڵك پاکان و چاکانی خۆشدەوێن و، ڕقیشیان لە پێچەوانەی پاکیی‌و چاکیی دەبێتەوە.

کەواتە: سێیەمین جۆری گرنگیی ئەدەب‌و ڕەوشتی بەرزو جوان، لەوەدایە کە ئەدەب و ڕەوشتە بەرز و پەسندەکان لە خودی خۆیاندا فەزیلەتن و، دەبنە هۆی تەواوکردنی مرۆڤ، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێ: {إِنَّمَا بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخْلاقِ}[1]، واتە: من تەنها بۆ ئەوە ڕەوانە کراوم، کە ڕەوشتە بەرزو جوانەکان تەواو بکەم، واتە: لە خۆمیاندا بەرجەستە بکەم، بە تێروتەواویی، خوای بەرز و مەزنیش، کە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم:٤. واتە: مسۆگەر (ئەی موحەممەد!) تۆ لەسەر ڕەوشتێکی (پەسند و) مەزنی، ئەوە گەورەترین شایەدیی دانە بۆ موحەممەد پێغەمبەری کۆتایی خوا، (صلى الله عليه وسلم)، کە لە لووتکەی ئەدەب و ڕەوشتی بەرز و پەسند دابووە.

### ٤- بە هۆی ڕەوشت‌و ئەدەبی بەرزو جوانەوە، مرۆڤ هەڵسوکەوتی ئاسان دەبێ لەگەڵ خەڵکدا:

کێ لەگەڵ خەڵکدا تێکدەگیرێ‌و تووشی شەڕو کێشە دەبێ؟ ئەو کەسەی کە بە سیفەتە خراپەکان پۆخڵ بووە، ئەو کەسەی: درۆ دەکا، خیانەت دەکا، دزیی دەکا، غەیبەت دەکا، ناڕاستە، ناڕێکە، بەڵام ئینسانی ڕاست‌و، ساغ‌و، پاك‌و، چاك‌و، دڵسۆز بۆ خەڵك، مامەڵەی لەگەڵ خەڵکدا خۆش‌و ئاسان دەبێ.

---

١) رَوَاهُ البَيْهَقِي في الكبرى ٢٠٥٧١، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وصححه الألباني في الصحيحه: ٤٥.

**٥- دووریی لە عەیبداریی‌و گوناهباریی:**

ئەمەیان ئەوانەی پێشەوە هەموویان کۆ دەکاتەوە، لەڕاستییدا ئینسان بەهۆی ڕەوشتی جوان‌و ئەدەبی بەرزەوە، لە عەیبداریی نێو خەڵك و، لە گوناهباریی لای خوا، واتە: لە عەیبداریی دنیاو، لە گوناهباریی قیامەت، دەپارێزرێ.

خوا بە لوتف‌و کەرەمی خۆی یارمەتیمان بدات، کە خۆمان وا لێ بکەین، بڕازێینەوە بە ئەدەب‌و ڕەوشتی بەرزو جوان و، خۆمان بژار بکەین لە خووی خراپ‌و سیفەت‌و ئاکاری بەد و دزێو.

بەڕێزان !

لەم ئالْقەی دووەمدا باسی (ڕەوشتو ئەدەبە خودییەکان)، یانی: (الأخلاق والآداب الذاتية) دەکەین، ئەو ڕەوشتو ئەدەبانەی کە مرۆڤ دەبێ لە زاتی خۆیدا بەرجەستەیان بکاو بیانهێنێتە دی، ئنجا بێگومان لە خودی خۆدا بە ئەدەب بوونو، ڕەوشت بەرز بوون، بناغەی لەگەڵ دەوروبەرو لەگەڵ خەڵکدا بە ئەدەب بوونو ڕەوشت بەرز بوونە، هەروەك چۆن: بە ئەدەب بوون لە خزمەت خوا (سبحانه وتعالى) و، لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بناغەی هەموو جۆرەکانی ئەدەبو ڕەوشتی بەرزو جوانە.

کەواتە: ئەگەر بمانەوێ لەگەڵ خەڵکدا بە ئەدەبە بەرزەکانو، بە ڕەوشتە پەسندەکان مامەڵە بکەین، سەرەتا دەبێ لە خزمەت خوادا (سبحانه وتعالى) بە ئەدەب بین، پاشان لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، ئنجا کە وامان کرد لە خودی خۆشماندا، ئەدەبو ڕەوشتو بەهای بەرز لەخۆماندا دێنینە دی، ئنجا هەرکات لە خزمەت خوادا بە ئەدەب بووین و، لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و, هەروەهاله زاتی خۆماندا خاوەنی ئەدەبو ڕەوشتی بەرزو جوان بووین، زۆر باش دەتوانین لەگەڵ خەڵکدا بە ئەدەبو ڕەوشتی بەرزو پەسند مامەڵە بکەین.

هەڵبەتە لە خودی خۆدا، بە ئەدەب بوون و، ڕەوشت بەرز بوون، زۆر شت دەگرێتەوەو، دەگونجێ کتێبێکی لەسەر دابنێین، من کتێبێکم هەیە لەو بارەوە بەناوی: (مەوسووعەی: ڕەوشتو ئاکاری ئیسلامیی)، کە شەشسەد (٦٠٠) لاپەڕ زیاترەو، سەد و پەنجاوپێنج (١٥٥) ڕەوشت و خەسڵەتی بەرز و پەسندم تێدا باسکردوە، بەڵام ئێمە دەتوانین بڵێین: ئەدەبو ڕەوشتە خودییەکان، ئەو

ئەدەبو ڕەوشتانەی کە تاك، مرۆڤ لە زاتی خۆیدا دەیانهێنێتە دی دەبن بە دوو (٢) بەشی سەرەکیی:

## بەشی یەکەم: پاكو چاکبوونی ڕووحو ناخو دڵو دەروون:

چونکە مرۆڤ دوو بەشە، بەشێکی پەنهان و، بەشێکی دیارو بەرچاو، بەشە پەنهانەکەی ڕووحی پێ دەگوترێ، دەروونی پێ دەگوترێ، ناخی پێ دەگوترێ، دڵی پێ دەگوترێ، ئنجا بەش و هۆکاری سەرەکیی‌و بنەڕەتیی خاوەن ئەدەبو ڕەوشتی بەرزو جوان بوونی مرۆڤ، لە زاتی خۆیدا، بریتیە لەوە کە ناخەکەی، دەروونەکەی، دیوی پەنهانی، پاكو چاك بێ، کە ئەویش دوو شتان دەگرێتەوە:

١) عەقڵو هۆش و بیرۆکەکانی.

٢) دڵو دەروونو هەستو نەستەکانی.

عەقڵ، چەقی بیرکردنەوەیە، چەقی هۆشە، چەقی زانست و زانیارییە، دڵیش چەقی ئیرادەو ویستنو نەویستنو خۆشەویستیو ڕق لێ بوونەوەو ڕەفزکردنو قبووڵکردنو بڕیاردانو خولیاو هەستو نەستەکانە، هەروەها چەقی عاتیفەو سۆزە.

مرۆڤ بە عەقڵ زانیاریی کۆدەکاتەوەو، بەرێی خۆی دەبینێ، بەڵام بە دڵو دەروون، ئەو شتانەی، کە پێی چاك و پەسندن، خۆشیی دەوێنو، بۆیان دەچێ و، ئەو شتانەی، کە پێی خراپ و ناپەسندن، هەوڵدەدات خۆیان لێ بپارێزێو خۆیان لێ دووربگرێو ڕەفزیان بکا.

کەواتە: بەشی یەکەم لە ڕەوشت و ئەدەبی بەرز و پەسند، بریتیە لە پاكو چاکبوونی ناخو ڕووحو دەروون، کە ئەویش وەك گوتم: دەبێتەوە بە دوو لق:

١- عەقڵو هۆش، کە دەبێ عەقڵو هۆشەکە ڕازاوە بێ و، ئاوەدان بێ، بە زانیاریی بەسوود، بە تێگەیشتن، بە وریاییو هۆشیاریی لەبارەی دینو ژینەوە.

٢- دڵو دەروون، کە دەبێ دڵو دەروونەکەش بێداربێ بە یادی خواو، ئاوەدانو ڕازاوە بێ بەو سیفەتانەی کە لەلای خوای پەروەردگار پەسندن: (ئیمان، تەقوا، ئیحسان، خۆشویستنی خەڵك، دڵسۆزیی بۆ خەڵك، هتد...).

(مەحویی) لە شیعرێکیدا دەڵێ:

سەر کە هۆشێکی نەبێ، زڕکە تاڵم بۆ چیە!
دڵ کە جۆشێکی نەبێ، شووشەی بەتاڵم بۆ چیە

سەر دەبێ عەقڵو هۆشی تێدابێ، دڵیش دەبێ جۆشو خرۆشو مەحەببەتو خولیاو هەستو نەستی پاكو چاکی تێدابێ.

ئەمە بەشی یەکەم لەو ڕەوشتە خودییانەی، کە مرۆڤ دەبێ لە خودی خۆیدا، خۆییان پێ برازێنێتەوە.

## بەشی دووەم: پاكو چاکبوونی جەستەو ڕواڵەت:

مرۆڤ وەك چۆن ڕووحە، ڕووحێکی پەنهان، واتە: وەك چۆن دیوێکی پەنهانو نەبیندراوی هەیە، کە دابەش دەبێتەوە بۆ: ١- عەقڵو هۆش و بیرکردنەوەو بیرۆکەکانی، ٢- دڵو دەروونو سۆز و ویستن و نەویستن و خولیاو هەستو نەستەکانی، بەهەمان شێوەش مرۆڤ دیوێکی بینراوو بەرچاوو بەرهەستی هەیە، کە پێی دەگوترێ: جەستە، ئنجا وەك چۆن مرۆڤ دەبێ هەوڵ بدات دەروونەکەی

ڕازاوەو پاك‌و چـاك بـێ، بەهــەمان شـێوە دەبـێ هــەوڵ بـدات ڕواڵەتەکەشـیو جەستەکەشی پاك‌و چاك بێ‌و خاوێن‌و ڕێك بێ.

با چەند دەقێك لەوبارەوە بێنینەوە، کە هەندێکیان ڕووح و جەستە پێکەوەو، هەندێکیشیان تەنیا جەستەو، هەندێکیشیان تەنیا ڕووح و ناخ دەگرنەوە:

١) لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (٢٢٢)دا، خـوا (سبحانه وتعـالى) دەفــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾، واتە: بەدڵنیاییی خوا زۆرگــەڕاوانی خۆش دەوێن و، زۆر خۆپاککەرەوانی خۆشدەوێن.

یانی: ئەوانەی کە زۆر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، خۆشی دەوێن و، ئەوانەش کە خۆیان پاك دەکەنەوە، لەڕووی ناخ و جەستەوە، خۆشیدەوێن.

بە تەئکید تەوبە پەیوەندیی بە دڵ‌و دەروونەوە هەیە، بەر لــەوەی پەیوەنـدیی بە ڕواڵەتەوە هەبێ، چونکە دەبێ ئینسان لە ناخەوە بۆ لای خوا بگەڕێتەوە ئنجا بە ڕواڵەت دەگەڕێتەوە، هەروەها خۆپاککردنەوەش دیسان، وەك چـۆن دیـوێکی ڕواڵەتیی‌و جەستەیی هەیە، دیوێکی پەنهانیشی هەیـەو، ئینسـان دەبـێ ڕووح‌و پەنهانی خۆشی پاك بکاتەوە، وێڕای جەستەو ڕواڵەتی.

٢) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسـلم) لـە فەرمایشـتێکدا دەفـەرموێ: {الطُّهُـورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ} [1]، واتە: پاك‌و خاوێنیی نیوەی ئیمانە.

پاك‌و خاوێنیی(الطُّهُـورُ) دیسان ئەویش هەم دیوی پـەنهان دەگرێتـەوە، هــەم دیوی ڕواڵەتیش دەگرێتەوە، ئینسان دەبێ هەم ناخەکەی پاك بێ، پاکی بکاتەوە لە چڵك‌و چەپەری کوفرو شیرك‌و ڕیاو نیفاق‌و خەسڵەتە بەدەکان(رذائل)ەکانی دی و، هەم دەبێ ڕواڵەت و جەستەشی پاك بێ، بۆیە پێغەمبەر (صلى اللـه عليـه وسـلم)

١) أخرجه أحمد: ٢٢٩٥٣، ومسلم: ٢٢٣، والترمذي: ٣٥١٧.

پاكو خاوێنی پەنهانییو ڕواڵەتیی بە نیوەی ئیمان داناوە، دەگونجێ بڵێین: نیوەكەی دیكەشی بریتیە لە جوانیی و چاكیی و ڕازاوەیی پەنهان و ئاشكرا، یان ڕووح و جەستە.

٣) هەر لەو بارەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك نموونەیەك لە پاكڕاگرتنی جەستەو ڕواڵەت، بەشێوەیەكی دیاریكراوتر دەفەرموێ: {السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ} (١)، واتە: سیواك كردن، {دەمو ددان پاك كردنەوە} پاككەرەوەیە بۆ زار، ڕازیكەرە بۆ پەروەردگار.

هەڵبەتە سیواك كردن كاتی خۆی بە لقەداری (أراك) كردوویانە، بەلاّم بۆ زانیارییتان! لە كوردەوارییدا زۆر جار كە گوترا: سیواك، وا دەزانن هەر ئەو جۆرە دارەیە (مسواك)! بەلاّم نا، سیواك واتە دەمو ددان پاككردنەوە، ئنجا بە فلچەو مەعجوون، یان بەهەر شتێكی دیكە، دەمو ددانت باشتر پاك ببێتەوە، ئەو سوننەتە باشتر دێتە دی، چونكە حیكمەتی سیواك كردن، خاوێنكردنەوەی زار و ددانەكانە.

٤) هەر لەو بارەوە كە دەبێ جەستە پاكو چاك بێ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِلْبَسُوا ثِيَاب الْبَيَاضَ، فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ}[٢]، واتە: پۆشاكی سپیی لەبەر بكەن، چونكە پاكترەو خۆشترە.

پاكترە، واتە: ئەگەر پەڵەیەكی پێوە بێ، چڵكێكی پێوە بێ، زیاتر لێی دیارەو، مرۆۊ زیاتر پێی دەزانێو پاكو خاوێنییەكەی باشتر ڕادەگرێ، ئنجا بێگومان پۆشینی بەرگی پاك و خاوێن، بۆ ڕووح و جەستە زیاتر مایەی ئاسوودەیی و پاكیی و چاكییە.

١) أخرجه أحمد: ٢٤٢٤٩، والنسائي: ٥، وابن خزيمة: ١٣٥، وابن حبان:١٠٦٧، وَصَحَّحَهُ الألباني.
٢) أخرجه ابن ماجه: ٣٥٦٧، وَصَحَّحَهُ الألباني.

٥) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرمویّ: {مَنْ أَكَلَ البَصَلَ وَالثُّومَ وَالكرَّاثَ، فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بنو آدم} [(١)]، واتە: هەر کەسێ پیاز و، سیر و، کوراده {یان سیرمۆکە، یان کەوەر}ی خوارد، با توخنی مزگەوتەکەمان نەکەویّ، چونکە فریشتەکانیش هەست بە ئازار دەکەن، بەو شتانەی کە وەچەی ئادەم پێی نارەحەت دەبن، واتە: ئەوانیش بۆنی ناخۆشیان پیّ ناخۆشە.

شایانی باسیشە بەقیاس و پێوانە لەسەر ئەو شتانەی باسکراون، دەتوانین بڵێین: هەروەها هەر کەسێك بە هەر هۆیەکەوە بیّ، بۆنێکی ناخۆشی لیّ بیّ، وەك بۆن خڵتەی جگەرە، یان بۆن ئارەقە، یان بۆن چەوریی و گریز، یان... یان...هتد، هەمان حوکمی هەیە بۆی نیە، یان لای کەم شتێکی پەسند و باش نیە، بچێتە مزگەوت و نوێژکەران و فریشتان بێزار بکات!

٦) فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە، ئەوەیە کە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویّ: {خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: الْخِتَانُ، وَالإِسْتِحْدَادُ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الإِبِطِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ} [(٢)]، واتە: پێنج شت خوارِسکن، لەو فیطرەتەن، کە خوا مرۆڤی لەسەر خوڵقاندوە:

{١) خەتەنەکردن، ٢) خۆپاککردنەوە لە مووی بەر(عانة)، ٣) مووی بن هەنگڵ لابردن ٤)نینۆککردن، ٥) کورتکردنەوەی سمێڵ}.

٧) فەرمایشتێکی دیکە لەو بارەوە ئەوەیە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك هاوەڵانی دەچوون بۆ شوێنێك، پێی فەرموون: {إِنَّكُم قَادِمُونَ عَلَى

---

١) أخرجه مُسْلِم: ٥٦٤، والتِّرمِذِي: ١٨٠٦، وَالنَّسَائِي:٦٦٨٥.

٢) متفق عليه: أخرجه البُخَارِي: ٥٨٨٩، ومسلم: ٤٩.

إِخْـــوَانكُمْ، فَأَصْـــلِحُوا لِبَاسَـــكُمْ وَأَصْـــلِحُوا رِحَـــالَكُمْ، حَتَّـــى تَكُونُوا كَأَنَّكُمْ شَامَةٌ فِي النَّاس}[١]. واتە: ئێـوە دەچـن بـۆ لای برایـەکانتان، بۆیە بەرگ و پۆشاکتان پوخت و ڕێك بکەن و، بـارو ولاخـەکانتان چـاك بکـەن، ڕێکیان بخەن، تاکو جوان بێنە بەرچاو لەنێو خەڵکداو، وەك خاڵ دیار بن. واتـە: لەڕووی چاکیی‌و پاکیی‌و ڕێك‌و پێکییەوە.

کەواتە: ئەرکێکی گرنگی شەرعییە، کە مرۆڤ لەڕووی جەستەوە، پاك‌و چاك‌و بۆنخۆش‌و ڕێك بێ، هەروەك چۆن دەبێ ناخیشی پاك بێ.

ئنجا دوو فەرمایشتی دیکەش دێنین، کە هەم ناخ دەگرنەوەو، هەم جەستەش دەگرنەوە:

٨) پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) دەفـەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ جَمِيـلٌ يُحِـبُّ الْجَمَالَ}[٢]، واتە: خوا جوانەو جوانیی خۆش دەوێ.

بەڵام ئەم فەرموودەیە بەسەرهاتێکی لەگەڵدایە، پێویسـتە بیهێـنین: ڕۆژێـك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: {مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِـنْ كِـبْرٍ لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ}، هەر کەسێك بەقەدەر گرانـایی گـەردێك، خۆبـەزلگریی لـە دڵدا هەبێت ناچێتە بەهەشت، {فَقَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُـونَ ثَوْبُـهُ حَسَناً، وَنَعْلُهُ حَسَناً}، پیاوێك گوتی: پیاوی وا هەیە حەز دەکات پێڵاوی جوان بێ‌و، پۆشاکیشی جوان بێ! پێغەمبەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) فـەرمووی: {إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ}، بەدڵنیاییی خوا جوانەو جوانیی خۆش دەوێ، پاشان وەك پێناسەی خۆبەزلگیریی(کبر) فەرمووی: {الكِبْرُ بَطَرُ الحَقِّ، وَغَمْطُ النَّـاسِ}،

---

١) أخرجه أحمد: ١٧٦٦١، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده محتمل للتحسين.

٢) أخرجه مسلم: ٩١، والترمذي: ١٩٩٩.

خۆبەزلگریی بریتیە لەوەی حەق ڕەت بکەیەوەو، خەڵك بە کەم تەماشا بکەی، ئا ئەوە خۆبەزلگرییە، حەق قبووڵ نەکەیو ڕەفزی بکەی، هەرچەندە بشزانی حەقە، هەروەها بە کەمیش تەماشای خەڵك بکەی.

ئەگەرنا خۆبەزلگریی لە بەرگو پۆشاکدا، لە پێڵاوو کەلو پەلدا، بەرجەستە نابێ، مرۆڤ تا ڕێكو پێك بێ، تا پاكو خاوێن بێ، باشە، هەڵبەتە بەبێ زێدەڕۆیی و، بەبێ ئەوەی کە وەك شانازیی بەسەر خەڵکدا کردن بێ، یاخود پۆشاکی ناوداریی (لباس الشهرة)، واتە: بەرگێك لەبەر بکا، کە لەنێو خەڵکدا زەق و دیار بێ، ئەگەرنا خوا جوانەو، جوانیی خۆش دەوێ.

٩) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ كَرِيمٌ يُحِبُّ الْكَرَمَ، وَيُحِبُّ مَعَالِيَ الأَخْلَاقِ وَيَكْرَهُ سَفْسَافَهَا}(١)، واتە: خوا (سبحانه وتعالى) بەڕێزەو، بەخشندەیەو، ڕێزو بەخشندەییشی خۆش دەوێ و، حەز لە ڕەوشتە بەرزو بالآیەکان دەکات و، ڕقی لە خوو وخدەو هەڵسوکەوتە نزمو پەستەکان دەکا.

ئنجا ئەمە بێگومان دەبێ گەورەترین هاندەر بێت بۆ ئێمەی مسوڵمان، کە ئێمەش ئەوەی خوا حەزی لێ دەکات، حەز لەوە بکەین و، هەرچی خوا ڕقی لێیەتی، ئێمەش ڕقمان لێی بێ، یانی: هەرچی خوا پێی خۆشە، هەوڵبدەین لە خۆمانی بێنینە دی و، هەرچی خوا پێی ناخۆشە، هەوڵبدەین خۆمانی لێ دوور بگرین، وەك لە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) پرسیار کراوە، دەربارەی ڕەوشتو ئاکاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، گوتوویەتی: {كَانَ خُلُقُ نَبِيِّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْقُرْآنَ}(٢)، واتە: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قورئان بوو، قورئان چی دەفەرموو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای دەکرد،

---

١) أخرجه الحاكم في المستدرك: ١٥٢، وَصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع: ١٨٠١.

٢) أخرجه مسلم: ١٣٩.

هەموو ئەو ڕەوشتو ئاکارو سیفەتە بەرزانەی کە خوا خاوەنەکانیانی خۆش دەوێن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی بەو ڕەوشتانە دەڕازاندەوەو، هەموو ئەو ڕەوشتانەی کە خوا خاوەنەکانیانی ڕق لێیە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خۆی لێ بە دوور دەگرتن، ئنجا بە تەئکید ئەگەر ئینسان شوێن قورئان بکەوێ و، پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) بکاتە سەرمەشقی خۆی، گومانی تێدا نیە دەگاتە لووتکەی ڕەوشتو ئاکارە بەرزەکان و، کاتێك ئێمە لە زاتی خۆماندا دەبینە خاوەنی ڕەوشتو ئەدەبی بەرزو جوان، ئەو کاتە دەتوانین لەگەڵ خەڵکدا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی، بەشێوەیەکی زۆر ئاسایی، بەبێ زۆر لەخۆ کردن، بەبێ خۆ ئەزیەت دان، لەگەڵ هەموو کەسدا، ڕەوشتمان بەرزو ئاکارمان پەسند بێ.

بەڕێزان!

لە پێنج بڕگەدا ئەدەبەكانی نێوان ژنو مێرد, دەخەینە بەر باسو لێكۆڵینەوە:

## بڕگەی یەكەم: بناغەی پەیوەندییەكانی نێوان ژنو مێرد:

١)- خوا (سبحانه وتعالی) لە سوورەتی (الروم) دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: لە نیشانەكانی خوا (سبحانه وتعالی) {لە نیشانەكانی پەروەردگارێتیی خوا} ئەوەیە كە {ئەی پیاوەكان!} لە خۆتان هاوسەرانی بۆ هێناونەدی، {یاخود ئەی ژنەكان! لە خۆتان هاوسەرانی بۆ هێناونەدی}، ﴿لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا﴾ تاكو بەهۆی ئەو هاوسەرانەتانەوە {هەم پیاوان بەهۆی ژنەكانیانەوە، هەم ژنەكان بەهۆی مێردەكانیانەوە}، ئۆخژنو سوكناییتان بۆ بێ، ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ لەنێوانتاندا خۆشەویستییو بەزەیی داناوە، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾، بەڕاستیی لەوەدا، نیشانەی زۆر هەن بۆ كەسانێك كە بیر بكەنەوە.

كەواتە بناغەی پەیوەندیی نێوان ژنو مێرد، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، لەڕوانگەی شەریعەتەوە، هەروەها لە زگماكو خوارِسكی مرۆڤەكانیشدا، بریتیە

لەوە کە هۆگری یەکدی بن و مایەی سوکنایی یەکدی بن، مایەی ئۆخژنو ئارامیی بن بۆ یەکدی، پاشان یەکدییان خۆش بوێ و، بەزەییان بەیەکدیدا بێتەوەو، بۆ یەك بە پەرۆش بن.

٢)- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٨٧)دا، خوای پەروەردگار بەم شێوەیە پەیوەندیی نێوان ژنو مێردمان بۆ وێنا دەکا، دەفەرموێ: ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ﴾ واتە: ئەی پیاوینە! ژنەکان پۆشاکن بۆ ئێوەو، ئێوەش پۆشاکن بۆ ژنەکانتان.

وەك چۆن پۆشاك مرۆڤ دەپارێزێ لەوە کە عەیبو عاری بەدەرەوە بێ، هەروەها پۆشاك مرۆڤ لە گەرما دەپارێزێ، لە سەرما دەیپارێزێ، لە زیانو زەرەر دەپارێزێ، بەهەمان شێوە ژنو مێردیش، دەبێ عەیب پۆشی یەکدی بن و، دەبێ پارێزەری یەکدی بن و، دەبێ قەڵغانو سوپەری یەکدی بن، ئەو کاتە پەیوەندییەکی دروستو تەندروستو ڕێکیان لەبەیندا هەیە.

ئەمە بەنسبەت بناغەی پەیوەندیی نێوان ژنو مێردەوە.

## بڕگەی دووەم: ئەرك‌و مافەكانیان بەرانبەر بەیەكدی، بەگشتی:

ئنجا بێینە سەر ئەوە, كە: ژن‌و مێرد لە ئیسلامدا، ئەرك‌و مافەكانیان بەرامبەرن، واتە پیاو چ مافێكی هەیە، ژنیش لەبەرامبەردا هەمان مافی هەیە، هەروەها ژن چ ئەركێكی لەسەر شانە لەبەرامبەر پیاودا، پیاویش هەمان ئەركی لەسەر شانە لەبەرامبەر ئافرەتدا، مەرجیش نیە ئەركەكان وەك یەك بن، بەڵام ئەرك‌و مافەكان بەرامبەرن.

١) لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٢٨)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ۗ ﴾، ئافرەتان هەمان مافیان هەیە لەسەر پیاوان، كە هی پیاوان لەسەر ئەوانە، بەڵام پیاوان پلەیەكیان بەسەر ئەوانەوە هەیە، كە هەندێك لە زانایان وایان لێك داوەتەوە كە:

پیاوان دەبێ هەوڵبدەن بۆ ژنەكانیان چاكتر بن، وەك لە ژنەكان بۆ ئەوان.

بەڵام زۆربەیان وایان لێك داوەتەوە كە ئەو پلە(درجة)یە، پلەی (قوامة)یە، واتە: سەرپەرشتییكردن‌و مشورخواردنی خێزان عایدی پیاوە، ئەوە ئەركە لەسەر شانی و بە كەمتەرخەمیی تێداكردنی گوناهبار دەبێ.

## بڕگەی سێیەم: ئەركە تایبەتییەكانی ژن و مێرد بەرانبەر بەیەكدی:

### یەكەم: ئەركی پیاو بەتایبەت لەبەرامبەر ئافرەتدا، یاخود چۆنیەتی مامەڵەی پیاو لەگەڵ ئافرەتدا:

١)- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ﴾ النساء: ٣٤، واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ئافرەتانەوە، بەهۆی ئەوەوە كە خوا هەركام لە پیاوانو ئافرەتانی بەسەر یەكدیدا هەڵبژاردوەو، بەهۆی ئەوەشەوە كە پیاوان لە سامانی خۆیان خەرجكردوە (بۆ ژن و خێزانیان).

بەڵێ، خوا هەندێ سیفەتی بە پیاوان داون، لە ئافرەتاندا نین و، هەندێ سیفەتیشی بە ئافرەتان داون، لە پیاواندا نین، هەروەها بەهۆی ئەوەشەوە كە پیاوان لە ماڵی خۆیان خەرج دەكەن: مارەیی دەدەن، بژێوی ماڵو خێزان پەیدا دەكەن، بۆیە پێویستە پیاویش سەرپەرشتییو مشوورخۆریی لەچوارچێوەی خێزاندا، بە ئەستۆوە بێ، كە ئەوە ئەركە نەك پلەو ئیمتیاز و، (تكلیف)ە نەك (تشریف).

٢)- هەر لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٩)دا، خوا بە پیاوان دەفەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾، واتە: (ئەی پیاوەكان!) بە چاكە مامەڵە لەگەڵ ئافرەتاندا {لەگەڵ ژنەكانتان بكەن}، بە شێوەی پەسند، ئەگەر ڕقیشتان لەشتێك بوو، سیفەتێكیان تێدا بوو ڕقتان لێی بوو، جاری وا هەیە ڕقتان لە سیفەتێكیانە، بەڵام چەندان سیفەتی دیكەی چاكیان تێدایە.

ئنجا بێگومان ئەگەر پیاو سیفەتێکی لە ژنەکەیدا بەدڵ نەبێ، ژنەکەش لەبەرامبەردا سیفەتێك یاخود زیاتری لە پیاوەکەیدا هەر بەدڵ نیە، بەڵام دەبێ یەکدییان بە نوقستانیی‌و کەم‌و کوڕییەوە قبووڵ بێ و، هەوڵبدەن کەم‌و کوڕییەکانی یەکدی چارەسەر بکەن، نەك کەم‌و کوڕییەکانی یەکدی بکەنە بەهانەی شەڕ بەیەکدی فرۆشتن و، بیکەنە هۆکاری لێك تۆران‌و پشت لە یەکدی کردن‌و، سەرەنجام لێك جیابوونەوە.

**دووەم: ئەرکی ژن بەرانبەر بە پیاو، یان چۆنیەتی مامەڵەی ژن لەگەڵ مێردی دا:**

هەر لە ئایەتی (٣٤)ی سوورەتی (النساء)دا، خوا ئاوا باسی ئافرەتان دەکا، دەفەرموێ: ﴿ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ ﴾، ئافرەتانی چاك ئەوانەن کە:

١- ﴿قَٰنِتَٰتٌ ﴾، واتە: ملکەچن بۆ مێردیان، بە قسەی مێردیان دەکەن، فەرمانبەرن بۆ مێردیان، مادام مێرد، مادام پیاو سەرپەرشتیاری بازنەو فەرمانگەی خێزانە، دەبێ ئەوانەی لەو چوارچێوەیەدان، بەقسەی بکەن، ئەگەرنا کارەکەی بۆ ناڕوا.

﴿قَٰنِتَٰتٌ ﴾ ئەوە ماناکەیەتی، واتە: ملکەچن و، بە قسەی مێردیان دەکەن، دیارە لە سنووری شەرعداو بەپێی توانایان و، لە سنووری بە پەسند داندراودا، چونکە: (إنّما الطاعة في المعروف) رواه البخاري. واتە: فەرمانبەریی بۆ کردن، تەنیا لە سنووری پەسند دایە، پاشان لە سنووری توانا دایە.

﴿فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ﴾ ئافرەتانی باش، ژنانی پەسند و شایستە ئەوانەن، کە لە حاڵەتێکدا مێردیان لە ماڵە، بە قسەی مێردیان دەکەن، ڕێزی مێردیان دەگرن.

٢- ﴿حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ﴾ لەحاڵەتێکیشدا، کە مێردیان لە ماڵ نیەو لەدەرەوەی ماڵ: ئەو ژنانەن پەسند و چاکن، کە پارێزەرن:

أ- هەم بۆخۆیان.

ب- هەم بۆ ماڵی مێردیان.

ج- هەم بۆ سومعەو کەرامەتی مێردیان، ﴿بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ﴾ وەك چۆن خوا (سبحانه وتعالى) مافی ئەوانی پاراستوە، ئەوانیش مافی مێردەکانیان دەپارێزن.

ئەمەش چۆنیەتی مامەڵەی ژن لەگەڵ مێردیدا.

**بڕگەی چوارەم: ئەرکەکانی ژن‌و مێرد لە چوارچێوەی خێزان‌و ماڵ دا:**

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك یاسایەکی گشتیی دەفەرموێ: {أَلَا إِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقّاً، وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقّاً} [1]، واتە: ئاگاداربن! ئێوە مافتان بەسەر ژنەکانتانەوە هەیە، ژنەکانیشتان مافیان بەسەر ئێوەوە هەیە.

واتە: هەر یەك لایەنە نیە، مێردیش مافی هەیە بەسەر ژنەوە، ژنیش مافی هەیە بەسەر مێردیەوە.

مافی پیاو ئەوەیە کە باسمان کرد:

أ- دەبێ ئەو ئافرەتە لەچوارچێوەی خێزاندا بەقسەی مێردی خۆی بکا، ڕێزی بگرێ.

ب- لە کاتێك لە ماڵەوەش نیە، سومعەو کەرامەتی و، ماڵ‌و حورمەتی بپارێزێ.

مافی ژنیش لەسەر مێرد ئەوەیە, وەك پێشتر باسمان کرد:

أ- بە چاکە مامەڵەی لەگەڵدا بکاو، ڕێزی بگرێ.

ب- پێداویستییەکانی ژیان‌و گوزەرانی خۆی و منداڵەکانی بۆ دابین بکا.

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ﴾البقرة: ٢٣٣، ئەو کەسەی منداڵەکە پاڵ دەدرێتە لای وی، {نەسەبی دەچێتە لای وی}، نان‌و بژێو و نەفەقەی ماڵ‌و خێزان‌و ژن‌و منداڵەکان لەسەر ئەوە.

---

١) أخرجه الترمذي: ٣٠٨٧، وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى: ٤١٠٠، وابن ماجه: ٣٠٥٥.

هەروەها لـە ڕووی نیشـتەجێ كـردنو دابـین كردنـی جێگـاو ڕێگـاوە، خـوا فەرمویـەتی: ﴿ أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ ﴾الطـلاق: ٦، ژنـەكانتان لەشوێنێكدا نیشتەجێ بكەن، كە لە تواناتاندا هەیە.

واتە: جێگاو ڕێگا دابین كردن و، بژێو پەیدا كردن و، بەرگو پۆشاك بۆ دابـین كردن، بۆ ژن و خێزان، ئەركێكە لە ئەسـتۆی پیاودایـە، چ بـۆ ژنەكـەی، چ بـۆ منداڵەكانی، كە دەبێ ئەو ئەركە ڕاپەڕێنێ و، مـافی ژنەكەیـەتی لەسـەری كـە بیژیەنێ و، پێداویستییەكانی بۆ دابین بكا، بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە دەسـت بـەتاڵ و، دەستخاڵیی بێ و، بواری هەبێ بۆ ئەركی دایكایەتیو كابانایەتیی.

بە نسبەت ئەركی سەرەكیی ئافرەتەوە لە ماڵدا، كە بریتیە لە: دایكایەتییو كابانیەتیی، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ﴾البقرة: ٢٣٣، واتە: دایكان منداڵی خۆیان شیر پـێ دەدەن، دوو ساڵی تەواو، بۆ هەر كەسێك كە ویستی ماوەی شیرپێدان تەواو بكات {كـە دوو ساڵە، ئەگەرنا دەشگونجێ، وەك لـە درێـژەی ئایەتەكـەدا هـاتوە لـەماوەی كەمتر لە دوو ساڵدا، ئەو منداڵە لەشیر ببڕێتەوە}.

كەواتە: ئەركی سەرەكیی ژن لە ماڵدا، بریتیە لـە دایكایـەتیی و، كابـانێتی كردن و، ڕاگرتنی ئەو ماڵـەو، دروسـتكردنی هێلانـەو جێگـاو ڕێگەیـەك، كـە خۆییو مێردەكەشیو، منداڵەكانیشی، تێیدا پشوو بدەنو، تێیدا پەروەردەبن.

## بڕگەی پێنجەم: جۆرەکانی ئەرکی ژن و مێرد:

دەتوانین بڵێین: ئەرکەکانی ژنو مێرد، دەبن بە سێ جۆر:

١) ئەرکە هاوبەشەکانیان: کە ژنو مێرد تێیاندا وەك یەکن:

١- دەبێ هەردووکیان یەکدییان خۆش بوێ و، ڕێز لە یەکدی بگرن.

٢- دەبێ بەزەییان بەیەکدیدا بێتەوە.

٣- دەبێ پێکەوە هاوکار بن.

٤- دەبێ پێکەوە ڕاوێژکار بن بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی ماڵ و خێزان لەسەر بناغەی ڕاوێژ و بەتەبایی.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: من خۆم جوان دەکەم بۆ هاوسەری خۆم، وەك چۆن هاوسەرەکەم خۆی بۆمن جوان دەکات، زانیویەتی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾البقرة: ٢٢٨، ئەوەش دەگرێتەوە.

٢) ئەرکە تایبەتییەکانی پیاو: کە بریتین لە:

١- دابین کردنی بژێو و، جێگاو ڕێگاو، پۆشاك.

٢- سەرپەرشتییکردنی خێزانو پاراستنی.

٣- بە شێوەی پەسندو چاك مامەڵەکردنی لەگەڵ ژنەکەیدا و چاوپۆشیی کردنی.

٣) ئەرکە تایبەتیەکانی ژن: کە بریتین لە:

١- دایکایەتیی.

٢- کابانێتیو ماڵداریی‌و ماڵ ڕاگرتن.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردوویەتی بە پێوەرو تەرازوو بۆ چاکیەتی

پیاوان، دەفەرموێ: {خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ، وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي}[١]، واتە: باشترینتان ئەوانەن كە باشترینیانن بۆ ماڵو خێزانیان و، منیش باشترینم بۆ ماڵو خێزانم.

بێگومان هیچ كەس نەگەیشتۆتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە چاكییدا، لە ڕەوشت بەرزیدا، لەكار پەسندییدا، چ بۆ ماڵو خێزانی، چ بۆ خەڵكیش بە گشتیی.

لە كۆتاییدا دەتوانین بڵێین: بناغەی هەڵسو كەوتی ڕاستو دروستی ژنو مێرد لە چوارچێوەی ماڵو خێزاندا، ئەوەیە كە: یەكدی چاك بناسن و دەركبكەن، نەك هەر كامێكان بیەوێ ئەوی دیكەیان بێنێتە سەر شێوەی خۆی، خوا (سبحانه وتعالى) كۆمەڵێك سیفەتی بە پیاو داون، كە پیاوەتیی پیاو دەیانخوازێ و، كۆمەڵێك سیفەتیشی بە ژن داون، كە ژنایەتیی ژن دەیانخوازێ.

خوا (سبحانه وتعالى) بۆیە جیاوازیی خستۆتە نێوان ئەركەكانی ژنو مێرد، كە ئەركی مێرد، ئەركی پیاو، زیاتر لە دەرەوەی ماڵە، بەڵام ئەركی ئافرەت، ژن، زیاتر لە چوارچێوەی ماڵ دایە، ئەگەر تۆ تەماشای ئافرەت بكەی، دەبینی: تەنیا ئافرەت دەتوانێ دایك بێ، بەس ئافرەت دەتوانێ شیر بدات بە منداڵ، هەر ئافرەت دەتوانێ منداڵداریی بكا، وەك فیطرەتو زگماك.

ئنجا ئەگەر تەماشای پیاویش بكەی، دەبینی: كارە قورسەكانی، كە پیاو دەیانكات لەدەرەوەی ماڵ، ئەو كارانە بە ئافرەت ناكرێن، خوای پەروەردگار دەنگێكی گڕو، جەستەیەكی ماسولكاویی‌و بەهێزی داوە بە پیاو، كە ئەوە هیچ پەیوەندیی نیە بە پەروەردەی دینییەوەو، هیچ پەیوەندیی بە پاشخانی دینییەوە نیە، بە زگماك پیاوان بەهێزترن لە ئافرەتان، بۆیە ئەو ئەركانەی كە لە

١) أخرجه ابن ماجه: ٣٠٤٢، والسلسلة الصحيحة للألباني: ٢٥٣.

دەرەوەی مـــاڵ ئـــەنجام دەدرێـــن، وەك: ڕووبەڕووبوونـــەوەی ســـەرماو گـــەرماو، پەیداکردنی بژیو و، بەرەنگاربوونەوەی مەترسییەکان، زیاتر ئەرکی پیاون و، ئەو ئەرکانەش کە زیاتر لەچوارچێوەی ماڵدا ئەنجام دەدرێن، کـە پـتر پەیوەسـتن بـە بەخێوکردنی منداڵو ڕاگرتنی ماڵەوە، کە ئەوانیش پێویستییان بە جەستەیەکی نەرمو ناسك، دەنگێکی نەرمو نیان، عەتفو سۆزێکی زۆر هەیە، ئەو ئەرکانەش بە شەریعەت و بە فیطرەت، بە ئافرەت سپێردراون.

بەڵێ، ئەگەر بێتو هەر کام لە پیاوو ئافرەت، باش سروشتی خۆیـان بناسـن و، باش ئەرکە شەرعییەکانی خۆیان دەرك بکەن و، هـیچ کامیـان چـاوی لـەوە نەبێ ئەوی دیکە وەك خۆی لێ بکات، چونکە ژن نابێتە پیاو و، پیاویش نابێتـە ژن و، ژنایەتیی ژن نوقستانیی نیە، وەك پیاوەتیی پیاویش -لـەخودی خۆیـدا- فەزیلەت نیە، بەڵکو ئەوەی فەزیلەتە ئەوەیە، کە هەر کامێکیان باشـتر ئـەرکی سەرشـانی خـۆی ڕاپـەڕێنێ، بـەڵێ دەبـێ پەیوەنـدیی نێـوان پیـاوو ئـافرەت، پەیوەندییەکی تەواوکاریی(تکاملي) بێ، نەك مل لەبەر ملی یەکدی بنێن.

ئەمە باشترین بناغەیە بۆ ئـەوەی پیـاوانو ئافرەتـان مامـەڵەیـەکی ڕاسـتو دروست بەیەکەوە بکەن.

هەڵبەتە باسکردنی ئەمە شوێنی تایبەتی دەوێ،[1] بەڵام ئێمـە لێـرەدا زیـاتر باسی ئەو ئەدەبانە دەکەین، کە ژنو مێرد چۆن پێکەوە مامەڵە بکەن.

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدا، هەم پیـاوان، هـەم ئافرەتـان بەوشێوەیە کە شەریعەت دیاریی کردوە، بە ئەرکی سەرشانی خۆمـان هەڵسـین، لە چوارچێوە ماڵو خێزانداو، لە چوارچێوەی کۆمەڵگاشدا.

---

١) لە مەوسووعەی: {ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەت دا} زۆر بەدرێژیی لەو بارەوە دواوین, هەروەها لە کتێبی یازدەیەمی {موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتب الله}دا، ط٢/ ٢٠٢٠م/١٤٤١هـ.

ئاڵقەی چوارەم :

# ئەدەب لەگەڵ باب و دایک دا

بەڕێزان!

ئایا دەبێ منداڵەكان، ڕۆڵـەكان چـۆن لەگـەڵ بـابو دایكیاندا مامەڵە بكەن، ئەو ڕەوشتو ئەدەبە بەرزانـە چین، كە شەریعەت لە ڕۆڵەكان، لە منداڵەكان، لە كوڕو كچەكان دەیانخوازێ، كە مامەڵەیان پـێ لەگـەڵ بـابو دایكیان دا بكەن؟!

ئەم باسە لەچوار بڕگەدا دەتوێژینەوە:

**بڕگەی یەکەم: گرنگیی ڕێزلێگرتنی باب‌و دایك:**

لە زۆر شوێنی قورئاندا، خوا (سبحانه و تعالى) باسی مافی باب‌و دایکی کردوەو، باسی پێویستیی ڕێزلێگرتنی باب‌و دایکی کردوە، بۆ وێنە:

١)- لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٢٣)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارت بڕیاری داوە: تەنیا ئەو بپەرستن، {جگە لەو بەندایەتیی بۆ کەس مەکەن، دوای ئەوەش بڕیاری داوە:} کە لەگەڵ باب‌و دایکتاندا چاکەکاریی بکەن، ئەگەر یەکێکیان، یان هەردووکیان، کەوتنە تەمەنەوە لەلای تۆ، {واتە: تۆ لە خزمەتیاندا بووی و، یەکێکیان وەفاتی کردبوو، ئەوی دیکە کەوتبووە تەمەنەوە لەلای تۆ}، تۆ هەرگیز قسەیەك مەکە جێگای ناڕەحەتیی ئەوان بێ و، تێیانەوە مەخوڕەو، قسەی بەڕێزو حورمەتیان لەگەڵدا بکەو، باڵی میهرەبانییان بۆ کەچ بکەو، بۆشیان بپاڕێوەو بڵێ: پەروەردگارم! بەزەییت پێیاندا بێ، وەك چۆن منیان بە گچکەیی بەخێو کردوە.

٢)- هەر لەو بارەیەوە لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٣٦)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾ واتە: بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی و، لەگەڵ باب‌و دایکتاندا چاکەکار بن.

خوشك‌و برایانی بەڕێز!

وەك چۆن لێرەدا هاتوە، لە چەند شوێنی دیکەش لە قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (العنكبوت) و، لە سوورەتی (لقمان)یشدا هاتوە، یەکسەر بەدوای ئەوەدا کە دەفەرموێ: بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، دەفەرموێ: لەگەڵ باب‌و دایکتاندا چاکەکار بن، ئنجا هەر ئەوە بۆخۆی، شتێکی زۆر گەورەیە، مانای ئەوەیە حەقی باب‌و دایك لەسەر منداڵ، لەسەر ڕۆڵە، لەدوای حەقی خوای پەروەردگار، لە حەقی هەموو کەس گەورەترە، وەك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش دا (صلى الله عليه وسلم) دیارە، بۆ نموونە:

٣)- {عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بن مَسْعُود رضي الله عنه قال: سَأَلْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) : أَي الْعَمَلِ أَحَبُّ إلى اللّٰهِ؟ قال: الصَّلاةُ عَلَى وَقْتِهَا، قُلْتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قال: برُّ الْوالِدَيْنِ، قُلْتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قال: الجِهَادُ في سَبيلِ اللّٰهِ}[1].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) چ کردەوەیەك لەلای خوا خۆشەویستترە؟ فەرمووی: نوێژ لە کاتی خۆیدا، گوتم: دوای ئەوە چی؟ فەرمووی: چاکە لەگەڵ باب‌و دایك دا، گوتم: دوای ئەوە چی؟ فەرمووی: تێکۆشان لە ڕێی خوادا.

٤)- هەر لەو بارەوە بەلام بەباری پێچەوانەکەی دا: کە دڵ ئازاردانی باب‌و دایك و، نارەحەتکردنیان و، بێ فەرمانیی کردن و، سەرپێچیی لێکردنیان، چ تاوانێکە! وەك چۆن ڕێز لە دایك‌و باب گرتن‌و، چاکە لەگەڵ کردنیان، گەورەترین طاعەت‌و چاکەیە، لەدوای بەندایەتیی بۆ خوا، بەهەمان شێوەش: گەورەترین گوناه، لەدوای کوفر و هاوبەش بۆ خوادانان بریتیە لە: هێشاندنی دڵی دایك‌و

١) رواه البخاري: ٥٢٧، ومسلم: ٨٥.

بـــاب و، نارِەحـــەتكردنیان و، جـــێ بـــەجێ نـــەكردنی مافـــەكانیان، وەك لـــەم فەرمایشتەدا دیارە:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَـائِرِ، ثَلاثًـا؟ قُلنا: بَـلى يـا رَسُـولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم)، قَـالَ: الإِشْرَاكُ بِـاللهِ وَعُقُـوقُ الْوالِدَيْنِ، وَكانَ مُتَّكِئًا، فجلس فَقالَ: أَلا وَقَوْلُ الزّورِ، قَالَ: فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهـا حَتّى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ}.[1]

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك فەرمووی: ئایا هەواڵتان پـێ نـەدەم لەبارەی گەورەترینی گوناهــە گەورەكانــەوە، (ســێ جــاران دووبــارەی كــردەوە) گوتمان: با، ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) هەواڵمان پێ بدە، فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا پەیدا كردن و، سەرپێچییكردنی دایكو بــاب، یــان هێشــاندنی دڵی دایكو باب، {(عقوق) لە (عَقَّـە) واتە: سەرپێچیی لێ كرد، دڵی هێشــاند، نارِەحەتی كــرد} ، لەوكاتــەدا كــە ئــەوەی فــەرمووی، ئانیشــكی دادابــوو، پــاڵی دابووەوە، خۆی ڕاست كـردەوەو دانیشــتەوەو فــەرمووی: ئاگــادارىن! {گونــاهی سێیەم لە گوناهە هەرە گەورەكان} ، قسەی درۆو شــایەتییدانی بەدرۆیــە، ئنجــا هەر دووبارەی كردەوە هەتا گوتمان: بریا بــێ دەنــگ بووبایــە، {واتــە: ئەوەنــدە دووبارەی نەكردبایەوە, بۆ ئەوەی هێندە خۆی ئەزیەت نەدات} .

كەواتە، وەك چۆن: چاكە لەگەڵ بابو دایك, لــەدوای بەندایــەتیی بــۆ خــوا، گــەورەترین چــاكەیە، بەپێچــەوانەوەش: هێشــاندنی دڵــی دایــكو بــاب و دڵ نارِەحەتكردنیان، لەدوای هاوبەش بۆ خوا دانان، گەورەترین گوناهە.

---

١) أخرجه أحمد: ٢٠٤٠١، والبخاري: ٥٦٣١، ومسلم: ٨٧.

**بڕگەی دووەم: ئایا حەقی باب‌و دایك یەكسانن، لەسەر منداڵەكانیان؟**

بێگومان نەخێر، بەڵكو حەقی دایك زیاترە، وەك ئایەتەكانیش ئامــاژەی پــێ دەكەن، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ: ﴿ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٖ ﴾ لقمان: ١٤، ﴿ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهٗا وَوَضَعَتۡهُ كُرۡهٗاۖ ﴾ الأحقاف: ١٥، خوای كارزان ئاماژە دەكات بەتایبەت بە ئەركی ئافرەت كە دووگیان دەبێ، بەو كۆرپەیەو، لە سـكی خۆیـدا هەڵیدەگرێ.

هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە: {جاء رَجُلٌ إلى رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم)فقـال: يَـا رَسُـولَ اللّٰهِ مَـنْ أَحَـقّ بحُسْـنِ الصّحْبَةِ؟ قَالَ: أُمّكَ، قـال: ثُـمّ؟ قـال: أُمّـكَ، قـال: ثُـمّ؟ قـال: أُمّـكَ، قـال: ثُمّ؟ قال: أَبُوكَ}[١].

پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گـوتی: ئـەی پێغەمبــەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! كێ شایستەترە یاخود كێ خاوەن مافترە، بـەوەی بەباشــە مامەڵەی لەگەڵدا بكەم و هاوەڵایـەتیی بكـەم؟ پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: دایكت، گوتی: دوایی؟ فەرمووی: دایكت، گوتی: دوایی؟ فـەرمووی: دایكت، {جاری چوارەم} گوتی: دوایی؟ فەرمووی: بابت.

كەواتە دایك سێ قۆناغ لەپێش بابەوەیەو، مافی دایك بە سـێ پلـە لـە هـی باب زیاترە.

بەڵام ئەمە وەك بنچینەیەكی گشتی, ئەگەرنا هەڵاواردن و ڕێزپەڕیش هەیە.

١) رواه البخاري: ٥٩٧١، ومسلم: ٢٥٤٨.

**بڕگەی سێیەم: ئایا ئەگەر باب‌و دایك مسوڵمان نەبوون، هاوبەش بۆخوا دانەر بوون، یاخود لە خاوەن کتێبەکان بوون، یاخود هەر هیچ دینێکیان نەبوو، ئەو مافەیان دەفەوتێ؟**

بێگومان نەخێر، چونکە خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴾لقمان: ١٥.

واتە: ئەگەر {باب‌و دایکت} هەوڵیان لەگەڵدای هاوبەشێکم بۆ دابنێی، کە زانیارییت لەبارەیەوە نیە، {لە هاوبەش بۆمن داناندا} گوێڕایەڵییان مەکە، {لە تاوان‌و سەرپێچییدا بەقسەیان مەکە}، ﴿وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾، بەڵام لەڕووی ژیانی دنیاییەوە، بەچاکە مامەڵەیان لەگەڵ بکە، {ڕێزیان بگرەو، حورمەتیان بگرە، بەڵام لە گوناهدا بەقسەیان مەکە}.

باب و دایکت لەبەر ئەوەی کافرو موشریکن، یاخود هانت دەدەن بۆ کوفرو شیرك، مافی باب‌و دایکایەتییان نافەوتێ، ڕێزو حورمەتی باب‌و دایکایەتییان هەر لەجێی خۆیەتی، چ جای هانیشت بدەن بۆ دینداریی‌و مسوڵمانەتیی! ئەگەر هانت بدەن بۆ کوفرو شیرکیش وەك باب‌و دایك حورمەت‌و ڕێزیان دەبێ، هەر پارێزراو بێ، چ جای کە مسوڵمانیش بن، ئەوە فەرزبوونی ڕێزلێگرتن و گوێڕایەڵییکردنیان تۆختر دەبێتەوە.

## بڕگەی چوارەم: ئایا لەدوای مردنیان، چۆن چاكە لەگەڵ باب و دایك دەكرێ؟ مافەكانیان چۆن جێ بەجێ دەكرێن؟

خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٢٤)دا دەفەرمویێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: هەروەها بڵێ پەروەردگارم! بەزەییت پێیاندا بێ، وەك چۆن منیان بە گچكەیی بەخێو كردوە.

واتە: بۆیان لەخوا بپاڕێوە، كە خوا بەزەیی پێیاندابێ و، ڕەحمیان پێ بكا، پلەیان بەرز بكاتەوە، ئنجا نەك هەر دوعایان بۆ بكەی، بەڵكو ئەگەر بزانی ڕۆژوویان لەسەرن، ڕۆژوویان بۆ بگرەوە، صەدەقەیان بۆ بكە، حەجییان نەكردبێ، حەجیان بۆ بكە، ئەو طاعەتانەی كە دەكرێن و، دەگونجێ زیندووان بۆ مردووانی بكەن، بۆیان ئەنجام بدە.

هەڵبەتە لەو بارەشەوە فەرموودە زۆرن، بەلاَم من تەنیا دووانیان دێنم:

١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویێ: {إِنَّ أَبَرَّ الْبِرِّ: صِلَةُ الْوَلَدِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ}[1] واتە: باشترین چاكەكردن لەگەڵ باب و دایكدا، ئەوەیە كە ڕۆڵە، منداڵ لەدوای مردنی لەگەڵ دۆستەكانی باییدا چاكەكار بێ، (هەڵبەتە بەنسبەت دایكیشەوە بەهەمان شێوە).

یانی: كەسێك برادەری بابت بووە، یاخود دەستەخوشكی دایكت بووە، ڕێزی بگرە، حورمەتی بگرە، هاوكاریی بكە، ئەوەش هەر چاكەكردنە لەگەڵ دایك و بابت، لەدوای مردنیان.

---

١) أخرجه أحمد: ٥٧٢١، والبخاري في الأدب المفرد: ٤١، ومسلم: ٢٥٥٢، وأبو داود: ٥١٤٣، والترمذي: ١٩٠٣، وقال: هذا إسناد صحيح.

٢) {عَنْ أَبِي أُسَيْد مَالك بْن رَبيعَةَ السَّاعديِّ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ جلوس عنْدَ رَسُولِ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ، إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلَمَةَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، هَلْ بَقِيَ منْ برِّ أَبَوَيَّ شَيْءٌ أَبَرُّهُمَا بِه بَعْدَ مَوْتهمَا؟ فقَالَ: نَعَمْ، الصَّلاَةُ عَلَيْهِمَا، وَالاسْتغْفَارُ لَهُمَا، وَإِنْفَاذُ عَهْدهمَا منْ بَعْدهمَا، وَصلَةُ الرَّحمِ الَّتي لاَ رَحمَ لَكَ إِلاَّ بهما، وَإِكْرَامُ صَديقهمَا}.[١]

(أبي أسيد مالك بن ربيعة الساعدي) دەڵێ: لەکاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دانیشتبووین، پیاوێك لە (بني سلمة) –هۆزێك بوون- هاتە خزمەتی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! ئایا دوای ئەوەی باب‌و دایکم کۆچی دواییان کردوە، لەدوای مردنیان چ چاکەیەك هەیە لەگەڵیان بکەم، ئایا هیچ هەیە من چاکەی پێ لەگەڵ ئەواندا بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، {ئنجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێنج (٥) شتی پێ گوتن، پێنج شت وەك نموونە، فەرمووی}:

١) دوعایان بۆ بکە.

٢) داوای لێبوردنیان بۆ لەخوا بکە.

٣) گفت و بەڵێنێکیان کە داوە بە کەسێك، {لە ژیانی خۆیانداو بۆیان جێ بەجێ نەکراوە} ئەو بەڵێنانەیان بۆ جێ بەجێ بکە.

٤) گەیاندنی ئەو پەیوەندیی خزمایەتییەی، کە بەهۆی وانەوە نەبێ پەیوەندیی خزمایەتییت بۆ ناگەیەندرێ، {ئەو خزمانەی باب‌و دایکت، پەیوەندی خزمایەتییان لەگەڵدا بگەیەنە، ئاگات لێیان بێ و، بەسەریان بکەوە}.

١) أخرجه أبو داود: ٥١٤٢، وأبن ماجة: ٣٧٩٥، وأبن حبان، والحاكم.

٥) دۆستو برادەرو هاوەڵێکیان کە هەبووە، ڕێزی بگرە، {ڕێـز لـە دۆسـتو هاوەڵەکانیشیان بگری، ئەویش هەر چاکە کردنە لەگەڵ ئەواندا}.

هەڵبەتە بەبارە پێچەوانەکەشیدا هەروایە: لە (صحیح البخـاري)[1]دا هـاتوە: کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: یەکێك لە ئێوە با قسـە بـە بـابو دایکی نەڵێ، {یان بـا لەعنـەت لـە بـابو دایکـی نـەکات}، گوتیـان: ئـەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) ئنجا کێ هەیە جنێو بە بابو دایکـی بڵـێ، {یان: کێ هەیە نەفرین لە بابو دایکی بکات}؟ فەرمووی: ئەو کەسە {ئەگەر پیاوە ئەگەر ئافرەتە} قسە بە بابو دایکی خەڵك دەڵـێ، {یـان نـەفرینیان لێ دەکا}، ئەو کەسەش جنێو دەداتەوە بە بـابو دایکـی ئـەو، {یـاخود: نـەفرین دەکاتـەوە لــە بــابو دایکــی ئــەو}، واتــە: مــادام بۆخــۆی بۆتــە هۆکــاری جنێوپێدرانیان، وەك بۆخۆی پێی گوتبن وایە.

بەڕاستیی براو خوشکانی مسوڵمان! مافی بـابو دایـك لەسـەر منـداڵ زۆر گرنگ و گەورەیەو، ئەرکێکی قورسە، بەتایبەت لـەم ڕۆژگـارەدا، بـە داخـەوە، بەهۆی ئەنتەرنێتو بەهۆی تەکنۆلۆجیای تـازەوە، ئەگـەر بـابو دایکـەکان بـە گچکەیی ئاگایان لە منداڵەکانی خۆیان نەبێت و، لەسەر چاکە ڕایـان نـەهێننو پەروەردەیان نەکەن، کاتێك گەورە دەبن، لێیان یاخیی دەبن، هەڵبەتە ئێمـە لـە ئاڵقەیەکی دیکەدا، بەتایبـەت باسـی مـافی منـداڵان دەکـەین لەسـەر بـابو دایکیان، کە چ ئەرکێکیان لەسەر بابو دایکیانە؟ کە من وەك پەندێك زۆرجـار گوتوومە: هەر کەسێ بە گچکەیی خەم لە منداڵی خـۆی بخـوات، بـە گـەورەیی ئیسراحەتی لێ دەکا، بەڵام هەرکەسێ بە گچکەیی منداڵی خـۆی ویـڵ بکـاتو پشتگوێی بخات، دوایی بە گەورەیی بۆی دەبێتە بەڵا.

---

١) صحيح البخاري: ٥٩٧٣.

خـوا بـە لوتـفو كـەڕەمی خـۆی یارمـەتییمان بـدات، كـە ئاگامـان لـە منداڵەكانمان بێـت و، مـافی بـابو دایكایـەتییان لەگـەڵ جـێ بـەجێ بكـەین، ئەركی ئەوان جێ بەجێ بكەین، تاكو ئەوانیش ئەركی ئێمە جـێ بـەجێ بكـەن، یاخود ئێمە مافی ئەوان بپارێزین، تاكو ئەوانیش مافی ئێمە بپارێزن، هەڵبەتـە بۆیەش تەنانەت ئایەتێكیش نابینین: خوا (سبحانه وتعالى) جارێك بـە بـابو دایـك بفەرموێ: لەگەڵ منداڵەكانتان چاك بن! هـەر بـە منـداڵان دەفـەرموێ: لەگـەڵ بابو دایكتاندا چاك بن! چونكە چاكیی بابو دایك لەگـەڵ منداڵـدا، شـتێكی زگماك و خوارسكە، بەڵام منداڵەكانن كە پێویستییان بەوە هەیەو، یەكەم كەس كە دەبێ منداڵ فێر بكات، لەگەڵ دایكو بابیاندا چاك بێ، دایكو باب خۆیانن، ئەویش بەو جۆرە كە بە ڕەوشتو ئاكاری پەسندو جوان، هەر بـە گچـكەیی بـە پەروەردەی جوان ڕایان بهێنن لەسەر هەموو شتێكی باش، بۆ ئەوەی دوایی ببنە مایەی بەرچاوڕوونییو دڵئارامییـان، نـەك خوانەخواسـتە بۆیـان ببنـە مایـەی شەرمەزاریی و بێزاریی و سەرئێشە.

ئاڵقەی پێنجەم:

## ئەدەبەكانی باب و دایک لەگەڵ ڕۆڵەدا

بەڕێزان!

لە حەوت بڕگەدا حەوت (٧) ئـەدەبی بـابو دایـك لەگەڵ ڕۆڵەدا دەخەینە ڕوو:

## بڕگەی یەكەم: هەڵبژاردنی دایكێكی باش و بابێكی پەسند بۆ ڕۆڵەكان:

یەكەم ئەدەبو ڕەوشتی بەرزو پەسند، كە دەبێ بابو دایك لەگەڵ منداڵی خۆیاندا بەكاری بێنن، بریتیە لەوە: كە هەم باب، دایكێكی چاك بۆ منداڵەكانی هەڵبژێرێ و، هەم دایك خەفتانی بابێكی باش بكات بۆ منداڵەكانی، واتە: كاتێك كە مرۆڤ هاوسەرگیریی دەكات، ئەگەر پیاوە: چاو بۆ ژنێكی باش بگێڕێ، چونكە دوایی دەبێتە دایكی منداڵەكانی و، ئەگەر كچە: چاو بۆ پیاوێكی باش بگێڕێ، كە دوایی دەبێتە بابی منداڵەكانی، لەو بارەوە با تەماشای چەند دەقێكی سوننەت بكەین:

١)- پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {تُنْكَحُ المرأةُ لأَرْبَع: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ}[1] واتە: ئافرەت لەبەر چوار شتان دەهێندرێ و دەكرێتە هاوسەر: یان لەبەرماڵو سامانیەتی، یان لەبەر حەسەبیەتی {واتە: ڕەچەڵەكو بنەماڵەی}، یان لەبەر جوانییەكەیەتی، یان لەبەر دینداریيەكەیەتی، ئنجا تۆ بۆ خاوەن دینەكە بخەفتێ، ئەگەر وانەكەی دەستت بەزەوییەوە بنووسێ {واتە: فەقیرو نەدار بكەوی}.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) ئەوەیە كە: تۆ ئەی پیاو! لەو سیفەتانەدا، كە ئافرەتیان بۆ دەهێندرێ، كە ئەو چوار سیفەتە سەرەكییەن: یان لەبەر ماڵو سامانە، یان لەبەر نەسەبو ڕەچەڵەكە، یان لەبەر

---

١) أخرجه البخاري: ٤٨٠٢، ومسلم: ١٤٦٦.

جوانیی‌و بەرچاوییەتی، یان لەبەر دینداریی‌و ڕەوشتی بەرزو جوانیەتی، تۆش ئەوە بە لەپێشتردا دابنێ‌و لەبەرچاو بگرە، کە ئەو ئافرەتە خاوەن دین‌و خاوەن ڕەوشتی جوان بێ، ئەو کاتە بێگومان هەرکەسێ دین‌و ڕەوشتی جوان بوو، قەرەبووی شتەکانی دیکە دەکاتەوە، بەلاّم چی لە جوانییەکەی دەکەی، ئەگەر خاوەن دین‌و ڕەوشتی جوان نەبێ، هەروەها نەسەب‌و ڕەچەڵەکەکەی بەتۆ چی و، ماڵ‌و سامانەکەی بەتۆ چی؟ ئەگەر لە خودی خۆیدا باش نەبێ، بەهۆی نەبوونی دینداریی و ڕەوشتی بەرزەوە، یانی: پەیوەندیی باش بوون لەگەڵ خوا و لەگەڵ خەڵك دا؟!

ئەوە بە نسبەت پیاوەوە، کە ژن دێنێ، پێویستە بەو شێوەیە بۆ ئافرەتی دیندار و ڕەوشت بەرز چاو بگێڕێ، ئەدی ئەگەر ئافرەت بیەوێ شوو بکات؟ ئەویش بەهەمان شێوە:

٢)- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی شووکردن و بەشوودانی ئافرەتیشەوە دەفەرموێ: {إِذَا أَتاكم مَنْ تَرْضَوْنَ خُلُقَهُ وَ دِينَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسادٌ كَبِيرٌ}[1] واتە: هەر کاتێك کەسێك هاتە لاتان، داوای خزمایەتیی لێکردن، {ئنجا برایە داوای خوشکیان لێکرد، یان بابە داوای کچیان لێکرد} ، ئەگەر لە ڕەوشتی‌و لە دینی ڕازی بوون، ئەو ئافرەتەی پێ بدەن، ئەگەر وانەکەن لە زەوییدا ئاشووب‌و بەلایەکی گەورە پەیدا دەبێ.

---

١) أخرجه الترمذي: ١٠٨٤، وقال: هذا الحديث قد خولف عبد الحميد بن سليمان في هذا الحديث ورواه الليث بن سعد عن ابن عجلان عن أبي هريرة عن النبي مرسلاً، قال الترمذي: قال محمد: وحديث الليث أشبه ولم يعد حديث عبد الحميد محفوظاً، وابن ماجه: ١٩٦٧، والحاكم: ٢٦٩٥، وقال: صحيح الإسناد، وتعقبه الذهبي بأن فيه عبد الحميد بن سليمان أخا فليح، قال أبو داود: كان غير ثقة، ووثيمة لا يعرف، وأخرجه أيضًا: الطبراني في الأوسط: ٤٤٦، وقال: الألباني صحيح، في السلسلة صحيحة.

واتە: کاتێ کە خەڵك پێوەرەکانیان، پێوەری ڕاست نابن بۆ خزمایەتیی‌و هاوسەرگیریی، لەو کاتەدا ئاشووب‌و فیتنە پەیدا دەبێ، لەکاتێکدا کە خەڵك چاو دەگێڕێ: کێ سامانی زیاترە، بەڵام ڕەنگە لە ڕەوشتدا سفر بێ، لە دیندا مایە پووچ‌و دەست بەتاڵ بێ، ئنجا ماڵ‌و سامانەکەی چییە؟! دەسەڵاتەکەی چیە؟! بایی فلسێکە، ئەگەر دوایی ئەو ئافرەتە لەگەڵیدا خۆشبەخت نەبوو، ڕێزی لێنەگرت، بەڵکو بەهۆی پلەو پایەو بەهۆی سامانەکەیەوە، خۆی بەسەردا هەڵکێشا، یان بەکەم تەماشای کرد، یاخود بەسەر ژنەکەیەوە گوناهو تاوانی کرد، ئەو کاتە ئەو ئافرەتە دەکەوێتە عەزاب‌و مەینەتییەوە! بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: هەرکەسێك لە ڕەوشت‌و لەدینی ڕازیی بوون، هاوسەرگیریی لەگەڵ بکەن، ئەگەرنا فیتنەو ئاشووبێکی گەورەو بەرفراوان وڵات دادەگرێ.

٣)- لە فەرمایشتێکی دیکەدا هەر لەوبارەوە کە دەبێ هەم پیاوو هەم ئافرەت، کاتێك دەیانەوێ هاوسەرگیریی بکەن، {واتە: باب یان دایك بۆ منداڵەکانیان دیاریی بکەن}، دەبێ تەواو چاویان وردبکەنەوە، دەفەرموێ: {تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ وَأَنْكِحُوا الأَكْفَاء وَأَنْكِحُوا إِلَيْهِم}[1]، واتە: بۆ نوتفەی خۆتان چاو بگێڕن، بخەفتێن و، لەگەڵ کەسانی هاوکوفدا هاوسەرگیریی بکەن و، خزمایەتیی لەگەڵ کەسانی هاوکوفدا بکەن.

واتە: هەم کە ژن دێنی، چاوت لە کەسانی هاوکوف‌و باش بێ، هەم کە ئافرەت بەشوو دەدەی، دیسان چاو بۆ ئینسانی باش بگێڕە.

١) أخرجه ابن ماجه: ١٩٦٨، والحاكم: ٢٦٨٧، والبيهقي: ١٣٥٣٦. وأخرجه أيضًا: الدارقطني (٢٩٩/٣) والألباني في السلسلة الصحيحة.

كەواتە: ئەدەبی یەكەمی باب‌و دایك لەگەڵ ڕۆڵەیاندا، ئەوەیە كە لەسەر بناغەی دینداریی‌و ڕەوشتی بەرزو جوان‌و ئاكارە مەعنەوییەكان، هاوسەرگیریی بكەن، بۆ ئەوەی دایكێكی چاك بۆ منداڵەكان، یاخود بابێكی چاك بۆ منداڵەكانیان دەستەبەر بكەن.

## بڕگەی دووەم: ناوی خوا هێنان لەكاتی پێكەوە جووتبوونی ژن و مێرددا:

ئەدەبێكی دیكە ئەوەیە كاتێك پیاو لەگەڵ هاوسەری دا جووت دەبێ، هەروەها ئافرەتیش كە لەگەڵ مێردیدا جووت دەبێ، لەكاتی سەرجێیدا ناوی خوا بێنن و، لەو كاتەشدا خوایان هەر لەیاد بێ، نەك وەك دوو ئاژەڵی دوور لە بەهای مەعنەویی بكەونە سەر یەك، بەڵكو وەك دوو مرۆڤی جێنشینی خوا، ناوی خوای لێ بێنن.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەو بارەوە دەفەرموێ: {لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ إذا أَ أَهْلَهُ قال: بِسْمِ اللَّهِ، أَللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا فقُضِيَ وَلَدٌ لَمْ يَضُرَّهُ}[1] واتە: كاتێك یەكێكیان دەچێتە لای هاوسەریی ئەگەر بڵێ: (بسم الله)، ئەی خوایە شەیتانمان لێ دووربخەوەو، ئەوەی پێمان دەدەی، شەیتانی لێ دووربخەوە، ئەگەر منداڵێكیان لەبەیندا بڕیار بدرێ، دوایی شەیتان زەفەری پێ نابات و دەپارێزرێ.

---

١) رواه البخاري: ٣١٠٩، ومسلم: ١٤٣٤.

## بڕگەی سێیەم: بانگ بەگوێی کۆرپەدا دان:

ئەدەبێکی دیکە کە باب و دایك پێویستە لەگەڵ منداڵی خۆیاندا، مامەڵەی پێ بکەن، ئەوەیە کە هەر لەدایك دەبێ، بابی بانگی بەگوێدا بدات، وەك لەم دەقەی سوننەت دا هاتوە:

{عن أبي رافع مولى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)قال: رأيتُ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) أَذَّنَ فِي أُذُنِ الْحسينِ بْنِ عَلِيٍّ حِينَ وَلَدَتْهُ فَاطِمَةُ، أذانه فِي الصَّلَاةِ}[١].

(أبو رافع) کە مەولای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە {واتە: کۆیلەیەکی ئازادکراوی بووە}، دەڵێ: پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بینی کاتێك کە (فاطمة) حوسەینی بوو، بانگی بەگوێ دادا، بانگی نوێژ {یانی بانگی تەواو}، یانی بانگی بەگوێی ڕاستیدادا، لە هەندێ ڕیوایەتانیشدا هاتوە: قامەتیشی بەگوێی چەپیدا دا، بەڵام هی بانگ سەنەدەکەی زیاتر ڕاستە.

حیکمەتەکەشی ئەوەیە کە: یەکەم وشە کە ئەو منداڵە دەدرێتە بەر گوێی، وشەی تەوحید بێ و، ناوی خوای بەرز، پاشان ناوی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بێ.

١) رواه أبو داود: ٥١٠٥، والترمذي: ١٥١٤، وقال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح.

## بڕگەی چوارەم: ناوی باش لێنان:

ئەدەبێکی دیکەی باب‌و دایك لەگەڵ منداڵدا، ئەوەیە کە ناوی باشی لێ بێنن، وەك لەو بارەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَسْمَائِكُمْ، فَحَسِّنُوا أَسْمَاءَكُمْ}[1]، واتە: ڕۆژی قیامەت بە ناوەکانتان بانگ دەکرێن، ئنجا ناوی چاك لەخۆتان بنێن.

واتە ناوی چاك لە منداڵەکانتان بنێن.

## بڕگەی پێنجەم: بەخێوکردن و بژێو بۆ پەیداکردن:

ئەدەبێکی دیکەی باب‌و دایك بەرامبەر بە منداڵ، ئەوەیە کە منداڵەکانیان بژیێنن، بژێویان بۆ پەیدا بکەن و، وابن کە چاو لەدەستی خەڵك نەبن، ڕەنج و زەحمەتیان بۆ بکێشن و، بێنیازیان بکەن لەوەی کە چاو ببڕنە دەستی خەڵك.

أ- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە دەفەرموێ: {الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ}[2] واتە: دەستی بەرز لە دەستی نزم چاکترەو، لەو کەسەوە دەست پێ بکە، کە ژیان دابین کردنی عایدی تۆیە.

واتە ئەو کەسەی کە تۆ مەسرەفی دەکێشی‌و بژێو دابینکردنی لەسەر تۆ ئەرکە، ئەگەر ماڵ‌و سامانێکت بوو، لەدابین کردنی پێداویستییەکانی ئەوەوە، دەست پێ بکە.

---

١) أخرجه أحمد: ٢١٧٣٩، وأبو داود: ٤٩٤٨، وابن حبان: ٥٨١٨.

٢) أخرجه أحمد: ١٥٦١٥، ومسلم: ١٠٣٤، والنسائي: ٢٥٤٣.

ڕستەی {دەستی بەرز لە دەستی نزم چاکترە}، یانی: دەستی بەخشەر لە دەستی وەرگر باشترە، کاتێکیش ئینسان دەتوانێ دەستی بەخشەر بێ، کە ئەهلی کەسابەت بێ، ڕەنج بداو، زەحمەت بکێشێ.

ب- فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە: {كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَعُوْلُ}[1] واتە: مرۆڤ ئەوەندە گوناهەی بەسە، کەسێك زایە بکات، کە دەبێ بیژیەنێ.

کەسێك ژیاندنیو بژێو پێدانی عایدی ویە، ئەوەندە گوناهەی بەسە کە کەمتەرخەم بێ بەرانبەری.

## بڕگەی شەشەم: فێرکردن و پەروەردەکردن:

ئەرکێکی دیکەی بابو دایك بەرامبەر بە ڕۆڵەیان، ئەوەیە کە فێریان بکەنو پەروەردەیان بکەن، وەك:

أ- خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (التحريم) ئایەتی (٦)دا, دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَـٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦ ﴾ التحريم:٦، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! خۆتانوماڵو خێزانتان لە ئاگرێك بپارێزن، کە سووتەمەنییەکەی مرۆڤەو بەردە، چەند فریشتەیەکی دڵڕەقی بەدەن بەهێزی لەسەرن، سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناکەن و، چییان پێ بگوترێ، جێ بەجێی دەکەن.

---

١) أخرجه أحمد: ٦٤٩٥، وأبو داود: ١٦٩٢، والحاكم: ١٥١٥.

ب- هەروەها ئەم فەرمایشتەش هەیە لەو بارەوە:

{عن عمر بن أبي سلمة ﷺ ربيب رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قـال: كُنْـتُ غُلاماً في حَجْـرِ رَسُـولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَكَانَـتْ يَـدِي تَطِـيشُ في الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): يـا غُـلامُ، سَـمِّ اللَّهَ، وَكُـلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ}.[1]

واتە: عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە، {کـە پـەروەردەکراوی پێغەمبـەر بـووە (صلى الله عليه وسلم) و، لـەماڵی پێغەمبـەردا (صلى الله عليه وسلم) بـەخێو کـراوەو پەروەردە کراوە}، دەڵێ: من منداڵێکی گچـکە بـووم، لەباوەشـی پێغەمبـەردا (صلى الله عليه وسلم)، {لەژێر سەرپەرشتیی‌و چاودێریی ئەودا}، لـەکاتی خواردنـدا {کە قاپە خواردنیان دادەنا}، دەستم تێ دەگێڕا، دەستم لەملاو لەولا دەگێـڕا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم ڕۆڵە گیـان! نـاوی خـوا بێنـەو، بەدەستی ڕاستت بخۆو، لەپێش خۆشتەوە بخۆ.

بە یەك ڕستە سێ ئەدەبی گەورەی فێر کردووین:

١) ناوی خوا بێنە، بڵێ (بسم الله).

٢) بەدەستی ڕاستت بخۆ، نەك بەدەستی چەپ، یان بەهەردووك دەستان.

٣) لەپێش خۆشتەوە بخۆ، دەست بۆ ئەولاو ئەولا درێژ مەکە.

---

١) أخرجه البخاري: ٥٣٧٦، واللفظ له، ومسلم: ٢٠٢٢.

## بڕگەی حەوتەم: دادگەربوون لەگەڵ منداڵەکانیاندا:

ئەدەبێکی دیکەی باب‌و دایك لەگەڵ منداڵیاندا، لەگەڵ ڕۆڵەیاندا، ئەوەیە کە دادگەرانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، بە یەکسانیی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن و، فەرق‌و جیاییان پێ نەکەن، با لەو بارەوەش ئەم فەرمایشتە بێنین:

{عَن النُّعْمَانَ بْنَ بَشِير ﷺ أَنَّ أَبَاهُ أَتَى به رَسُولَ اللَّه فقال: إني نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلَامًا كان لي، فقال رسول الله: أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ مِثْلَهُ؟ فقَالَ : لَا، فقَالَ رَسُولُ اللَّه: فَارْجِعْهُ -وفي رواية:- أفعلت هذا بولدك كله؟ قال: لاَ، قال: اتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلَادِكُمْ}[1].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: بابم منی بردە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و، گوتی: ئەم کوڕەم غولامێکم پێداوە، {غولامێك کە هەمبووە داومەتە وی}، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: هەموو کوڕەکانت غولامت پێداون، وەك ئەمە؟ گوتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بیگێڕەوە. -لە ڕیوایەتێکدا فەرمووی: ئایا بەم شێوەیەت کردوە لەگەڵ هەموو منداڵەکانت-، {هەموو ڕۆڵەکانت[2] بە کوڕو کچەوە}، گوتی: نەخێر، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: پارێز لەخوا بکەن‌و لەنێوان منداڵەکانتاندا دادگەر بن.

بە یەکسانیی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن‌و، فەرق‌و جیاوازیی مەکەن.

---

١) أخرجه البخاري: ٢٤٤٧، ومسلم : ١٦٢٣.

٢) چونکە وشەی (ولد) بۆ کوڕ و کچ (ابن و بنت) بەکاردێ.

کۆتایی ئەم ئاڵقەیەش بەم بەسەرهاتە دێنم:

ڕۆژێك کابرایەك دێت بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ سکالاَ لە کوڕەکەی دەکا، کە کوڕەکەی لەگەڵی باش نیە، سەرپێچیی دەکا، دڵی دێشێنێ و، ئەرکی باب‌و کوڕایەتیی لەگەڵ جێ بەجێ ناکات، ئەویش کوڕەکەی بانگ دەکا بۆ لێپرسینەوە، پێی دەڵێ: بۆچی ڕێزی بابت ناگری؟ بۆچی لەقسەی دەردەچی و دڵی ئازار دەدەی؟ ئەویش دەڵێ: ئەی فەرماندەی بڕواداران! ئایا هەر باب‌و دایك مافیان لەسەر ڕۆڵەیان هەیە، یان ڕۆڵەش مافی لەسەر دایك‌و بابی هەیە؟

دەڵێ: نەخێر، ڕۆڵەش مافی لەسەر باب‌و دایکی هەیە.

دەڵێ: مافی ڕۆڵە لەسەر باب‌و دایك چیە؟

دەڵێ: یەکەم: شت ئەوەیە کە باب، دایکێکی باش بۆ ڕۆڵەکانی پەیدا بکات، {هەروەك دایکیش بابێکی باش بۆ ڕۆڵەکانی پەیدا بکات}، دووەم: ئەوەیە کە باشی پەروەردە بکا، چاکەو تاعەتی فێر بکات، سێیەم: ناوی چاکی لێ بنێ.

دەڵێ: ئەی فەرماندەی بڕواداران! ئەو بابەی من، هیچ کام لەو سێ مافەی بۆ من جێ بەجێ نەکردون.

دەڵێ: چۆن؟

دەڵێ: دایکم ئافرەتێکی کۆیلەی ڕەشپێست بووە، {یانی: چۆن ئاسان هاتۆتە بەردەستی، هاوسەرگیریی لەگەڵدا کردوە}، هەروەها لەجیاتی پەروەردەکردنم، هەر حوشتری پێ لەوەڕاندووم، هیچی فێر نەکردووم.

ناویشی لێناوم (جُعَلْ)، یانی: قالۆنچە، {یانی: ناوێکی خراپیشی لێ ناوم}.

عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) ئاوڕ لە کابرا دەداتەوەو، دەڵێ: (إذهب فقد عَقَقْتَهُ قبل أن يَعُقَّك، وأسَأتَ إليه قَبلَ أَنْ يُسيئَ إلَيك)، واتە: بڕۆ! تۆ مافی ئەوت فەوتاندوە، پێش ئەوەی ئەو مافی تۆ بفەوتێنێ و خراپەت لەگەڵ کردوە بەر لەوەی خراپەت لەگەڵدا بکات.

یانی: تۆ باش مشوورت لەو نەخواردوەو ئەگەر خراپیش دەرچووبێ سووچ و تاوانی خۆتە.

بەڵێ باب‌و دایکیش ئەرکی منداڵەکانیان لەسەرەو دەبێ مافی منداڵەکانیان دابین بکەن و، ئەرکیان جێ بەجێ بکەن، بۆ ئەوەی ئەوانیش بیانوویان نەبێ و، لار دەرنەچن، کە دوایی مافی باب‌و دایکیان جێ بەجێ نەکەن و بگرە خراپەشیان لەگەڵ بکەن!

ئاڵقەی شەشەم:

# ئەدەب لەگەڵ خزمان دا

بەڕێزان!

بۆ ئەوەی بزانین ڕەوشتو ئەدەبی خزمایەتیی و، جێ بەجێ کردنی پەیوەندیی خزمایەتیی چییەو چۆنە؟ ئەم ئاڵقەیەمان بۆ تەرخان کردوە، کە لە پێنج بڕگەدا پێشکەشی دەکەین!

## بڕگەی یەكەم: پێناسەی پەیوەندیی خزمایەتیی:

مەبەست لە وشەی: (صلة الرحم) یانی: پەیوەندیی خزمایەتیی، (الصلة هي إيصال ما أمكن من الخير، ودفع ما أمكن من الشر، حسب الطاقة)، كە دەگوترێ: (صلة الرحم) گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، بریتیە لەوە: كە بەپێی توانا هەرچی خێرو چاكەو سوودو بەرژەوەندییە، بیگەیەنی بەو كەسە كە خزمتەو، هەرچی خراپەو ناڕەحەتییە بەپێی توانا لێی دووربخەیەوە.

پێچەوانەی (صلة) بریتیە لە (قطيعة) بڕین، دابڕین: (القطيعة: هي الإساءة إلى الرحم أو ترك الإحسان)، واتە: پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، بە دوو شێوەیە: أ- بریتیە لە خراپەكردن لەگەڵ كەسێكدا كە خزمەو نزیكە، ب- یاخود چاكە لەگەڵدا نەكردنی.

هەر خودی چاكە لەگەڵدا نەكردنی، بریتیە لە پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، ئەگەر هیچ خراپەشی لەگەڵدا نەكرێ.[1]

دیارە مەبەستیش لە خزمان (أقارب) ئەوانەن, كە بە مرۆڤ دەگەنەوە، لەلای باببیەوە یان لەلای دایكیەوە. واتە خزمی پشتێ، یا خزمی بەرێ, وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ﴾ الفرقان: ٥٤، واتە: خوا ئەو زاتەیە كە لە ئاو مرۆڤی خولقاندوەو، دابەشی كردوە بۆ پشتێو بۆ بەرێ.

---

١) السلوك الإجتماعي في الإسلام، حسن أيوب، ص(٢٦٧-٢٦٨).

(نَسَبْ) ئەوەیە کە لەڕێی (باب)ەوە بەمرۆڤ دەگاتەوەو، (صهر)یش ئەوەیە کە لە ڕێی دایکەوە پێی دەگاتەوە، کە هەردووك جۆرەکە هەر خزمایەتییە، چ هی پشتیَ بێ، چ هی بەریَ بێ.

## بڕگەی دووەم: پلەوپایەو پێگەی خزمایەتیی لە ئیسلامدا:

لەوبارەوە ئایەتی قورئان و دەقی سوننەت زۆرن و، بەم ئایەتە موبارەکە دەست پیَ دەکەین.

١- خوا دەفەرمویَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾النساء.

ئەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن، کە لە یەك نەفس، {لە یەك مرۆڤ} ئێوەی هێناوەتە دی و، هەر لە خۆیشی هاوسەرەکەی دروست کردوە، {واتە: هاوسەرەکەشی هەر لەو جۆرە نەفسەیە کە پیاوەکەی لیَ دروست بووە، کە پیاوەکە ئادەمەو، هاوسەرەکەشی حەووایە (صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بیَ)}.

﴿وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗ﴾، لەو دووانەش پیاوانو ئافرەتانێکی زۆری بڵاوکردوونەوە.

کەواتە مرۆڤایەتیی هەمووی دەچێتەوە سەر دایكو بابێك، مرۆڤایەتیی هەمووی لە خێزانێکەوەیە.

﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ﴾، هەروەها (ئەی خەڵکینە!) پارێز لەو خوایە بکەن، کە شتی پێ لە یەکدی داوا دەکەن و، پارێزیش لە پەیوەندییەکانی خزمایەتیی بکەن، {مەیانپچڕێنن}.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾، بەدڵنیایی خوا بەسەرتانەوە چاودێرە.

لێرەدا خوا (سبحانه وتعالى) سەرنجمان ڕادەکێشێ و هانمان دەدات، کە ئێمە تەماشای هەموو مرۆڤەکان بکەین، وەك خزمان و وەك خێزانێك.

٢- وەك لە سوورەتی (الحجرات-١٣-)یشدا خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لە نێرو مێ یەك هێناوەتەدی، {واتە: باب و دایکێك}، دوایی گێڕاومانن بە چەند گەل و هۆزێك، تاکو پێك ئاشنا بن، پێکەوە هاوکار بن، بەڕێزترتان لەلای خوا پارێزکارترتانە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.

٣- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش لەبارەی پەیوەندیی خزمایەتییەوە، دەفەرموێ: {إِنَّ الرحم شَجْنَةٌ[1] مِنَ الرَّحمان، فقال الله: مَنْ وَصَلَكِ، وَصَلْتُهُ، وَمَنْ قَطَعَكِ، قَطَعْتُهُ}[2].

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: پەیوەندیی خزمایەتیی[3] لقێکە لە

١) شُجْنَةَ، شَجْنَةَ، شِجْنَةَ: فرع، قطعة: لق، پارچە، بەش.
٢) أخرجه البخاري: ٥٦٤٢.
٣) رَحِمْ: یانی منداڵدان، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ خزمایەتیی (القرابة).

ناوی (الرحمان) {سیفەتی خوای خاوەن بەزەیی} داتاشراوە، خـواش فـەرمووی: هەر کەسێ تۆ بگەیەنێ، دەیگەیەنم و، هەر کەسـێ تـۆ بپچـڕێنێ دەیپچـڕێنم. واتە: ئەی خزمایەتیی! هەر کەسێك تۆ بگەیەنێ، منیش ڕەحمـەتی خـۆمی پـێ دەگەیەنم و، هەر کەسێك تۆ بپچڕێنێ، منیش بەزەیی خۆمی لێ دادەبڕم.

٤- هـەروەها پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) لـە فەرمایشـتێکی دیکـەدا دەفەرمویٚ: {لاَ يَدخُلُ الجَنَّة قَاطِع}[1].

واتـە: ئـەو کەسـەی پەیوەندییـەکان دەپچـڕێنێ، پەیوەنـدیی خزمایـەتیی دەپچڕێنێ، ناچێتە بەهەشت.

## بڕگەی سێیەم: چۆنیەتیی و گرنگی پەیوەندیی خزمایەتیی:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ: {لَـيْسَ الوَاصِـلُ بِالْمُكَـافِئِ، وَلَكِـنَّ الوَاصِلَ الَّذِي إِذَا قُطِعَـتْ رَحِمُـهُ وَصَـلَهَا}[2] واتـە: گەیەنـەری پەیوەنـدیی خزمایـەتیی ئـەو کەسـە نیـە، کـە چـاکەی لەگـەڵ بکـرێو چـاکە بکاتـەوە، {خزمەکەی لەگەڵی چاك بێ، ئەویش لەگەڵی چاك بێ}، بەڵکو ئەو کەسەیە کە پەیوەندیی خزمایەتیی لەگەڵ بپچڕێندرێ، کەچی ئەو هەر بیگەیەنێ، هەر سوور بێ لەسـەر بـەردەوام بـوونی خزمایەتییەکـەی، ئـەوە گرنگـە، ئەگـەرنا چـاکە لەبەرامبەر چاکەدا، ئازایەتیی نیە.

---

١) رواه البخاري: ٥٦٣٨ ومسلم: ٢٥٥٦.
قاطع: بڕەر، پچڕێنەر، کە لێرەدا مەبەست پچڕێنەری پەیوەندیی خزمایەتییە.
٢) رواه البخاري: ٥٩٩١.

ئەم فەرمایشتەش زۆر جوان گەورەیی و گرنگیی پەیوەندیی خزمایەتیی پێشان دەدا:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ سَرهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ} [1] واتە: هەر کەسێ حەز دەکاو پێی خۆشە بژێوی فراوان بێ‌و، تەمەنی دوابخرێ، {یانی: تەمەنی تێرو تەواو و، پڕ بەرەکەت بێ}، با پەیوەندیی خزمایەتیی بگەیەنێ.

واتە: لە ئەنجامی گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی دا، بژیو زۆر و بەپێز و، تەمەنیش بەرهەمدارتر دەبێ.

ئەمە یاسایەکی گەردوونیی خوایە: ئەوانەی کە لەگەڵ خزمانیاندا باشن، تەمەنیان پڕ بەرەکەتتر دەبێ، چ لەڕووی درێژییەوە، چ لەڕووی پانییەوە، چونکە تەمەن گرنگ ئەوەیە پان و بە بەرەکەت بێ، هەی وا هەیە سەد (١٠٠) ساڵ تەمەنیەتی، بەڵام بە باریکە ڕێیەکدا ڕۆیشتوە، کەس هەستی پێ نەکردوە، هەی واش هەیە: چل پەنجا (٤٠-٥٠) ساڵ دەژی، بەڵام تەمەنەکەی پانە، کاری خێری زۆر تێدا کردوە، بۆیە من زۆرجار هەر بۆخۆشیی بە ڕەفیقەکانم دەڵێم: دوعای تەمەن پانیی بۆ یەکدی بکەن، نەك تەمەن درێژیی، گرنگ ئەوەیە ئینسان تەمەنەکەی پان بێ، واتە با ساڵەکانیش کەم بن، بەڵام کردەوەی چاکی زۆر تێدا ئەنجام دابن، بەڵام با ساڵەکان زۆریش بن، ئەگەر هەر بە باریکە ڕێیەکدا ڕۆیشتبێ، کردەوە باشەکانی کەم بن، تەمەن درێژیی هیچ بۆ ئینسان ناکات.

---

١) رواه البخاري: ٥٩٨٦، ومسلم:٢٥٥٧.

بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {خَيْرُكُم مَنْ طَالَ عُمرهُ، وَحَسُنَ عَمَلُهُ}[1] واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە کە تەمەنی درێژ بێو کردەوەشی باش بێ.

تەمەن درێژیی لەگەڵ کردەوەی باش دا، ئەوە خێرو نیعمەتە، بەڵام لەگەڵ کردەوەی خراپ دا، یان لەگەڵ بێ کردەوەییدا، هیچ نیە، مرۆڤ هەر لەسەری قەرزار دەبێتەوە.

## بڕگەی چوارەم: پلەو جۆرەکانی پەیوەندیی خزمایەتیی:

### أ- جۆرەکانی پەیوەندیی خزمایەتیی:

پەیوەندیی خزمایەتیی هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە دەگەیەندرێ، هەم لە ڕووی ماددییەوە:

لەڕووی مەعنەوییەوە ئەوەیە ئینسان ڕێز لە خزمەکانی بگرێ، دڵنیان خۆش بکا، لە شینو شاییان دا بەشدار بێ، بە تەنگییانەوە بێ، دوعای خێریان بۆ بکا، بە دەمیانەوە بچێ.

لە ڕووی ماددییشەوە: ئەوەیە کە هاوکاریان بێ، کاتێك کە لێیان دەقەومێ و، پێویستیان پێی دەبێ، هاوکارییان بکات.

واتە گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، هەم ڕوویێکی مەعنەویی هەیە، هەم ڕوویێکی ماددییو بەرهەستیشی هەیە, پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش دەفەرموێ: {الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَعَلَى ذِي الْقَرَابَةِ اثْنَتَانِ:

١) أخرجه أحمد: ١٧٧٣٤، وعبد بن حميد: ٥٠٩، والترمذي: ٢٣٢٩، وقال: حسن غريب.

صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ}[١] واتە: خێركردن بە هەژارو نەدار، هەر خێركردنە، بەڵام خێركردن بە خاوەن پەیوەندیی خزمایەتیی دوو شتە: هەم خێرە، هەم گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتییشە.

**ب- پلەكانی پەیوەندیی خزمایەتیی:**

لە پەیوەندیی خزمایەتییدا سێ پلەو حاڵەتمان هەن:

١) كەسێك كە پەیوەندیی خزمایەتیی دەگەیەنێ، بەبێ بەرامبەر، ئەوە پێی دەگوترێ (واصل)، واتە: كە كەسێك پەیوەندیی خزمایەتیی دەگەیەنێ، بێ ئەوەی تەماشا بكات داخۆ بەرامبەرەكەی چی دەكا؟ ئەو لەسەر كاری خۆی بەردەوامە, كە ئەوە زۆر پلەیەكی گەورەیە.

ڕۆژێك پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) من خزمم هەن، من چاكەیان لەگەڵ دەكەم، ئەوان خراپە دەكەن، من پەیوەندیی دەگەیەنم، ئەوان دەیپچڕێنن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەگەر وەك تۆ دەیڵێی وابن، {فَكَأَنَّمَا تُسِفُّهُمْ الْمَلَّ}[٢] وەك ئەوە وایە، تۆ ڵمی گەرمیان بە قوڕگدا بكەی.

واتە: كە تۆ چاكەیان لەگەڵدا دەكەی و، ئەوانیش خراپە دەكەن و، تۆ پەیوەندیی دەگەیەنی و، ئەوان دەیپچڕێنن، بۆ ئەوان زۆر زۆر خراپە، گوناهێكی گەورەیەو، سزایەكی خراپ چاوەڕێیان دەكا.

---

١) أخرجه ابن أبي شيبه: ١٠٥٤١، وأحمد: ١٦٢٧٨، والدارمي: ١٦٨١، والترمذي: ٦٥٨، وقال: حسن.

٢) رواه مسلم: ٢٥٥٨.

کەواتە حاڵەتی یەکەم بریتیە لەوەی کە ئینسان پەیوەندی خزمایەتیی بگەیەنێ بەبێ بەرانبەرو، بەبێ چاوەڕوانی، کە ئەوە باشترین پلەو حاڵەتی خزمایەتییە.

٢) حاڵەتی دووەمی پەیوەندیی خزمایەتیی، بریتیە لەوە، کە ئینسان چاکەدەرەوە(مكافيء) بێ، (واصل) نەبێ، بەس (مكافيء) بێ، واتە ئەگەر چاکەیان لەگەڵ کرد، ئەویش چاکەیان لەگەڵ بکات، بەڵام ئەگەر نەیانکرد، ئەویش نەیکات، ئەوەش حاڵەتێکی میانگیرە.

٣) حاڵەتی سێیەم کە زۆر خراپە، بریتیە لە پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، جا چ بەرامبەرەکانی بیپچڕێنن، یاخود مرۆڤ دەست پێشخەر بێ، یاخود لە بەرامبەردا بێ، گرنگ ئەوەیە پەیوەندیی خزمایەتیی پچڕاندنەکە، بەتایبەتی کە بیانوو و بەهانەیەك نەبێ، گوناهێکی گەورەیە، چونکە باسمان کرد کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر بە جەخت کردنەوە دەفەرموێ: {لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ}[1] پچڕێنەری پەیوەندیی خزمایەتیی ناچێتە بەهەشت.



١) أخرجه البخاري: ٥٦٣٨، ومسلم : ٢٥٥٦.

## بڕگەی پێنجەم: چۆنیەتیی مامەڵەكردن لەگەڵ خزمی خراپدا:

ئایا كەسێك خزمی خراپی هەن، ئنجا خزمایەتییەكەیان هەر پلەیەكی هەیە، پلە یەكە، پلە دووە، پلە سێیە، خزمەكان هەر پلەیەكیان هەیە، بەڵام خراپن، ئایا چۆنیان مامەڵە لەگەڵدا بكات باشە؟!

وەك پێشتر باسمان كرد، مرۆڤ دەبێ بەپێی توانا پەیوەندیی خزمایەتیی هەر بهێڵێتەوەو، پارێزگاریی لێ بكاو، لەسەر چاكەكاریی و گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی خۆی، بەردەوام بێ، چونكە گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی وەك هەموو كردەوە چاكەكان و سەرجەم ئەدەبو ڕەوشتە بەرزەكان، تۆ كاتێك كە ئەنجامیان دەدەی، چاوەڕێی پاداشتی لە خوا، وەك لە سووڕەتی (الإنسان)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ﴾ (٨)، یانی: خواردنێك كە خۆشیان دەوێ, دەیدەن بە نەدارو بە هەتیو و بە دیل، دەشڵێن، {واتە: لەبەرخۆیانەوە و لە دڵی خۆیاندا}: ئێمە تەنیا لەبەر ڕووی خوا، لەبەر ڕەزامەندیی خوا، خواردنتان پێ دەدەین، هیچ چاوەڕوانییەكتان لێ ناكەین ﴿ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ﴾ الإنسان: ٩، نە چاوەڕێی پاداشتتان لێ دەكەین، نە سوپاسكردن، یانی: نە چاوەڕێی پاداشتی ماددیی، نە چاوەڕێی پاداشتی مەعنەوییتان لێ دەكەین.

ئنجا ئینسان دەبێ بیكا بە نیشانە، كارێك كە بۆ خوا دەیكەی، ئەگەر بەڕاستیی بۆ خوا بێ، دەبێ هیچ چاوەڕوانییەكت لەو كەسە نەبێ، كە چاكەی لەگەڵدا دەكەی، ئنجا ئەگەر خزمە، ئەگەر بێگانەیە، ئەگەر خوێشە، ئەگەر دەروێشە. ئەگەر هیچ چاوەڕوانییەكت نەبوو، مانای وایە بەڕاستیی بۆ خوات

کردوەو، ئیکتیفات کردوە، بە پاداشتی خواو، ئیکتیفات کردوە بە دیتنی خواو، باسیشی ناکەی و، بەچاوی خەڵکیشی دانادەیەوەو، هیچ چاوەڕوانییەکیشت لەبەرامبەرەکەت نابێ، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە بۆ خوات کردوە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ ﴾ الإنسان: ٩، تەنیا لەبەر ڕووی خوا، لەبەر ڕەزامەندیی خوا، لەبەر دیداری خوا، ئێمە خواردنتان پێ دەدەین، ئنجا مادام لەبەر خوایە ﴿ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ﴾ الإنسان: ٩، پاداشتی ماددیی و، هی مەعنەوییتان لێ چاوەڕوان ناکەین.

بەڵام: هەر کەسێك لەبەرامبەر چاکەیەکدا کە دەیکات، ئەگەر چاوەڕوانیی لەگەڵ چاکە لەگەڵ کراوەکەدا هەبوو، چ چاوەڕوانیی ماددیی چ مەعنەویی، ئەوە با بزانێ: کە کارەکەی بێ خلتەو ساغ نیە بۆ خوا!

بۆیە مرۆڤ لە پەیوەندیی خزمایەتییدا نابێ کارەکەی بە بەرامبەر بێت، نابێ بە دەستەوا و، بە چاوەڕوانییەوە بێت، پەیوەندیی خزمایەتیی گەیاندن لە خودی خۆیدا، عیبادەتو طاعەتە، وەك پێشتر باسمان کرد: ئەدەب و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لە خودی خۆیاندا عیبادەتو طاعەتێك، مرۆڤ پێیان هەڵدەستێ، بۆ ئەوەی پاداشتیان لەبەرامبەردا وەربگرێ و خۆیان پێ لەخۆی ڕازی بکات.

ئنجا بێگومان خۆشە کە تۆ چاکە لەگەڵ کەسێکدا دەکەی، لەبەرچاوی بێتو لەبیری بێت، بەڵام ئەگەر لەبیری نەبوو و، لەبەرچاوی نەبوو، نابێ لە چاکەکەت پەشێمان ببیەوە، چونکە تۆ لەبەر خوا کردووتە.

بەڵام لێرەدا یەك حاڵەت لەو بنچینەیە هەڵداوێردرێ و، جیا دەکرێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە کەسێك گرفتار دەبێ بە هەندێك خزمی خراپەوە، جا ئەگەر

برایە، ئەگەر خوشکە، ئەگەر مامە، ئەگەر پوورە، ئەگەر خاڵە، هەر کەسێکەو هەر پلەیەکی هەیە، دوورە یان نزیکە، کاتێك ئەو خزمانە خراپن و، زیانبەخشن و، ئەگەر بێت و هاموشۆو پەیوەندیی لەگەڵیاندا بەردەوام بێ، تەنیا بۆی دەبنە مایەی سەرئێشەو، بۆی دەبنە مایەی ناڕەحەتیی و، هیچ سوودێکیشی بۆیان نیە، یاخود هیچ کەڵکێکی لێ وەرناگرن، لەو حاڵەتەدا ئەم ئایەتە موبارەکە دەبێتە یاسا، کە دەفەرموێ:﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ الْعِلْمِ ﴾ النجم: ٢٩-٣٠، واتە: هەر کەسێك پشتی لە یادی ئێمە کرد، لە بەرنامەی ئێمە کردو، تەنیا ژیانی دنیای ویست، تۆش پشتگوێی بخەو وازی لێبێنە.

پێم وایە دەبێ بڵێین: بەڵێ، بەڵام ئەوە لەکاتێکدا کە تۆ نائومێد دەبی، لەوەی کە بەهۆی گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتییەوە لەگەڵ ئەو جۆرە خزمانەدا، سوودێکیان پێ بگەیەنی، بەڵام بێگومان هەتا ئومێدت پێیان هەبێ، کە قسەیەکی خێریان بۆ بکەی و، ڕۆژێك لە ڕۆژان بگەڕێنەوەو دڵیان نەرم بێ، پێویستە لەسەر پەیوەندیی گەیاندنی خۆت هەر بەردەوام بی، کە ئەوەش تەقدیرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤ خۆی و، یاسایەکی گشتییمان نیە دیاریی بکات، بەڵام بەگشتی ئینسان هەتا زیاتر لای خزمایەتییو، گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی بگرێ و، فشار لەخۆی بکات، بە تەئکید باشترە، ئەمڕۆ نا سبەی، سبەی نا، دووسبەی، ئەم ساڵ نا، ساڵێکی دیکە، ڕەنگە چاوبەخۆیاندا بگێڕنەوە، بەڵام لەکاتی پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی دا، ئەوانیش ڕەنگە زیاتر دوور بکەونەوەو، لەگەڵ خەڵکی خراپدا زیاتر تێکەڵ بن و، سەرەنجام زیاتر تووشی زەرەرو زیان ببن.

ئاڵقەی حەوتەم:

# ئەدەب لەگەڵ دراوسێ دا

دراوسێ بە عەرەبیی (جار)ی پـێ دەڵـێن، بـە (جـیران) كۆدەبێتەوە، واتە: دراوسێیەكان، ئەوانیش ئەوانەن كـە ماڵیان لێك نزیكە، ماڵیان لە تەنیشت یەكدییە، ئێمـە لە چوار(٤) بڕگـەدا، باسـی ئـەدەبو ڕەوشـتی بـەرزو جوانی مسوڵمانەتیی لەگـەڵ دراوسـێ داو، چـۆنیەتیی مامەڵە لەگەڵ دراوسێ دا، دەكەین:

**بڕگەی یەکەم: پێناسەی دراوسێ:**

لە کتێبە فیقهییەکاندا: (حق الجار)، (حق الجوار) لەژێر ئەو ناوونیشانەدا پێناسەی دراوسێ (جار) هاتوە، ئایا مەبەست لە دراوسێ کێیە؟ چەند ماڵ لەملاو لای ماڵی تۆ دەگرێتەوەو، پێی دەگوترێ: دراوسێ؟ لەوبارەوە زانایان ڕا جیاییان هەیە، بۆ وێنە: (إبن حجر) لە (فتح الباري)دا[1]، دەڵێ: (حد الجوار أربعون داراً من كل جانب)، دوایی دەڵێ: (وهذا يحتمل أن يراد منه التوزيع، فيكون من كل جانب عشرة).

یانی: زۆر لە زانایان گوتوویانە چل (٤٠) ماڵ لە تەنیشت ماڵی تۆوە، پێی دەگوترێ: دراوسێ، ئنجا (إبن الحجر) دەڵێ، ئەمە ئەگەری ئەوەی هەیە مەبەست ئەوە بێ کە ئەو چل ماڵە دابەش بن بەسەر هەر چواردەور دا، واتە دە(١٠) ماڵ لەلای ڕاست، دە(١٠) ماڵ لەلای چەپ، دە(١٠) ماڵی لەلای پێشەوە، دە(١٠) ماڵ لەلای دواوە، هەندێکی دیکەش گوتویانە نەخێر، بەڵکو چل ماڵ لە هەر چوار لاوە.

منیش ڕام وایە کە ئەم مەسەلەی: ئایا چەند ماڵ دراوسێن؟ دەگەڕێتەوە بۆ عورف و نەریت و، جۆر و هەڵکەوتەی کۆمەڵگا، بۆ وێنە: لەدێیەکی گچکەدا، هەموو ماڵەکان بەدراوسێی یەکدی لە قەڵەم دەدرێن، هەروەها دێ، ئەگەر گەورە بێ، ئەگەر گچکە بێ، مادام هەموویان یەکدی بناسن، بە هاوماڵ و دراوسێی یەکدی لەقەڵەم دەدرێن، بەڵام لە شارێکی قەرەباڵغ دا، کە بەجۆرێکی دیکە خانووەکانیان هەڵکەوتوون، مەرج نیە دە(١٠) خانووش لەهەرلایەك هەبن،

---

١) ج١٠ ص٣٧٤.

بە دراوسێ دابندرێن، چونکە ڕەنگە خانووەکانیان پانتـایی زۆریـان داگرتبـێ و، هەتا دە(١٠) ماڵان ئاوا دەڕۆی بەملاولادا، مەسافەکەی زۆربێ و، مـەرج نیـە هەموویان بە دراوسێ دابنرێن، بۆیە مەرج نیە، ئەو بنچینەیە لە هەموو حـاڵان دا ڕاسـت بـێ و، ئـەو شـتانە دەگەڕێنـەوە بـۆ عـورف و هەڵکەوتـەو نـەریتی کۆمەڵگاو، چۆنیەتیی شارنشینیی و، دیمۆغرافیای شوێنەکان.

## بڕگەی دووەم: گرنگیی پەیوەندیی دراوسێیەتی و، چاکە لەگەڵ دراوسێ دا:

با سەرەتا تەماشای ئەم ئایەتە موبارەکە بکەین، ئایەتی (٣٦) لە سـوورەتی (النساء)، خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـًٔاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾﴾.

خوا (سبحانه وتعالى) لەم ئایەتەدا دە(١٠) جۆرە فەرمانمان پێ دەکا، دەفەرموێ:

١) ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـًٔا﴾ بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی.

٢) ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًا﴾، لەگەڵ بـاب و دایکیشـتاندا، چـاکەکردن بکەنـە پیشە.

٣) ﴿وَبِذِي ٱلْقُرْبَىٰ﴾، هەروەها لەگەڵ خزمانیشدا چاکەکاریی بکەنە پیشە.

٤) ﴿وَٱلْيَتَـٰمَىٰ﴾، لەگەڵ هەتیوانیشدا، واتە منداڵی نەباڵغی بێ باب، بە هەمان شێوە، چاکەکاربن.

٥) ﴿وَٱلْمَسَـٰكِينِ﴾، هەروەها لەگەڵ نەدارانیشدا، کەسێك کە هێندەی نیە پێی بژی، چاکەکاربن.

٦) ﴿وَٱلْجَارِ ذِي ٱلْقُرْبَىٰ﴾، دیسان لەگەڵ دراوسێیەك دا کە خزمایەتیی هەیە.

٧) ﴿وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ﴾، هەروەها لەگەڵ دراوسێیەکی لە تەنیشتت، یاخود: ﴿وَٱلْجَارِ ذِي ٱلْقُرْبَىٰ﴾، واتە: دراوسێیەکی نزیك، ﴿وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ﴾ واتە: دراوسێیەکی دوور.

٨) ﴿وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ﴾، دیسان هاوەڵێك کە لە تەنیشتتە، لەگەڵی چاکەکار بە.

٩) ﴿وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ ڕێبواریش بەهەمان شێوە.

١٠) ﴿وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ﴾، هەروەها ئەوانەی کە لەبەر دەستتانن، وەك کۆیلەو کەنیزەكو، یاخود خزمەتکارو هاوکارانتان.

لەگەڵ هەموو ئەوانەدا چاکەکار بن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾، بەدڵنیایی خوا هەرکەسێکی خۆش ناوێ کە بەفیزو کەشخە بێ، شانازیی بەخۆکەر بێ.

﴿مختال﴾ ئەوەیە کە لە خەیاڵی خۆیدا خۆی پێ زل بێ، ﴿فخور﴾ ئەوەیە شانازیی بەسەر خەڵکەوە بکا، (إختیال) زیاتر حاڵەتێکی دەروونییەو، (فخر) حاڵەتێکی ڕواڵەتییو بیندراوە.

پێغەمبەری خواش (صلى الله علیه وسلم) لەبارەی چاکەکردنەوە لەگەڵ دراوسێ و، چاکیی لەگەڵ دراوسێ دا، ئەم فەرمایشتە دەفەرموێ: {مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ} [١] واتە: جبریل ئەوەندە ئامۆژگاریی کردم لەبارەی دراوسێوە، تاکو گومانم وابرد دەیکاتە میراتگر، {دراوسێ میراتی دراوسێ بگرێ، گوتم: ڕەنگە سەرەنجام بەوە بگا}.

دیارە جبریل (علیه الصلاة والسلام) هیچ شتێکی لەخۆوە بە پێغەمبەر نەگوتوە، لەخواوە پەیامی هێناوە، جار لەدوای جار، ئنجا پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) گومانی بۆ دروست بووە، کە ڕەنگە ئەو هەموو ئامۆژگاریی کردنەی جبریل بۆی، ئەو هەموو پێ ڕاگەیاندنەی جبریل بۆی، لەبارەی دراوسێوە، سەربکێشێ بۆ ئەوەی میراتی دراوسێش بداتە دراوسێ.



١) أخرجه أحمد: ٥٥٧٧، والبخاري: ٥٦٦٩، ومسلم: ٢٦٢٥.

## بڕگەی سێیەم: گوناهی ئازاردانی دراوسێ:

گەیاندنی پەیوەندیی دراوسێیەتی و، چاکە لەگەڵ دراوسێ، چەند گرنگ و گەورەیە، بەپێچەوانەوە: خراپە لەگەڵ دراوسێ و ئازاردانی، هێندە گوناهێکی گەورەیەو، هێندە شتێکی بە زەرەرو زیانبەخشە، وەك لەم فەرمایشتەوە دیارە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {واللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، واللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، واللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، قِيلَ: منْ يارسولَ اللَّهِ؟ قال: مَنْ لاَ يأْمنُ جارهُ بوَائِقهُ} [1] . واتە: بەخوا بڕوا ناهێنێ، بەخوا بڕوا ناهێنێ، بەخوا بڕوا ناهێنێ، گوترا: کێ ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)؟ فەرمووی: کەسێك کە دراوسێیەکەی لە زیانو زەرەری دڵنیا نیە. (بوائق) یانی: شەڕو خراپە.

هەر کەسێك دراوسێیەکانی لێی دڵنیا نەبن، لێی ئەمین نەبن، کە لێی تووشی زەرەر نابن، بە بڕوادار لەقەڵەم نادرێ، ئەوەش شتێکی زۆر گەورەیە.

لە فەرمایشتێکی دیکەدا هەر لەبارەی ئەوەوە، کە حەقی دراوسێ چەند گرنگ و گەورەیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَا ءامَنَ بي مَنْ بَاتَ شَبْعَانَ وَجَارهُ جائِعٌ إلى جَنْبِهِ وهُوَ يَعْلَمُ} [2] واتە: ئەو کەسە بڕوای بەمن نەهێناوە، کە بەتێریی شەو دەکاتەوەو، دراوسێیەکەشی برسیەتی لە تەنیشتیو پێشی دەزانێ.

---

١) أخرجه أحمد: ٢٧٢٠٦، والبخاري: ٥٦٧٠.

٢) أخرجه الطبراني: ٧٥١، قال الألباني: صحيح لغيره، انظر (صحيح الترغيب والترهيب): ٢٥٦١.

ئەگەر پێی نەزانێ گوناهبار نیە، هەڵبەتە بە کەمتەرخەم لەقەڵەم دەدرێ، کە بۆچی بە برسیەتیی دراوسێیەکەی نەزانیوە؟ بەڵام هەرەشە گەورەکە نایگرێتەوە، بەڵام بزانێ دراوسێیەکەی برسیی و هەژارو نەدارە، ئەویش تێی ڕابمێنێ و بۆخۆشی تێرو پڕ بێ! پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ئەو کەسە بڕوای بەمن نەهێناوە.

## بڕگەی چوارەم: ڕیزبەندیی و پلەی دراوسێیەکان لە ماف پێدان دا:

لەوبارەوە کە ئایا چ دراوسێیەك حەقی زیاترە لە چ دراوسێیەك؟ ئەم فەرمایشتە دێنین:

{عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي جَارَيْنِ فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَابًا}.[1]

دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! من دوو دراوسێم هەن، ئەگەر دیارییەکم هەبوو، {خواردنێك، شتێك کە دەیکەمە دیاریی} ، بیدەم بە کامیان؟ فەرمووی: کامیان دەرگاکەی لێتەوە نزیکترە، دیارییەکە بدە بەو، {یانی: ئەو مافی زیاتر لەسەرتە، چونکە پتر لێتەوە نزیکە} .

دەبێ ئەمە وەك پێوەرێك دابنێین، دراوسێ هەتا لەڕووی جوگرافییەوە نزیکتر بێ، دیارە مافیشی زیاترەو، هەتا دوورتر بێ مافەکەی دوورتر دەکەوێتەوە.

---

١) رواه البخاري: ٢٢٥٩.

دەشتوانین بڵێین: دراوسێ یەکان لەڕووی پلەبەندییەوە، سێ جۆرن:

١) دراوسێیەك کە تەنیا مافێکی هەیە:

ئەو دراوسێیەش بریتیە لە دراوسێیەکی نامسوڵمان، مسوڵمان نیە بەڵام دراوسێتە، ئەوە مافی دراوسێیەتی لەسەرتە، ئەوە یەك مافی هەیە، مادام مرۆڤەو، دراوسێتە، دەبێ حەقی دراوسێیەتی لەگەڵ جێ بەجێ بکەی، نابێ هیچ کەس لە مسوڵمان ڕەوشت بەرزتر بێ، بەئەدەبتر بێ، چاکەکارتربێ، لەگەڵ مسوڵمانو نامسوڵماندا.

٢) دراوسێیەك کە دوو مافی هەن:

ئەویش بریتیە لە دراوسێیەکی مسوڵمان، کە مسوڵمانیشەو، دراوسێشتە، دوو حەقی لەسەرتن، حەقێکی دینی و، حەقێکی دراوسێیەتیی.

٣) دراوسێیەك کە سێ مافی هەن:

ئەو دراوسێیەش کە سێ مافی لەسەرتن، ئەوەیە کە دراوسێیەکی مسوڵمانی خزمە، ئەوە هەم حەقی دراوسێیەتی هەیە، هەم حەقی مسوڵمانەتیی هەیە، هەم حەقی خزمایەتییشی هەیە.

بەڕێزان!

بێگومان ئێمە لەم ژیانەدا دنیاییەدا، بە ڕەوشتو ئەدەبی بەرزو جوانەوە نەبێ، ناتوانین پێکەوە مامەڵەیەکی تەندروست بکەین و، ناتوانین کۆمەڵگایەکی تەندروست بین، ئیسلامیش زۆر گرنگیی داوە بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، وەك پەیوەندیی ژنو مێرد لەگەڵ یەکدی، پەیوەندیی بابو دایك لەگەڵ منداڵیان و، منداڵ لەگەڵ بابو دایکیان، ئنجا خزم لەگەڵ خزم، ئنجا دراوسێ لەگەڵ دراوسێ، ئنجا ئەگەر مسوڵمانان بەو ئەدەبو ڕەوشتە بەرزو جوانانە

پێکەوە مامەڵە بکەن، ئەگەر ژن‌و مێرد پێکەوە، پاشان باب‌و دایك لەگەڵ منداڵەکان و، منداڵ لەگەڵ باب‌و دایکیان، دوایی خزم لەگەڵ خزمی، ئنجا دراوسێ لەگەڵ دراوسێ، هەروەها توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگا، ئەگەر هەموولایەك پێکەوە، بەو ڕەوشت‌و ئەدەبە بەرزانەوە پێکەوە مامەڵە بکەن، زۆر لە گرفت‌و کێشەکان، زۆر بە سێنایی چارەسەر دەکرێن، بۆ نموونە: کاتێك مرۆڤێك، یاخود ماڵێك، یان ئافرەتێك، یان پیاوێك، مەسەلەیەکی لێ دەبێتە گرێ کوێرە، ئەگەر خزمایەتییەکە پتەوبێ، خزمان بەدەمیەوە دەچن، یان دراوسێیەکان بەدەمیەوە دەچن، بۆیە ئەوە شتێکی پەسند و چاکە، کە دەبینین: ئێستا لەنێو مسوڵمانانیدا، هەندێك لەو ڕەوشت‌و ئەدەبە بەرز‌و جوانانە، تا ڕاددەیەك پارێزراون، بۆ نموونە: کەسێك لە گەڕەکێك دەمرێ، خەڵکی گەڕەکەکە هەموویان خۆیان بە خاوەن تازیە دەزانن، یان خزمەکان هەموویان لێك کۆ دەبنەوە، ئەوە شتێکی زۆر پەسندە، بەمەرجێك بۆ ناحەق نەبێ، بۆ زوڵمکردن نەبێ.

پەیوەندیی خزمایەتیی، پەیوەندیی دراوسێیەتی، پەیوەندیی ڕەفیقایەتیی‌و برادەرایەتیی لەگەڵ یەکدیدا، بۆ مەبەستی شەرعیی و، بەرژەوەندیی شەرعیی، ئەو بەدەم یەکەوە چوون‌و دەستبار بۆیەکدی گرتنە، شتێکی زۆر گەورە‌و پەسندە.

چونکە خواپەرستیی‌و دینداریی تەنیا ئەو نوێژە نیە کە لە مزگەوت دەیکەین، تەنیا ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان نیە، تەنیا حەج‌و عەمرە‌و، زەکات‌و، باقی پەرستشەکان نیە، بەڵکو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش، هەر لە بازنەی فراوانی خواپەرستیی دان، چونکە: عیبادەت یانی ملکەچیی بۆخوا‌و، بەڕێوەچوون بەپێی شەریعەتی خوا، ئنجا ئەو شەریعەتی خوایە کە بۆی داناوین

لە مزگەوتدا چی بكەین! بۆشی داناوین كە لەگەڵ خزمانیش دا چی بكەین، لەگەڵ دراوسێشدا چی بكەین، لەگەڵ باب و دایكیش، لەگەڵ منداڵیش، لەگەڵ دۆست و لەگەڵ دوژمن و، لەگەڵ هەموو لایەكدا چۆن مامەڵە بكەین؟!، بێگومان مامەڵەكردن بە ڕەوشتە بەرز و جوانەكان لەگەڵ یەكدیدا، هەموو سەرزەوی بۆ ئێمە دەكاتە میحراب و، هەموو كۆمەڵگامان بۆ دەكاتە پەرستگاو، هەموو كردەوەو ئاكارەكانمان دەكاتە پەرستشێك كە پاداشتیان لەسەر وەربگرینەوە. بەڵكو وەك دواتر لە ئاڵقەكانی دواییدا باسی دەكەین، جاری وا هەیە ڕەوشت و ئەدەبێكی كۆمەڵایەتیی، چاكەكردنێك، قسەكردنێكی خۆش، ڕوویەكی خۆش، بەدەمەوەچوونی كەسێك، كە نەخۆشە، یان لێقەوماوەو، گرفتارە، بەدەمەوەچوونی، لە عیبادەتی شەخسیی خێرترە.

كەواتە خواپەرستیی و طاعەت لە ئیسلامدا، وەك چۆن پەیوەندیی بەنێوان مرۆڤەكان و خواوە هەیە، پەیوەندیی بەنێوان مرۆڤەكان خۆشیانەوە هەیەو، ئەو ڕەوشت و ئەدەبە بەرز و جوانانە، ئەو شەفەقەت و بەزەیی و چاكەكارییە لەگەڵ یەكدیدا، ئەوەش هەر عیبادەت و طاعەتێكە، پاداشتی لەسەر وەردەگرینەوەو، جاری وایە ڕەوشتێكی بەرز و كارێكی خێر لە جۆرە پەرستشێكی خۆبەخش (تطوع)، بگرە فەرزیش، پاداشتی زیاترە.

ئاڵقەی هەشتەم:

# ئەدەب لەگەڵ براو خوشکانی مسوڵمان و هاوەڵانـدا

بەڕێزان!

لەم ئاڵقەیەدا باسی ئەدەب لەگەڵ براو خوشكانی مسوڵمانو هاوەڵاندا، {واتە: دۆستو برادەرو ڕەفیق، دەكەین} . لە چوار(٤) بڕگەدا بە كورتییو گوشراویی، ئەوە باس دەكەین:

## بڕگەی یەکەم: پێناسەی گرنگیی ئەدەبو ڕەوشتی جوان لەگەڵ براو خوشکانی مسوڵمان و، لەگەڵ دۆستو ڕەفیقیش دا:

لەو بارەوە ئایەت و فەرموودە زۆرن و، وەك نموونە هەندێکیان باس دەکەین:

١) خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الحجرات) ئایەتی ژمارە (١٠)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾، واتە: بەدڵنیایی تەنیا بڕواداران بران.

واتە برایەتییەکی ڕاستەقینە کە هەبێ، تەنیا لەنێوان ئەهلی ئیمان دایە، ئەوە بە نسبەت پیاوەکانیانەوە، بە نسبەت ئافرەتانیشەوە: ئافرەتانی مسوڵمان خوشکایەتیی ڕاستەقینەیان لە بەیندا هەیە، هەروەها پیاوانو ئافرەتانیش خوشكو برایەتیی ڕاستەقینەیان لەنێواندا هەیە، بەهۆی ئیمانەکەیانەوە.

خوشكو برایانی بەڕێزم! لە ڕاستیدا ئیمان وەك ئەو دەزووە وایە، کە دەنکەکانی تەسبیحێك بە یەکەوە دەبەستێتەوە، ئەو دەزووە بەنێو هەموویاندا دەڕواو، هەموویان پێکەوە ڕیز دەکا، ئنجا ئیمانیش وەك چۆن دەزوو، دەنکە تەسبیحەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئەویش دەزوویەکی مەعنەویی‌و ڕووحییە، ئەهلی ئیمان پێکەوە گرێ دەداو جۆش دەدا.

٢) وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ﴾الأنفال: ٦٣.

خوا (سبحانه وتعالى) پێغەمبەری خاتەم (محمد (صلى الله عليه وسلم)) دەدوێنێ و،

دەفەرمویّ: خوا دڵەكانیانی بەیەكەوە جۆشداون‌و چەسپاندوون، كە ئەگەر هەرچی سامان لەسەر زەوی هەیە خەرجت كردبایە، نەتدەتوانی {بەو شێوەیە كە خوا بەهۆی ئیمانەوە دڵیانی بەیەكەوە گرێ داوە}، ئاوا دڵیان بەیەكەوە پەیوەست بكەی، بەڵام خوا بەهۆی ئیمانەوە دڵەكانیانی پێكەوە پەیوەست كردوون.

٣) له سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٧١)دا، خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾، واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، دۆست‌و نزیك‌و خۆشەویست‌و سەرخەرو هاوكاری یەكدین.

چونكە وشەی (أَوْلِيَآءُ) كۆی (ولي)یە، (ولي) كە لە ئەسڵدا لە (وَلْـي)ەوە هاتوە، (وَلْي) یانی (قُرْب)، ئنجا (وليّ) بەمانای: خۆشەویست و دۆست و هاوكارو پشتیوان و نزیك و مشورخۆر دێ, هەموو ئەو مانایانە دەگرێتە خۆی، ئنجا پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار لەگەڵ یەكدا بەوشێوەیەن.

٤) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێكدا كە لە (صحيح مسلم)دا هاتوە، دەفەرمویّ: {لاَ تحْقِرَنَّ مِنَ المعرُوفِ شَيْئاً، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بوجْهٍ طلْقٍ} [1].

واتە: هیچ شتێك لە چاكە بەكەم مەگرە، ئەگەر ئەوەش بێ كە بەڕوویەكی خۆشەوە بگەیە برای خۆت.

دیارە كۆڕەكە كۆڕی پیاوان بووە، بۆیە دەفەرمویّ: برایەكەت، ئەگەرنا بەڕوویەكی خۆش بگەیە خوشكی مسوڵمانیشت ئەویش بەهەمان شێوە، هەمان حوكمی هەیە، ئەهلی ئیمان دەبێ پێكەوە سەرو ڕوو خۆش بن،

---

١) أخرجه أحمد: ٢١٥٥٩، ومسلم: ٢٦٢٦.

بەلّكو لەگەلّ كۆی خەلّك دا دەبیّ سەرو ڕوو خۆش‌و گفت‌و لفت شیرین بن.

٥) هەروەها پیّغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتیّكی دیكەیدا دەفەرمویّ: {مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ؛ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى} [١].

واتە: ویّنەی بڕواداران لە یەكدی خۆشویستن‌و بەزەیی بەیەكدی هاتنەوەو، هاوسۆزییان لەگەلّ یەكدا، وەك جەستەیەك وایە، كە ئەگەر ئەندامیّكی ئازاریّكی هەبوو، هەموو جەستە بەشداریی دەكا، بە شەونوخوونیی‌و بە (تا) لیّهاتن.

ئینسان ددانی دیّشیّ، ئیسڕاحەت لە هەموو جەستەی هەلّدەگیریّ، چاوی بیّشیّ، پەراسووی بیّشیّ، هەر ئەندامیّكی بیّشیّ، جەستە هەمووی لەگەلّیدا هاودەردیی دەردەبڕیّ، بڕوادارانیش دەبیّ پیّكەوە بەو شیّوەیە بن.



١) أخرجه أحمد: ١٨٤٠٤، ومسلم: ٢٥٨٦.

**بڕگەی دووەم: كاریگەریی هاوەڵایەتیی‌و برادەرایەتیی:**

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ؛ فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، وَنَافِخُ الْكِيرِ، إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً}[1].

واتە: وێنەی هاونشینی چاك {دۆست‌و هاوەڵی چاك، چ پیاو، چ ئافرەت} و، هاونشینی خراپ {دۆست‌و ڕەفیقی خراپ}, وەك بابای میسك فرۆش، {هەڵگری میسك} و، بابای كوورەچیی‌و ئاسنگەر وان، بابای عەترفرۆش، {كەسێك كە بۆنی خۆش دەفرۆشێ}، یان لێی دەكڕێ، یان دەتداتێ {دەڵێ: بزانە ئەو بۆنە خۆشە}، یاخود {ئەگەر نەشتداتێ و لێشی نەكڕی} بۆنی خۆشت هەر بۆدێ، بابای كوورەچیی‌و ئاسنگەریش، ئەگەر لێی نزیك ببیەوە بە پڕیشكەكانی یان پۆشاكت دەسووتێنێ، یاخود بۆنی ناخۆشی لێ دێ، {ئاسن دەكوتێ، یان ئاسن دەتوێنێتەوە، بە تەقەوڕەقە جاڕس دەبی، یاخود بۆنی ناخۆشت بۆ دێ}.

بەڕێزان!

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە باشترین شێوە بۆمان وێنا دەكا، كە دۆست‌و ڕەفیقی چاك، چ كاریگەرییەكی چاكی هەیە لەسەر مرۆڤ و، دۆست‌و ڕەفیقی خراپیش، چ كاریگەرییەكی نەرێنیی‌و خراپی هەیە، بەتایبەت بۆ مرۆڤ لە سەرەتای تەمەنیدا، باب‌و دایكەكان دەبێ زۆر وریا بن و، چاودێریی

---

١) أخرجه البخاري: ٥٢١٤، ومسلم: ٢٦٢٨.

منداڵەکانیان بکەن: ئایا لە گەڕەك‌و کۆڵاندا لەگەڵ کێ تێکەڵ دەبن، لە جادەو شەقام لەگەڵ کێ تێکەڵ دەبن؟ بەزۆریی وایە مرۆڤ لەسەرەتای تەمەنیەوە، ئەگەر دۆست‌و ڕەفیقێکی باشی لێ هەڵکەوت، بەرەو باشە دەچێ و، ئەگەر خوانەخواستە تووشی دۆست‌و ڕەفیقێکی خراپیش بوو، بەرەو خراپە پەلکێش دەبێ، باب‌و دایکەکان دەبێ وریا بن، بزانن کوڕو کچەکانیان لەگەڵ کێ دا تێکەڵ دەبن، لەگەڵ کێ دەگەڕێن، لەگەڵ کێ دەبنە هاودەم‌و هاوڕێ؟!

بۆیە لە شیعری عەرەبیدا هاتوە، دەڵێ:

لَا تَسْأَلْ عَنْ الْمَرْءِ وَسَلْ عَنْ قَرِينِهِ فَكُلُّ قَرِينٍ بِالْمُقَارَنِ يَقْتَدِي

واتە: لە مرۆڤ مەپرسە، لە دۆست‌و ڕەفیقەکانی بپرسە {کێن؟} هەر کەسە لەگەڵ هاوشێوەی خۆیدا تێکەڵ دەبێ.

عەرەب دەڵێ: (الطيورُ عَلَى أشكالِها تَقَعُ)، واتە: باڵندەکان لەگەڵ هاوشێوەی خۆیاندا دەبن. قەل لەگەڵ قەل، کۆتر لەگەڵ کۆتر، لەق لەق لەگەڵ لەق لەق.

کەواتە بەهۆی ڕەفیق‌و دۆستەکانەوە، مرۆڤ دەناسرێ: داخۆ چ بابەتێکەو، چ نێوەڕۆکێکی هەیە؟ کەسێك دۆست‌و ئاشنایەکانی – ئنجا ئەگەر کوڕە ئەگەر کچە – باش بوون، دیارە بۆخۆیشی باشە، بەڵام کەسێك هەموو دۆست‌و ڕەفیقەکانی خراپ بن، دیارە بەلای ئەواندا جەزب بووە، ئەوان پەلکێشیان کردوەو، بۆخۆیشی نێوەڕۆکەکەی وەك ئەوان وایە.

## بڕگەی سێیەم: مافەكانی خوشكو برای مسوڵمان، لەسەر یەكدی چین؟

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتێكدا كە لە (صحیح مسلم)دا هاتوه، شەش (٦) لەو مافانەمان وەك نموونە بۆ دێنێتەوە، دەفەرموێ: {حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ: إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَشَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتْبَعْهُ}[1].

واتە: مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان شەشن، -وەك نموونە- :

١) (إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ) هەركات پێی گەیشتی لەڕێگا، سلاوی لێ بكە.

پرسیار لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كرا: كاتێك دوو مسوڵمان دەگەنە یەكدی، كامیان پێشێ سلاو بكا؟ وەك لە فەرمایشتی دیكەدا هاتوە، فەرمووی: (أولاهما بالله)، ئەوەیان كە لەخوا نزیكترە ئەو پێشێ، سلاو دەكا، هەمیشە ئینسان دەبێ، دەستپێشخەری چاكە بێ.

٢) (وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ) هەركات بانگی كردی بەدەمیەوە بچۆ، بانگی كردی، واتە: ئیشێكی پێت بوو، پرسیارێكی هەبوو، كارێكی پێت بوو، بەدەمیەوە بچۆ.

٣) (وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْهُ)، هەركات داوای دڵسۆزیی نواندنی لێ كردی، دڵسۆزیی بۆ بنوێنە، واتە: هەرچی بۆ ئەو چاكە، پێشانی بدە.

---

١) أخرجه أحمد: ٨٨٣٢، والبخاري في الأدب المفرد: ٩٢٥، ومسلم: ٢١٦٢.

٤) (وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَسَمِّتْهُ)، هـەركات پـژمی و، ستایشـی خـوای كرد، تۆش بڵێ: (یرحمك الله) خوا بەزەییت پێدا بێ، سوننەتە ئینسان كـە دەپژمێ، پژمینی دێ، بڵێ: (الحمدلله)، ئەو كەسەش كە گـوێی لێیـەتی، بڵێ: (یرحمك الله)، ئەویش بڵێ: (يَهْدِيكُمُ اللَّهُ، ويُصْلِحُ بَالَكُمْ)

٥) (وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ)، هـەركات نـەخۆش كـەوت، سـەردانی بكـە، لێـی بپرسە، هەواڵ پرسیی بكە.

٦) (وَإِذَا مَاتَ فَاتْبَعْـهُ) كاتێـك مـردیش، شـوێن جەنازەكـەی بكـەوە، بـۆ بەخاكسپاردنی.

كەواتە: لە سڵاو لێ كـردن، تـاكو بەخاكسـپاردن، مسـوڵمان مـافی لەسـەر مسوڵمان هەیە.

## بڕگەی چوارەم: پێگەو پاداشتی چاكەكاریی و دڵسۆزیی نواندن لەگەڵ دۆست و ڕەفیق دا:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە دەفەرموێ: {خَيْرُ الأَصْحَابِ عِنْدَ اللَّهِ خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الْجِيرَانِ عِنْدَ اللَّهِ: خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ} [(١)]، واته: باشترینی ڕەفیق و دۆستان، ئەوەیانە كە بۆ دۆست و ڕەفیقانی باشتر بێ و، باشترین دراوسێیەكان، ئەوەیانە كە بۆ دراوسێ یەكەی باشتر بێ.

هەڵبەتە باشیی لەگەڵ یەكدیدا، ئەوە نیە كە ئینسان بەپێی میزاجو ڕەغبەتی یەكدی بجووڵێتەوەو، بێ دڵیی یەكدی نەكات، لە حەق و ناحەقدا، نەخێر! بەڵكو باشیی مرۆڤ لەگەڵ دۆستو ڕەفیقی دا، ئەوەیە كە لەگەڵیدا ڕاست و ساغ بێ و، چی بۆی چاكە، ئەوەی پێ بڵێ و، ئەوەی بۆ بكات، نەك ئەو چی پێ خۆشە! كوردەواریی خۆمان جوانیان گوتوە: "دۆست ئەو كەسەیە دەتگریەنێ و، دوژمن ئەو كەسەیە دەتهێنێتە پێكەنین"، دۆست ئێستا دەتگریەنێ، بەڵام دوایی پێدەكەنی، كەچی ئەوەی ناحەزتە، ئێستا وا دەكات پێبكەنی، بەڵام دوایی زۆر دەگری.

عەرەبیش جوانیان گوتوە: (صَدِيقَكَ مَنْ صَدَقَكَ، لاَ مَنْ صَدَّقَكَ)، برادەرەكەت ئەو كەسەیە لەگەڵ ڕاستبكات، نەك هەر بڵێ: ڕاست دەكەی! هەر دەستت بۆ لەگەردنی بدات، بە حەق و ناحەق و، تۆش بەهەڵەكانی خۆت نەزانی و، لەسەر هەڵەكانت بەردەوام بی، تاكو سەرت بە فەتارەت دەچێ!

---

١) أخرجه أحمد: ٦٥٦٦، والترمذي: ١٩٤٤: وقال: حسن غريب.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی ئەوەوە کە مرۆڤ دەبێ لەگەڵ برای خۆیدا باش بێ و، ئەگەر ئافرەتە لەگەڵ خوشکی خۆیدا باش بێ، دەفەرموێ:

{لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ} (١)

واتە: یەکێك لەئێوە بڕوادار نابێ، تاکو چی بۆخۆی حەزی لێیەو پێی خۆشە، ئەوەشی بۆ برای خۆی پێ خۆش نەبێ.

بەڵام برای خۆی یانی کێ؟ یاخود خوشکی خۆی، یانی کێ؟ ئایا تەنیا برای مسوڵمان دەگرێتەوە، یاخود بەس خوشکی مسوڵمان دەگرێتەوە؟ با تەماشا بکەین:

(إبن حجر القسطلاني) دەڵێ: (ويحتمل أن يكون قَوْلُهُ (لأخيه) شاملاً للذمي...بان يحب له الإسلام أو الخير مثلاً، ويدُلّ عليه الحديث: وأحبَّ للناس ما تُحِبُّ لنفسك تُكُنْ مُسلماً)(٢).

(إبن حجر القسطلاني) دەڵێ: دەگونجێ مەبەست لە فەرمایشتەکە، کە دەڵێ (أخيه)، بابای (ذمِّي)یش {واتە: خاوەن کتێبانیش} بگرێتەوە، {ئەوانەی کە هاوڵاتیانی نامسوڵمانن لە کۆمەڵگای مسوڵماناندا}.

بۆ وێنە: ئیسلامی بۆ ئاوات بخوازێ، یان خێرو چاکەیەکی بۆ بە ئاوات بخوازێ، ئەو فەرموودەیەش پشتگیریی دەکات، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(وأحبَّ للناس ما تُحِبُّ لنفسك تُكُنْ مُسْلِماً}.(٣)

---

١) البخاري: ١٣، ومسلم: ٤٥.

٢) رواه الترمذي: ٢٣٠٤، وابن ماجة: ٤٢١٧، وحسنه الألباني. (موسوعة فتح الملهم بشرح صحيح مسلم) (شبير أحمد عثماني) ج(١)، ص(٥٩٤).

٣) أخرجه أحمد:٨٠٨١، والترمذي: ٢٣٠٥، وقال: غريب، والبيهقي فی شعب الإيمان: ٩٥٤٣.

واتە: بۆ خەڵك بە ئاوات بخوازەو، حەزت لێ بێ، هەرچی بۆخۆت حەزت لێیە، دەبیە مسوڵمان.

واتە: مسوڵمان ئەو کەسەیە کە چی بۆخۆی پێ خۆشە، بۆ خەڵکیشی پێ خۆش بێ، خەڵك بە گشتی بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە.

هەر لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەش هەیە:

{عَنْ مُعَاذ، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ أَفْضَلِ الْإِيمَان، قَالَ: أَنْ تُحِبَّ لِلَّهِ وَتُبْغِضَ لِلَّه، وَتُعْمِلَ لِسَانَكَ فِي ذِكْرِ اللَّه، قَالَ: وَمَاذَا يَا رَسُولَ اللَّه؟ قَالَ: وَأَنْ تُحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ، وَتَكْرَهَ لَهُمْ مَا تَكْرَهُ لِنَفْسِكَ} (١)

واتە: (موعاذی کوڕی جەبەل (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردك باشترین ئیمان چیە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە لەبەر خوا خەڵکت خۆش بویو، لەبەر خواش ڕقت لە خەڵك بێت. {لەبەر خوا خەڵکی باشت خۆش بوێ و، لەبەر خوا ڕقت لە خەڵکی خراپ بێ، هەروەها: لەبەر خوا سیفەتی چاکت لە خەڵکدا خۆش بوێ و، ڕقت لە سیفەتی خراپ بێ}. هەروەها کە زمانت لە یادی خوادا بەکاربێنی.

(معاذ) گوتی: ئەدی چی دیکەش، ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)؟ فەرمووی: {ئەوەش دیسان لە چاکتر ئیمان هێنانە} کە هەرچی بۆخۆت حەزی لێ دەکەی، بۆ خەڵکیشت حەز لێبێ و، چیش بۆخۆت پێت ناخۆشە، بۆ ئەوانیشت پێ ناخۆش بێ.

کەواتە: برایەتیی و خوشکایەتیی لە ئیسلام داو، ڕەفاقەتو دۆستایەتیی لە ئیسلامدا، پێگەیەکی گرنگی هەیەو، کۆمەڵێك ئەدەبو ڕەوشتی گەورەو گرنگ

---

١) أخرجه احمد: ٢٢١٣٢، ٢٢٤٨٣، والبيهقي في شرح الإيمان: ٥٧٩، وقال شعيب الأرناؤط: صحيح لغيره.

هەن، دەبێ ڕەچاو بكرێن، ئەوجار ئەو برایەتییە، ئەو خوشكایەتییە، یاخود ئەو ڕەفاقـەتو دۆسـتایەتییو برادەرایەتییـە، لـە پێـوەرو تـەرازووی ئیسـلام دا، برایەتیی و خوشكایەتیی، یاخود دۆستایەتیی و ڕەفاقەتێكی چاكو شەرعییە.

خوا لەو كەسانەمان بگێڕێ كە باشترین برا دەبین بـۆ برایـەكانمان و، باشـترین برا دەبین بۆ خوشكەكان، هەروەها ئەوەی كە ئافرەتە: باشترین خوشك دەبـێ بـۆ خوشكو برایەكانی، دیسان باشترین ڕەفیقیش بین بـۆ دۆسـتو ڕەفیقـەكانمان، چ مسولْمان بن، چ نامسولْمان بن، بۆیان دڵسۆز بین، لەگەڵیاندا ڕاستگۆ بینو سەر ڕاست بین.

## ئاڵقەی نۆیەم:

# ئەدەب لەگەڵ میوان و ڕێبوار دا

بەڕێزان!
لەم ئاڵقەیەدا باسی ئەدەب و ڕەوشتەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ میوان و ڕێبواردا دەکەین، کە ڕێبواریش جۆرێکە لە میوان، بەڵام میوان گشتییترە، ڕێبواریش میوانێکی تایبەتە، کە بەڕێدا هاتوەو، پێویستی بە هاوکاریی بووەو لایداوە لای خانەخوێیەکەی. ئنجا ئێمە لە چوار(٤) بڕگەدا باسی ڕەوشت و ئەدەب لەگەڵ میوانو ڕێبوار دا دەکەین:

## بڕگەی یەكەم: گرنگیی ئەدەبو ڕەوشتی بەرزو جوان لەگەڵ میواندا:

خوا (سبحانه وتعالى) لە ئایەتەكانی: (٢٤-٢٧)ی سوورەتی (الذاريات)دا، بۆمان باسی چۆنیەتی هەڵسوكەوتی {إبراهيم} (عليه الصلاة والسلام) دەكات لەگەڵ میوانەكانی دا، كە دیارە فریشتە بوون، بەڵام لەشێوەی مرۆڤ دا خۆیان نواندوەو، دەفەرموێ:

﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُواْ عَلَيْهِ فَقَالُواْ سَلَٰمًا قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾

ڕاستە مانای ئەم چوار ئایەتە موبارەكە بەم شێوەیە:

ئایا باسو خواسی میوانە بەڕێزەكانی ئیبراهیمت پێ نەگەیشتوە، كاتێك كە لێی وەژوور كەوتن، گوتیان: سلاوت لێ بێ، گوتی: سلاوێكی چەسپاوتان لێبێ، ئێوە كۆمەڵێكن نەناسراون {ناتاننناسم}، دوایی بە پەنهانیی چووە لای خێزانی و، گۆلكێكی قەڵەوی هێنا، {لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ ﴾، واتە: گۆلكێك كە سووری كردبووەوە، برژاندبووی}.

﴿ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾، ئنجا لێی نزیكخستنەوە، گوتی: ناخۆن! {نافەرموون!}

ئەم چوار ئایەتە، حەوت (٧) ئەدەبی گرنگی میوانداریییان لێ وەردەگیرێن، کە ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام)ی (خلیل الله)، لەگەڵ ئەو میوانانەی خۆیدا، ئەو ئەدەبانەی ڕەچاو کردوون:

١) ئەوپەڕی ڕێز لێگرتنیان، هەرچەندە نەشیناسیون، ئەگەر ئینسان کەسێ بناسێ، ئازایەتیی نیە، ڕێزی لێبگرێ، بەڵام کەسێك نەناسی و، یەکەمجارت بێ بیبینی، زۆریش ڕێزی لێبگری، ئەوە زۆر گرنگە، ئنجا ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) میوانەکانی نەناسیوەو، نەشیزانیوە کە فریشتەن، دوایی پێیان گوتوە: ئێمە فریشتەین، وایزانیوە چەند پیاوێکن و، لایانداوەتەوە لای.

بەچی دەزانین کە زۆر ڕێزی لێگرتوون؟ بەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ﴾، ئایا هەواڵی میوانە ڕێزلێگیراوەکانی ئیبراهیمت پێ نەگەیشتوە! واتە زۆر ڕێزی لێ گرتوون.

٢) ئەوان سلاوی لێ دەکەن، دەڵێن (سَلَٰمٗا) یانی: (نُسَلِّمُ عليك سلاماً)، بەڵام ئەو وەلامیان دەداتەوە: (سلامٌ)، لەڕووی زمانی عەرەبییەوە (سلامٌ) کە ڕستەیەکی ناویی (جملة إسمية)یە، مانایەکەی لە (سلاماً)، کە ڕستەیەکی کرداریی (جملة فعلية)یە، بەهێزترە، ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام)یش ئەو ئەدەبە بەرزەی بەکارهێناوە، کە خوا لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٨٦)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآ﴾، ئەگەر سلاوتان لێکرا، بە سلاوکردنێك،

بەباشتر لەخۆی، یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە، ئنجا ئەو بەباشتر لەهی خۆیان وەڵامی داونەوە.

٣) ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) بە پەنهانیی چووە بۆ لای خێزانی خواردن ساز بكات بۆ میوانەكانی، چونكە دەفەرموێ: ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ﴾، (راغ) لە (روغان)ەوە هاتوە، (روغان الثعلب): ڕێوی كە شێرێك، پڵنگێك شوێنی دەكەوێ، قۆرتو پێچ دەكا، ئنجا ئیبراهیمیش (علیه الصلاة والسلام) بە پەنهانیی چووە، نەك لەبەرچاوی ئەوان بچێتو، بڵێن: نابێت بچی خواردنمان بۆ ساز بكەیو، خۆت ئەزیەت بدەی، بەڵكو بە پەنهانیی چووە، بۆ ئەوەی میوانەكان ئیحراج نەبن.

٤ و ٥) پاشان خواردنێكی باشو زۆریشی بۆ هێناون، خواردنەكە هەم باش بووە، هەم زۆریش بووە، ﴿فَجَآءَ بِعِجۡلٖ سَمِينٖ﴾، گوڵكێكی قەڵەوی بۆ هێنان، چونكە سێ-چوار كەس، یان چوار-پێنج ێك بوون، گوڵكێك! كە مریشكێكیان بەس بوو، یان كەڵەشێرێكیان بەس بوو، بەڵام گوڵكێكی بۆ ساز كردوون، كە بێگومان زیادبووە لە پێویستیی خۆیان، وا باشە میوان كە خواردنی بۆ دادەنێی، زیاد لەپێویستی خۆی بۆی دابنێی، نەك ئەوەندە بێ كە بەشی بكات یان بەشی نەكات! ئنجا بەباشترین شێوەش بۆی سازكردوون، وەك لە سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ۝٦٩﴾هود: ٦٩، گوڵكێكی برژێنراوی هێنا، یانی: بەباشترین شێوە سازی كردبوو.

٦) ئەدەبێکی دیکەی میوانداریی ئەوەیە، کە خواردن بەریە پێش میوان، ﴿ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيۡهِمۡ ﴾، خواردنەکەی لێوەنزیك خستن. ئەوە باشترە، وەك لەوەی میوان بەری بۆ سەر خواردنەکە، هەڵبەتە ئەگەر شوێنەکەی گونجاو بێ.

٧) خولقکردنێکی نەجیبانە، ﴿أَلَا تَأۡكُلُونَ ﴾ ناخۆن! نافەرموون! زۆر بە نەجابەتو بەلوتفەوە خولقی خواردنەکەی کردوون.

## برگەی دووەم: ڕوونکردنەوەی ڕێزلێگرتنی میوان:

هەڵبەتە لە دووتوێی ئەو چوار (٤) ئایەتانەدا کە باسمان کردن، برگە سەرەکییەکانی ڕێزلێگرتنی میوان، دیارن، بەلاّم هەندێ وردەکاریی دیکەش هەن، کەمن لە یازدە (١١) خاڵدا هێناومن:

١) لە ڕێزلێگرتنی میوان ئەوەیە کە پێشوازیی گەرمی لێ بکرێ، کە هەم ئیبراهیم (علیە الصلاة والسلام) وابووە، هەم پێغەمبەری خاتەم (صلی اللە علیە وسلم)یش، کە لە سیرەو ژیانی دا دەیخوێنینەوە، پێشوازیی گەرمی لە میوانی خۆی کردوە و، بە پیریەوە چووە.

٢) سەرو ڕوو خۆش بوون لەگەڵ میوان، مرۆڤ دەبێ لەگەڵ هەموو کەسدا سەرو ڕووی خۆش بێ، بەتایبەتی کەسێك کە میوانتەو دێ بۆ ماڵت، دەبێ سەرو ڕووت لەگەڵی خۆش بێ و، گفتو لفتت شیرین بێ.

٣) تۆقە لەگەڵ کردنی، یاخود لە باوەش گرتنی.

٤) دانیشتاندنی لەلای سەرەوە، دەبێ میوانت کە دێ، لەلای سەرەوە دایبنێ ی، یاخود لە باشترین شوێن دا دایبنێی.

٥) پەلەکردن لە ئاو و خواردن پێدانی، ئەگەر ئاوە، ئەگەر چایە، بەپێی کاتو شوێنەکە، دیارە بەپێی عورفو عادەتەکە، ئەو شتانە دەگۆڕێن، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەرچی هەیە زوو بۆی بهێندرێ، نەك چارەکێك- بیست خولەك چاوەڕێ بێ، داخۆ ئاوێکی بۆ دێ یان بۆی نایەت!، یاخود چایەکی دەدرێتێ یان نایدرێتێ! دەبێ پەلە بکرێ لە هێنانی ئەو شتەدا کە لەو کاتەدا گونجاوە پێیبدرێ.

٦) چاوتێنەبڕینی لەکاتی خواردن خواردنی دا، نابێ خانەخوێ چاو لە میوان ببڕێ، داخۆ چەند دەخواو، چی دەخوا! مەگەر تەماشا بکات نەوەك کەمو کورییەك پێویستییەك هەبێ، ئەگەرنا وا باشە چاوی تێنەبڕێ، بۆ ئەوەی ئەو میوانە بە ئاسوودەیی خواردنی خۆی بخوات.

٧) سەغڵەت نەکردنی بەهۆی پرسیاری نەگونجاو و بێ جێ وە, هەیە میوانێکی دێ، یەکسەر لە پرسیارانی دەگرێ! ئەو میوانە هەر پەشێمان دەبێتەوە لە چوونی، یاخود لەگەڵی دەست دەکا بە هەندێ موجادەلەو موناقەشە، من بۆخۆم جاری وابووە، چووینە شوێنێك، خانەخوێیەکە هیچ ئەدەبو نەجابەتی میوانداریی و خانەخوێیەتیی بەخەرج نەداوە، دەستی کردوە بە جیدالو شەڕە قسە، کە ئەوە کەم سەلیقەیی دەگەیەنێ، مرۆڤ نابێ میوانی خۆی ئیحراج بکا، نابێ سەغڵەتی بکا، ئنجا سەیر ئەوەیە هەندێك لەوانە پێشیان وایە بەدوای قورئانو سوننەتو بەدوای پێشینی چاك دەکەون، کەچی تەماشا دەکەی زەوقو سەلیقەیان نیە، لە مامەڵە لەگەڵ خەڵك دا، لەگەڵ میوانو، لەگەڵ دۆستو ڕەفیقو خزمو...هتد. دا.

٨) دەور چۆڵ نەکردنی و، بەجێنەهێشتنی بە تەنیا، ئینسان نابێ میوانی خۆی بەجێبێڵی، هەتا زانایان دەڵێن: یەکێك لە عوزرەکانی چواندنی

جەماعەت، بەڵکو هەندێکیان دەڵێن: چواندنی نوێژی جومعەش، ئەوەیە کە میوانەکەت وابێ، پێویست بکات لەلای بی، ئەوکاتە بۆت هەیە نوێژی جومعەش نەکەی، لەبەر ئەوەی میوانتە، ئەگەر لەو جۆرە بێ کە ئەگەر بێتو دەوری بەجێ بهێڵی، پێی نیگەران ببێ.

٩) موجادەلە لەگەڵ نەکردنیو هەست پاراستنی.

١٠) لەگەڵی چوونەدەرو بەڕێکردنی، لەکاتێکدا کە بەڕێی دەکەی، لەگەڵی بچیەدەر، بە گەرمیی بەڕێی بکەی.

١١) ئیش بە میوان نەکردن، ئینسان نابێ ئیش بە میوان بکا، هەڵبەتە دۆستو ڕەفیقو خزمو نزیك، ئەوە جیایە، ئەگەرنا کەسێك بە میوان دابنرێ، نابێ تەکلیفی ئیشو کاری لێ بکرێ.

**بڕگەی سێیەم: ڕێبوار، کە لە قورئاندا وشەی (إبن سبيل)ی بۆ بەکارهاتوە، {کوڕی ڕێگا}، یانی: کەسێك کە زۆر بەڕێگادا دەڕوا:**

لە زۆر لە ئایەتاندا خوای پەروەردگار لەڕیزی ئەوانەدا کە دەبێ چاکەیان لەگەڵدا بکرێ و، هاوکاریی بکرێن، باسی ڕێبوار(إبن سبيل)ی کردوە، کە مەرجیش نیە، هەژارو نەدار بێ و، مەرجیش نیە لێقەوماو و بێ دەرەتان بێ، بەڵام مادام ڕێبوارەو پەکی کەوتوە، نەك هەر هاوکاریی پێ ڕەوایە، بگرە تەنانەت دروستە لەماڵی زەکاتیشی پێ بدرێ، بایی ئەوەندە پێ بگاتەوە مەنزڵو شوێنی خۆی، چ جای میوانداریی و هاوکاریی و، خزمەت بکرێ!

لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە دێنین:

{عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: مَا تَرَكَ رسولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عِنْدَ مَوْتِهِ دِينَارًا وَلا دِرْهَمًا، وَلا عَبْدًا وَلا أَمَةً، وَلا شَيْئًا، إِلَّا بَغْلَتَهُ الْبَيْضَاءَ الَّتِي كَانَ يَرْكَبُهَا، وَسِلاحَهُ، وَأَرْضًا جَعَلَهَا لابْنِ السَّبِيلِ صَدَقَةً} [١]

دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەكاتی مردنیدا، هیچ دینار و درەمی لەدوای خۆی بەجێ نەهێشت، {دینار دراوی ئەوكاتەی ڕۆمەكان بووە، كە لەزێڕ بووەو، درەمیش دراوی زیوی ئەوكاتە بووە كە هی فارسەكان بووە. ئەوكاتە ئەو دوو دراوە زیاتر هەبوون، بەتایبەت لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا} ، هەروەها هیچ كۆیلەیەك و هیچ كەنیزەكێك و هیچ شتێك، كە وەك میرات بەجێی بهێڵێ، جگە لە ئێسترە سپییەكەی، هەروەها چەكەكەیشی، {ئنجا چەكەكەی تیروكەوان بووە، شمشێر بووە، قەڵغان بووە، زرێ بووە، ئەوەی كە لەكاتی جەنگدا بەكارهێناوە} . هەروەها پارچە زەوییەكیش، كە كردبووی بەخێر (صَدَقَةً) بۆ ڕێبواران، {كەسێك كە ڕێبوارەو غەریبەو لێی دەقەومێ، فەرموویەتی: ئەم زەوییە، بەرهەمەكەی وەك پاشەكەوتێك دابنێن بۆ كەسێك، كە ڕێبوارەو سەری لە مسوڵمانن دەوەستێ، ئنجا ئەگەر مسوڵمانە، ئەگەر نامسوڵمانە، كە پێویستیی بە هاوكاریی دەبێ، لە واریدات و بەرهەمی ئەم پارچە زەوییە یارمەتیی بدەن} .

---

١) أخرجه البخاري: ٢٧٣٩.

## بڕگەی چوارەم: ئەدەب و ڕەوشتی بەرز، نیشانەو دروشمی سەرەکیی مسوڵمانانە:

لەکۆتاییی ئەم ئاڵقەیەشدا، براو خوشکانی بەڕێزم! تەئکید لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە ڕەوشتی جوان و ئەدەبی بەرز، دەبێ نیشانەی زەق و دروشمی سەرەکیی ئینسانی مسوڵمان بێ، ئەدەب و ڕەوشتی بەرز لە هەموو بوارەکاندا، کە لێرەدا باسی مامەڵە لەگەڵ میوان و ڕێبوار دەکەین، کاتێك میوانی کەسێك دەبین و دەبێتە (خانەخوێ)مان، خۆت چۆنت پێخۆشە خانەخوێ، مامەڵەت لەگەڵدا بکات، کاتێك کە تۆش دەبی بە خانەخوێی کەسێك، بەوجۆرە مامەڵەی لەگەڵدا بکە، هەروەها لە شوێنێك کە لێت قەوما ڕێبوارێکی، بەڕێیەدا دەچی، غەریب و ئاوارەی، پێت خۆشە ئەو خەڵکە لەگەڵت چۆن بێ؟ تۆش کاتێك کەسێك لێی دەقەومێ، سەری لەتۆ دەوەستێ، ڕێبوارە، هەر چۆنە، تۆش بەهەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵدا بکە، ئەگەر ئینسان ئەوە بکات بە تەرازوو و پێوەر، هەرگیز بەهەڵەدا ناچێ، هەمیشە خۆت بەرە شوێنی بەرامبەرەکەت، پێت خۆشە بەرامبەرەکەت لەگەڵت چۆن بێ، تۆش لەگەڵ ئەودا ئاوا بە.

ئنجا لەڕاستییدا لە بواری میوانداریێتییو خانەخوێ بوونی یەکدی و لەیەکدی میوان بوون دا، هەڵەو کەمو کوڕیی زۆر هەیە، دەبێ ڕاست بکرێتەوە، بۆ وێنە: لە مەسەلەی خواردن دا، بەڵێ مرۆڤ دەبێ لەگەڵ خەڵك دا بەگشتی سەخیی بێ، بەتایبەت لەگەڵ میوان دا، وەك ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام)، بەڵام بێگومان سەخیی بوون جیایە لە زێدەڕۆیی کردن، یان هی وا هەیە ڕەنگە ماڵو خێزانەکەی زۆر موحتاج بێ، بەڵام لێکدا لێکدا میوانان دەباتەوە ماڵێ، کەچی

باش هاوكاریی ماڵو منداڵەكەی خۆی ناكات! كوردەواریی خۆمان لێرە دایە كە دەڵێن: "خێر بەخوێش نەك بە دەروێش"، یان "تاكو ماڵ پێویستیی پێ بێ، لە مزگەوتێ حەرامە"، هەرچەندە ئەوەش زێدەڕۆیی تێدایە، بەڵام گرنگ ئەوەیە: (الأقربون أولَى بالمعروف)، ئەوانەی لێت نزیكترن، لەپێشترن بە چاكە، واتە: لەهەموو كەس لەپێشترن كە تۆ چاكەیان لەگەڵدا بكەی.

ئنجا لە بابەتی میوانداریی دا، وەك چۆن جاری وا هەیە بەباری چرووكیی دا، كەمتەرخەمیی هەیە، كەسێك، كەسێك دەعوەت دەكا، بانگێشتی دەكا، دەبێ هەوڵبدات، وردەكاریی بكا لەوەدا، كە خواردنێكی باشی بداتێ، ئەوە حەقی میوانداریتییە، بەڵام وەك چۆن كورتهێنان هەیە لەوەدا، تێپەڕاندنیش هەیە و، جاری وا هەیە بەهۆی میوانداریتییەوە، خواردنێكی زۆر خەسار دەبێ، كە بە تەئكید هەم كورت هێنان، هەم تێپەڕاندن هەردووكیان خراپن و، ئینسان دەبێ، لە هەموو شتێكدا هەوڵبدات خەتی نێوەڕاست بگرێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ ﴾الفرقان: ٦٧، واتە: {بەندە پەسندەكانی خوا} ئەوانەن كە كاتێك (سامان) خەرج دەكەن، نە زێدەڕۆیی دەكەن، نە ڕژدییش دەكەن، یانی: نە چەنگ قووچاون، نەدەست بڵاون، ﴿وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا﴾، بەڵكو بەشێوەیەكی میانگیر لەو بوارەدا مامەڵە دەكەن، نە تێدەپەڕێنن، نە كورتی دێنن.

ئاڵقەی دەیەم:

## ئەدەب لەگەڵ نەخۆش دا

ئایا ئەو ڕەوشتو ئەدەبە بەرزانەی کە مرۆڤ دەبێ مامەڵەیان پێ لەگەڵ کەسانی نەخۆش و، نەساغ دا، پێ بکات، چینو چۆنن؟ ئەم بابەتەش لە پێنج (٥) بڕگەدا باس دەکەین:

## بڕگەی یەکەم: گرنگیی سەردانو لێپرسینو بەدەمەوەچوونی مرۆڤی نەخۆش، چ پیاو بێ چ ئافرەت:

لەوبارەوە با سەرەتا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێنین:

{عن البَرَاء بن عازب رضي الله عنهما قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) بعيَادة المَريض، واتِّبَاع الجَنَازَة، وتَشْميت العَاطس، وَإِبْرار المُقْسِم، ونَصْرِ المَظْلُوم، وَإجَابَةِ الداعي، وَإفْشاء السَلام} [١].

بەڕائی کوڕی عازیب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ کردین بە:

١) سەردانی نەخۆش، واتە: هەواڵ پرسینی و، دڵدانەوەی.

٢) شوێنکەوتنی تەرمو جەنازە، واتە: بەخاکسپاردنی.

٣) کەسێك کە دەپژمێ، دەڵێ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ)، سوننەتە ئەهلی مەجلیس پێی بڵێن: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) خوا بەزەیی پێتدابێ.

٤) کەسێك سوێند دەخوات، باشە هەوڵبدرێ سوێندەکەی لێ نەکەوێ و، سوێند لەسەرخوراوەکە جێ بەجێ بێ، مادام ئەو شتەی کە سوێندی لەسەر خواردوە، ناشەرعیی نەبێ.

٥) یارمەتییدانی بابای ستەملێکراو و، سەرخستنی و، پشتگرتنی لەسەر مافەکەی.

١) البخاري: ١١٨٣، ومسلم: ٢١٦٢.

٦) وەڵامدانەوەی بانگکەر، کەسێك کە بانگ دەکا، ئنجا چ مەبەست پێی بانگکردنی ئاسایی بێ، چ بانگهێشت بێ بۆ خواردن، مادام لەتواناتدا هەبێ‌و ناشەرعیشی تێدا نەبێ، وا باشە کە وەڵام بدرێتەوە.

٧) بڵاوکردنەوەی سلاو، واتە ئینسان زۆر سلاو لە خەڵك بکات، وەك دواتر دەیگەینێ کەسێك بیناسێ یان نەیناسێ.

## بڕگەی دووەم: چۆنیەتی سەردانی نەخۆش و، چی لەلا بگوترێ و، چی پێ بگوترێ؟

با تەماشای ئەم فەرمایشتانە بکەین:

١- {عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إِذَا اشْتَكَى مِنَّا إِنْسَانٌ مَسَحَهُ بِيَمِينِهِ ثُمَّ قَالَ: «أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا»} (١)

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ئەگەر یەکێکمان ئازارێکی دەبوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بەدەستی ڕاستیی، دەستی پێدا دەهێنا {ئەو شوێنەی ئازاری هەبوو، سەری بووایە، یاخود سینگی، یاخود هەر شوێنێك، کە ئازاری هەبوو، یان بەگشتی دەستی بەجەستەی دا دەهێنا}، ئنجا دەیفەرموو: پەروەردگاری خەڵك! ئازاری لێ لابەرە، دەردی لێ لابەرەو، چاکی بکەوە، تۆ چاککەرەوەی، شیفای بدە، تۆ شیفا هێنی، چارەسەرو شیفا تەنیا هی تۆیە، شیفایەکی بدە، کە هیچ دەردو نەخۆشییەك بەجێ نەهێڵێ.

---

١) أخرجه مسلم ٥٨٣٦.

فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە: {عَن أُم العـلاء (رضى الله عنهـا) قَالَـتْ: عادني رَسول الله وَأنا مريضة فَقَال: أَبْشِري يا أُمَّ العَلاءِ، فإنَّ مَرَضَ المسـلم يُذهِبُ اللهُ بِهِ خَطَايَاهُ، كما تُذْهِبُ النارُ خَبَثَ الذَّهَبِ و الفِضَّةِ)[1]. واته: (أم العلاء) {كه ئافرەتێکی هاوەڵ بوو (خوا لێی ڕازی بێ)} ، دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) سەردانی کردم، من نەخۆش بووم، هـات بـۆ هـەواڵ پرسـینم، فەرمووی: ئەی (أم العلاء)! مـوژدەت لێ بـێ، دڵخۆشـبە، چـونکە نەخۆشـیی مرۆڤی مسوڵمان، خوا (سبحانه وتعالى) بەهۆیـەوە گوناهـەکانی لێ لادەبـات، وەك چۆن ئاگر خڵتەو پیسیی زێڕو زیو لادەبات.

زێڕو زیو ئەگەر خڵتەو، کانزای دیکەیان ڕەگەڵ خرابێ، وەك چۆن کـە خرایـە سەر ئاگر، زێڕەکە دەکەوێتە ئەولاو، ئەو کانزایەکەی دیکەی کە خراوەتە گەڵی، دەکەوێتە ئەولا، نەخۆشیش بەو شـێوەیە خـوای پـەروەردگار مرۆڤـی پـێ پـاك دەکاتەوە، لە گوناهو خەراپەکانی.

٣- هەر لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەش هەیە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليـه وسـلم) دەفەرموێ: {لا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمْ الْمَوْتَ مِنْ ضُرٍّ، فَإِنْ كَانَ لا بُدَّ فَاعلاً فَلْيَقلْ: أللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَـتْ الْحَيَـاةُ خَـيْرًا لِي، وَتَـوَفَّنِي إِذَا كَانَـتْ الْوَفَـاةُ خَـيْرًا لِي}.[2]

واتە: با هیچ کام لە ئێوە، بەهۆی ناڕەحەتیی‌و ئازارێکـەوە کـە تووشـی دێ، مردن بە ئاوات نەخوازێ، داوای مردن نەکا بۆخۆی، ئەگەر هەر ناچار بوو شتێك بڵێ، زۆر بێزار و ناڕەحەت بوو، با هەر ئەوەندە بڵێ: ئـەی خوایـە! هـەتا ژیـان بۆمن چاکە، بمژیەنەو، ئەگەر مردن بۆمن چاکە بمرێنە.

---

١) أخرجه الطبراني: ٣٤٠، وأبو داود: ٣٠٩٢.

٢) أخرجه البخاري: ١١٤٩، ومسلم: ٥٤٦.

دروستە ئەوەندە بڵێ، بەڵام لەوە زیاتر نابێ بڵێ، چونکە ئەوی دیکە دەکەوێتە قالبی ئەوەوە، کە پێشنیار بۆ خوا بکاو، بێزاریی دەربڕێ، لەو ژیانە کە خوای کارزان ئەوی خستۆتە نێو، یان لەو تاقیکردنەوەیە کە خوا بۆی هێناوەتە پێش.

## بڕگەی سێیەم: حوکمی سەردانی نەخۆش:

{(إبن حجر العسقلاني) [1] لە (فتح الباري)دا دەڵێ: (قال الجمهور (عيادة المريض) هي في الأصل مندوبة، وقد يصلُ إلى حد الواجب في حق بعض... كأن يكون هذا البعض مُمَرِّضاً لا يُستَغنى عنه، أو أن يكون مما يتأذى المريض بتأخُّره أو نحو ذلك).

وعن الطبري: تتأكد في حق من تُرجى بَركَته، وتُسَنَّ في حق من يُراعى حالُه مثل الصديق والقريب والجارِ وتباح فيما عدا ذلك}.

بەڕاستیی جوانی هێناوە! بۆیەش زانایان لە مەدحی (فتح الباري)دا، کە کتێبی (إبن حجر العسقلاني)یەو، شەرحە لەسەر (صحيح البخاري)، گوتوویانە: (لا هجرة بعد الفتح)، واتە: پێش ئەوەی مەککە ئازاد بکرێ، خەڵك لە مەککەوە کۆچی دەکرد بۆ مەدینە، بەڵام دوای ئەوەی کە مەککە ئازاد کرا، پێویست ناکات کۆچ بکەن بۆ مەدینە، چونکە وڵات هەمووی بوو بە مەنزڵگای ئیسلام، لەئەسڵدا مەبەست پێی ئەوەیە، بەڵام ئەوان مەبەستیان پێی ئەوەیە،

---

١) ج ١٠ ص٩٨.

کە لەدوای کتێبی: (فتح الباري) پێویست ناکات، ئینسان بگەڕێ بەدوای ڕوونکردنەوەیەکی دیکەدا بۆ (صحیح البخاري)، چونکە بەڕاستیی زۆری خۆ پێوە ماندوو کردوە، خوا پاداشتی بداتەوە.

ئنجا دەڵێ: زۆربەی زانایان گوتوویانە: سەردانی نەخۆش، حوکمەکەی ئەوەیە، کە سەردانی نەخۆش لە ئەسڵدا سوننەتە، {واتە: شتێکی پەسندە، ئەگەر بیکەی پاداشتی هەیەو، ئەگەر نەیکەی گوناهی نیە}، بەڵام جاری واش هەیە، دەگاتە ئەندازەی فەرز بوون، بۆ هەندێك کەس، بۆ وێنە: ئەگەر ئەو کەسە کەسێك بێ پێویست بێ بۆ خزمەت و چارەسەری ئەو نەخۆشەو، هیچ بەدیلێکی نەبێ، یاخود ئەگەر بێت و سەردانکەرەکە دوابکەوێ لەسەردانی نەخۆشەکە، پێی ناڕەحەت بێ و، وێنەی ئەوانە.

(الطبري)ش لەو بارەوە گوتوویەتی: سەردانی نەخۆشو، هەواڵپرسینی نەخۆش، بۆ کەسێك کە ئومێد بکرێ کە بەرەکەتو پێزی هەبێ، زیاتر جەختی لەسەر دەکرێتەوەو پێویستترە بۆوی، هەروەها سوننەتە بۆ کەسێك کە حاڵەکەی ڕەچاو بکرێ و، چاوەڕوانیی لێ بکرێ، وەك دۆستو ڕەفیق، یاخود نزیك و خزم، یان دراوسێ، بەڵام بۆ غەیری ئەوانە لە بازنەی موباحو ڕەوا دایە.

منیش دەڵێم: بێگومان سەردانی نەخۆش لە کەسێکەوە بۆ کەسێك و، لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك، حوکمەکەی دەگۆڕێ. بۆ وێنە: کەسێك کە چاوەڕوانیی زیاتری هەیە، ڕەنگە لەسەر ئەو کەسەی کە سەردانی دەکات واجب بێ، کە ئەگەر نەچێ دڵی لێی بشکێو ناڕەحەت بێ.

هەروەها بۆ کەسێك کە حەقێکی زیاتری بابای سەردانکەری لەسەر هەیە، وەك: بابو دایك کە نەخۆش دەبن، لەسەر منداڵیان فەرزە کە ئاگایان لە بابو دایکیان بێ.

هەروەها خزم بۆ خزم، کە ئەویش بەگوێرەی پلەی خزمایەتییەکەی، حوکمی جیاوازە، دیسان ڕەفیقو برادەر بۆ ڕەفیقو برادەر، بەپێی پلەی نزیکییان لەیەکدی، حوکمی سەردانکردنی یەکدییان دەگۆڕێ، لەکاتی نەخۆشییدا.

## بڕگەی چوارەم: وا باشە ئینسان کە دەچێ بۆ لای نەخۆش، دڵخۆشی بکات و، ورەی وەبەر بنێ:

بۆیەش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دەچوو بۆلای نەخۆشێك، دەیفەرموو: {لا بَأْسَ طَهُورٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ} [1]واتە: هیچ نیە، ئەگەر خوا حەز بکات مایەی پاکبوونەوەیە.

بەڵێ، ورە وەبەرنانو ئومێد خستنە دڵو، هاندان، شتێکی پەسندە بۆ کەسێك کە سەردانی نەخۆش دەکا، بەڵام ئەگەر ئەو نەخۆشە بەرەو کۆتایی و، بەرەو مەرگ بێ، واباشە مرۆڤ کە قسەی بۆ دەکات، دڵخۆشی بکات و، ئومێدەواری بکات بە بەهەشتی خوا، بە ڕەزامەندیی خوا، بەوە کە (إن شاء الله) خوا لێی خۆش دەبێ.

کەواتە: وەك گوتراوە: (لكلِّ مقامٍ مقال)، بۆ هەر حاڵەتێك قسەیەکی پێویست هەیە، نەخۆشێك کە زۆر حاڵی شپرز نیە، واباشە ورەی وەبەر بنرێت، بەڵام نەخۆشێك کە دەزانرێ بەرەو مەرگەو، بۆخۆشی دەزانێ بەرەو کۆتاییە، واباشە دڵی خۆش بکرێو، ئومێدی بخرێتە دڵ، کە تۆ (إن شاء الله) جێگات بەهەشتەو لەمردن مەترسێ و ئومێد وایە، کە تۆ بەدەستی پڕو بە توێشووی چاکەوە، دەچیە خزمەت خواو...هتد.

---

١) أخرجه البخاري: ٣٦١٦.

## بڕگەی پێنجەم: دروستە بابای نەخۆش باسی ئازارو نەخۆشییەكەی خۆی بكات

بەڵێ بابای نەخۆش چ كەدەچێ بۆ لای پزیشكو دكتۆر، چ خەڵك كە دێ بۆ لای، چ ئەگەر ئازارەكەی هێندە زۆر بێ، لە كۆنترۆڵی خۆی بچێتە دەرێ، ئەگەر ناڵە ناڵێك بكات و، قسەیەك بكات و باسی ئازارەكەی خۆی بكا، بۆ ئەوەی دەوروبەرەكەی چاكتر خەمی لێ بخۆن، یان بزانن چۆنی چارەسەر بكەن، نەك بۆخۆی بە ئازاری خۆیەوە بتلێتەوەو كەسیش پێی نەزانێ، بەڵگەشمان لەوبارەوە ئەو فەرمایشتەیە:

١- {عَن ابن مَسْعود رضي الله عنه قَال: دَخَلْتُ علَى النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ وَهو يُوعَكُ، فَمَسِسْتُهُ، فَقُلتُ: إنَّكَ لَتُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا، فَقالَ: أَجَلْ إنِّي أُوعَكُ كما يُوعَكُ رَجُلَانِ مِنكُم} [١].

واتە: عبداللە ی كوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چوومە ژوورێ، چوومە خزمەتی، (تا)ی لێ بوو، {بەدەنی زۆر گەرم داهاتبوو}، گوتم تۆ (تا)یەكەی گەرمت لێیە، فەرمووی: بەڵێ، من تام دێتێ {نەخۆش دەكەوم} بەقەدەر دوو پیاوان لە ئێوە، واتە: من دوو هێندەی ئێوە ئازارم هەیە، كاتێك كە نەخۆش دەبم، بۆچی؟! بۆ ئەوەی پاداشتیشی زیاتر بێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەخۆشییەكەشی لە هی خەڵك قورستر بووە، هەروەك چۆن شەونوێژ لە حەقی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) فەرز بووەو،

---

١) أخرجه البخاري: ٥٦٤٨، ومسلم: ٢٥٧١.

بۆ ئۆممەتەکەی سوننەت بووەو، ئەرکی قورستر بووە، نەخۆشییەکەشی قورستربووە لە هی خەڵك.

٢- هەروەها بەڵگەیەکی دیکە لەوبارەوە کە دروستە ئینسان باسی ئازاری خۆی بکا، ئەوەیە کە لە (صحيح البخاري و صحيح مسلم)دا هاتوە، کە ڕۆژێك دایکمان عائیشە ئازارێکی هەبوو، گوتی: (وا رأساه)، ئای سەرم، واتە: سەرم زۆر دێشێ، ژانە سەرم لێیە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بَلِ أَنَا وَارَأْسَاهُ) [1]، بەڵکو من سەرم زۆر دێشێو، ژانە سەرم لێیە.

بەڵام هەڵبەتە لێرەدا، کە دەڵێین: دروستە ئینسان باسی نەخۆشیی و ئازاری خۆی بکات، یان جاری وا هەیە نرکەو ناڵەیەکی دێو، بەدەستی خۆشی نیە، ئەوە هیچی نابێ بچێتە قاڵبی سکاڵاکردنو بێزاریی و نارەحەتیی دەربڕینەوە، چ جای بچێتە قاڵبی ناشوکریی کردنو تورەیی نارازیی بوون، ئەگەرنا ئەوکاتە: نەخۆشییەکەی هەر هەیەو، خۆشی گوناهبارو عەیبداریش دەکا.

هەر بۆیە هەندێك لە زانایان ئەوەندە دووربینو لەخۆ وریا بون، لە نەخۆشی مەرگیشدا هەتا ئاگایان لە خۆیان بووبێ، ناڵەشیان نەکردوە، چونکە گوتوویانە: فریشتەکان کە کردەوەکان دەنووسن، ناڵە ناڵێش دەنووسن، بۆیە پێمان خۆش نیە لە لیستی کردەوەکانماندا ناڵە ناڵی تێدابێ، بێگومان ئینسان تاکو خۆی کۆنترۆڵ بکات کەمە.

بەڵام جاری واش هەیە پێویست دەکات باسی نەخۆشیی و ئازارەکەی خۆت بکەی، بۆ وێنە: جاری وا هەیە مێوانێکت دێ، یان دەچیە شوێنێك بەمیوانداریی و نازانن تۆ نەخۆشی، ڕەنگە وابزانن لەگەڵ ئەواندا بێ خولق و

---

١) أخرجه البخاري: ٧٢١٧، ومسلم: ٢٣٨٧.

ساردی، بۆیە پێویست دەكا بڵێی: من باری تەندروستییم باش نیە، تاكو ئـەوان نەیبەنەوە سەر ئەوە، كە لەگەڵیاندا سەروڕووت خۆش نیـە، یـاخود لەگەڵیانـدا شادمان نی و بەدیتنیان دڵخۆش نی.

یاخود بۆ پزیشك، كە دەبـێ حـاڵی خـۆت بـاس بكـەی، تـاكو بزانـێ چـۆن چارەسەرت بكات، یاخود وەك ڕوونكردنەوە بۆ كەسێك، كە لێت دەپرسێ: كوێت دێشێ؟ ئەگەر باسی حاڵی خۆت بكەی، بەڵام بەبێ سكاڵاكردنو بەبێ ناشوكریی دەربڕین، ئەوە دروستە، بەڵام ئینسان تاكو خۆی كۆنترۆڵ بكات و لەخۆی وریابێ باشترە.

ئاڵقەی یازدەم:

# ئەدەب لەگەڵ منداڵی گچکەو بەساڵداچووان و ئەوانەی حەوجێی هاوکاریین

بەڕێزان!
لەم ئاڵقەیەدا بابەتێکی دیکەی گرنگ دەتوێژینەوە, کە بریتییە لە: ئەدەبی مامەڵە ئەگەڵ منداڵی گچکە، هەروەها لەگەڵ مرۆڤی بەتەمەندا، چ پیاو، چ ئافرەت، دیسان لەگەڵ کەسانی کەمئەندام، یان پەککەوتە، یان کەسانێك، کە هەرجۆرە پێداویستییەکیان هەبێ، ئایا دەبێ چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ؟
لە دوو بڕگەدا ئەم بابەتە دەخەینە ڕوو:

## بڕگەی یەكەم: منداڵو مرۆڤی بەتەمەن:

١- لەو بارەوە با سەرەتا تەماشای ئایەتی ژمارە (١٢٨) لە سوورەتی (التوبة) بكەین، خوا (سبحانه وتعالى) ئۆممەتی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەدوێنێ، میللەتی ئیسلام و دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾، واتە: بەدڵنیایی پێغەمبەرێكتان لەخۆتان بۆ هاتوە، هەرشتێك ئێوە ناڕەحەت بكات، زۆر لەسەر دڵی قورسەو، زۆریش سوورە {لەسەر سوودپێگەیاندنی ئێوەو، ئازار لێ دوورخستەوەتان} و، بەرامبەر بە بڕواداران زۆر میهرەبانو بەبەزەییە.

ئنجا ئەگەر پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) خوا ئاوای پێناسە دەكا، ئێمەش كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرمەشقمانە، دەبێ هەروابین، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأحزاب)-٢١-دا دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْأَخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: بەدڵنیایی لە پێغەمبەری خوادا باشترین سەرمەشقیی و چاوساغیی بۆ ئێوە هەیە، بۆ هەر كەسێك لە ئێوە، كە بە ئومێدو هیوای (بەزەیی) خواو پاداشتی خواو ڕۆژی دوایی بێ و، زۆریش یادی خوا بكا.

واتە: بۆ هەر کەسێك کە مسوڵمان بێت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) باشترین سەرمەشقیەتی لە هەموو ڕوویەکەوە، لە هەموو بوارێکدا، یەکێك لە بوارەکانیش ئەوەیە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرامبەر بە ئێمە بەنارەحەتییمان نارەحەت بووەو، زۆر سووربووە لەسەر سوودپێگەیاندنمان و، دوورخستنەوەی ئازارو مەینەتیی لێمان، هەروەها زۆریش میهرەبان و بەبەزەیی بووە لەگەڵماندا، ئنجا ئێمەش دەبێ وابین، لەگەڵ غەیری خۆماندا، بەتایبەت لەگەڵ ئەوانەدا، کە زیاتر شایستەی پەرۆشیی و بەزەیی‌و میهرەبانیین، وەك: منداڵ‌و، مرۆڤی بەتەمەن‌و بەساڵداچوو و، کەسانی پەککەوتەو، نەخۆش.

٢- ئنجا با تەماشای ئەم فەرمایشتە بکەین:

{عن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قبَّل النَّبِيُّ (صلی الله علیه وسلم) الْحسنَ بنَ عَلِيٍّ رضي اللَّه عنهما، وَعِنْدهُ الأَقْرعُ بْنُ حَابسٍ، فَقَالَ الأَقْرَعُ: إِنَّ لِي عَشرةً مِنَ الْولَدِ مَا قَبَّلتُ مِنْهُمْ أَحدًا، فَنظَرَ إِلَيْهِ رسولُ اللَّه (صلی الله علیه وسلم) فقَالَ: مَن لا يَرْحَمْ لاَ يُرْحَمْ} [١]

واتە: (أبو هريرة) (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد {کە نەوەیەتی}، لەو کاتەشدا (أقرع بن حابس) {کە سەرۆك عەشیرەتێك بووە}، لە خزمەتی بووە، لەو مەجلیسەی پێغەمبەردا بووە، گوتی: من دە (١٠) منداڵم هەن، تا ئێستا هیچ کامیانم ماچ نەکردوە! پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) تەماشایەکی کرد، {واتە بەسەرسوڕمانەوە تەماشای کرد}و فەرمووی:

---

١) أخرجه أحمد: ١٩٢٨٢، والبخاري: ٥٦٦٧، ومسلم: ٢٣١٩.

هەركەسێك بەزەیی نەبێ بەرامبەر بە غەیری خۆی، بەزەیی لەگەڵ نانوێندرێ، واتە لەلایەن خواوە (سبحانە وتعالی).

وەك لە فەرمایشتی دیكەدا هاتوە: {ارحَموا مَنْ في الأرضِ يَرحَمْكُم مَنْ في السَّمَاءِ} [1]. واتە: ئێوە بەزەییتان هەبێ بەرامبەر بە خەڵكی سەر زەوی، ئەو كەسەی لە ئاسمانە {خوا (سبحانە وتعالی) كە لەسەرووی دروستكراوەكانی خۆیەتی، ئەویش} بەزەیی بەرانبەرتان دەبێ.

٣- هەر لەوبارەوە با تەماشا بكەین، پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) چەند میهرەبانو دڵنەرمو بەبەزەیی بووە لەگەڵ ئافرەتو منداڵو، لەگەڵ ئۆممەتەكەیدا، دەفەرموێ: {إِنِّي لأَقُومُ إِلَى الصَّلاةِ، وَأُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فيها، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلَاتِي كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ} [2]

پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) دەفەرموێ: جاری وایە من بۆ نوێژەكەم هەڵدەستم و دەمەوێ نوێژەكەم درێژ بكەمەوە، {قورئانی زۆری تێدا بخوێنم، ڕكووعو سەجدەكانی درێژتربن} , بەڵام گوێم لە گریانی منداڵێك دەبێ، {ئەو كاتە ئافرەتیش هاتوون بۆ مزگەوت، پێنج فەرزەی جەماعەتیان كردوەو جاری وا هەبووە منداڵیشیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە، منداڵی شیرەخۆرە و گچكە بووەو نەگونجاوە بەجێی بهێڵن}، نوێژەكەم كورت دەكەمەوە، پێم ناخۆشە دایكی بەهۆی گریانی منداڵەكەیەوە، نارەحەت بێ و دڵی بۆی بە ئازار بێ.

---

١) أخرجە الطبراني: ١٠٢٧٧، والحاكم: ٧٦٣١، وقال: صحيح الإسناد

٢) أخرجه البخاري: ٦٧٥.

یانی: نوێژەکەم کورت دەکەمەوە، بۆ ئەوەی منداڵەکە زۆر نەگریێ‌و دایکیشی خەفەتی پێ نەخواو ناڕەحەت نەبێ!

٤- دیسان هەر لەوبارەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيُوَقِّرْ كَبِيرَنَا} [1] واتە: هەر کەسێك بەزەیی بە گچکەمان دا نەیەتەوەو، ڕێزی بەتەمەنمان نەگرێ، لە ئێمە نیە.

هەڵبەتە دەبێ وریابین! کە دەفەرموێ: هەر کەسێك ڕەحم‌و شەفەقەتی نەبێ بەرامبەر بە گچکەو کەمتەمەنەکانمان و، ڕێزو حورمەتی بەتەمەنەکانیشمانی لەلا نەبێ، لە ئێمە نیە، واتە لەو سیفەتەدا لەئێمە نیە، ئەو سیفەتەی وەك سیفەتی مسوڵمانان نیە، مسوڵمان دەبێ بەزەیی بە بچووکدا بێتەوەو، ڕێزی بەتەمەنیش بگرێ.

دەبێ لێمان تێکنەچێ: فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبێ وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مەبەستی بووە، ئاوا لێی تێ بگەین. چونکە ئەگەر ئەم فەرموودەیە هەر بە وشکیی لێی حاڵی بی، دەبێ بڵێی: هەرکەسێ بەزەیی بە گچکەدا نەیەتەوەو، ڕێز لە بەتەمەن نەگرێ، مسوڵمان نیە! نەخێر، لەئێمە نیە، واتە: لەو سیفەتەدا لە ئێمە نیە، ئەو سیفەت‌و ئاکارەی وەك هی ئێمە نیە، چونکە ئێمەی مسوڵمان بەزەییمان بەبچووك دا دێتەوەو، ڕێزی بەتەمەن دەگرین، ئنجا ئەو بەتەمەنە پیاو بێ، یان ئافرەت بێ، دەبێ ڕێزی بگیرێ و حورمەتی بزانرێ.

---

١) أخرجه أحمد: ٢٣٢٩، والترمذي: ١٩٢١، وقال: حسن غريب.

## بڕگەی دووەم: ئەوانەی حەوجێی هاوکارییین، دەبێ چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ؟!

خـــوای پـــەروەردگار لـــە ســـوورەتی (الماعون)دا، ئایەتـــەکانی (١-٧)دا، دەفەرموێ:

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾ ﴾.

بەڕێزان!

ئـــەم ســـوورەتە موبارەکـــە، حـــەوت (٧) ئایەتـــە، بـــەڵام وەك هـــەموو فەرمایشتەکانی دیکەی خوای پەروەردگار، یەك بـار مانـاو مەبەسـتی گـەورەو گرنگ دەگرنە خۆیان.

خوا (تبارك وتعالى) ئاوا دەست پێ دەکا:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە.

﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ﴾، (أَرَءَيْتَ) یانی هەواڵم پێ بدە، یاخود ئایا دەبینی، یان ئایا دەزانی: کێ بڕوای بە (دین) نیە، (دین) لێرەدا بە مانـای سزاو پاداشتە، دەشگونجێ (دین) بە مانای بەرنامەی ژیان بـێ، کـە ئیسـلامە، بەڵام لەم سیاقەدا زیاتر مەبەست پێی سزاو پاداشتە.

دەزانی کێ بڕوای بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت نیـە؟ ﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ

ﭐلۡيَتِيمَ ﴾، ئەوە ئەو کەسەیە کە لە هەتیوەوە دەخوڕێ، لە منداڵی بێ باوەوە دەخوڕێ و پاڵی پێوە دەنێ، لەجیاتی ئەوەی دەستی بەسەردا بێنێ‌و نازی بکێشێ، تێوەی دەخوڕێ‌و، لێی تووڕە دەبێ!

﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴾، هەروەها لەجیاتی ئەوەی خواردن بدات بە نەدار و هەژار، خەڵکیشی بۆ هان نادات، یانی: نە بۆخۆی هاوکاریی دەکات، نە خەڵکیشی بۆ هاندەدا.

دوایی دەفەرموێ: ﴿فَوَيۡلٌ لِّلۡمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴿٥﴾﴾، ئنجا سزای سەخت بۆ ئەو نوێژخوێنانەی، کە لە نوێژەکانیان بێ ئاگان.

ڕەنگە یەکێ بڵێ: ئنجا ئەوە چ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەوەی پێشێ دا هەیە؟! دەڵێین: ئەو پەیوەستییەی هەیە، کە کەسانێك هەن، نوێژکەرن، بەڵام ڕەحم‌و شەفەقەتیان نیە بەرامبەر بە هەتیو، بەرامبەر بە هەژارو نەدار، خواش دەفەرموێ: سزای سەخت بۆ ئەو نوێژکەرانەی لە نوێژەکانیان بێ ئاگان، ئەگەر کەسێك نوێژەکەی بەڕاستیی نوێژ بێ، ڕەحم‌و شەفەقەت‌و بەزەیی لەدڵدا پەیدا دەکات، بەرامبەر بە هەژارو نەدارو، ئەوانەی کە پێویستییان بە هاوکاریی هەیە، بەتایبەتی هەتیو (منداڵی بێ باب)، هەروەها کەسانی هەژارو نەدار.

بۆیە دەفەرموێ: سزای سەخت بۆ ئەو نوێژکەرانەی لە نوێژەکانیان بێ ئاگان، نافەرموێ لە نوێژەکانیاندا بێ ئاگان (في صلاتهم ساهون)، ئەگەر وای فەرمووبایە، کەسمان لێی دەرباز نەدەبووین، چونکە مەگەر چۆن، دەنا هیچ کەس نیە لە نوێژەکەیدا، جارێك داڵغەو خەیاڵی بەملاولادا نەچێ، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴾، لە نوێژەکەیان بێ ئاگان، واتە نوێژ

دەکەن، بەڵام نوێژەکەیان کاریگەریی لەسەریان نیەو، ئەو ڕەوشتو خەسڵەتە بەرزانەیان تێدا پەیدا ناکا، کە پێویستە لە نوێژکەراندا هەبن، لەپێش هەموویانەوە ڕەحمو بەزەیی بەرامبەر بە کەسانی بێ دەرەتانو، کەسانی لێقەوماو، کە پێویستییان بە هاوکاریی هەیە، بەتایبەتی هەتیو و هەژارو نەدار.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ﴾، ئەوانەی کە ڕیابازیی دەکەن، ئەدی بۆچی نوێژ دەکەن؟ نوێژەکەیان زیاتر بۆ سەرنجڕاکێشانی خەڵکە. ﴿ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ﴾، هەروەها هاکاریی لە خەڵك دەگرنەوە، هاوکاریی خەڵك ناکەن.

ئەگەر لە ئێمە بپرسن: کێ بڕوای بە ڕۆژی دوایی نیە؟ دەڵێن: کەسێك کە کافرە، بەڵام خوا دەفەرموێ: ئەو کەسەی بڕوای بە ڕۆژی دوایی نیە، بڕوای بە ڕۆژی سزاو پاداشت نیە، زەقترینو دیارترین سیفەتی ئەوەیە، کە پاڵ بەهەتیوەوە دەنێو، تێوەی دەخوڕێو لێی تووڕە دەبێ، لەجیاتی ئەوەی هاوکاریی بکات و، دەستی بەسەردا بێنێو، بیلاوێنێتەوەو، ئنجا هانی خەڵکیش نادات بۆ یارمەتییدانی هەژارو نەدار.

کەواتە: دەبێ بزانین، کە پێوەری دینداریيو مسوڵمانەتیی، وێڕای نوێژو ڕۆژوو و پەرستشەکانی دیکە، بەهابەرزەکان و ڕەوشتو ئەدەبی بەرزیشە، بەتایبەت پەرۆش و بەزەیی و بەدەم خەڵکەوە چوون، بۆیە زۆرجار لە وتارەکانمدا گوتوومە: مسوڵمانەتیی لە دوو شتدا خولاصە دەبێتەوە: ١) خواپەرستیی، ٢)خەڵك دۆستیی، خواپەرستەو، لەگەڵ خەڵك دا چاکبە، خوای بەخشەریش وا دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡ ﴾ الأنفال: ١، واتە: پارێز لەخوا بکەنو پەیوەندیی نێوانتان چاك بکەن.

هەروەها خوای پــەروەدگار دەفــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨ ﴾ النحل: ١٢٨، واتە: بێگومان خوا لەگەڵ كەسانێك دایــە، كە پارێز دەكەنو چاكەكاریشن، یانی: پارێز دەكەن لەخواو، چاكەكاریشن لەگەڵ خەڵكی خوا.

هــەر لــەوبارەوە لــە ســوورەتی (الحاقــة ٣٣-٣٤)دا، خــوا (سبحانه وتعالى) لــە پێناسەی مرۆڤێكی بێبڕوادا، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ ٣٣ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ٣٤ ﴾.

واتە: ئەو كەسە بڕوای بــەخوای مــەزن نــەبوو و، هــانی خەڵكیشــی نــەدەدا لەسەر خواردندان بە نەدارو هەژار.

وەك چۆن خاوپەرستیی‌و خەڵك دۆستیی، دوو كاڵــەكی بــڕكێكن‌و، دوو ڕووی سكەیەكن، دوو پێكهێنەری دینداریین، بە پێچەوانەشەوە، بێبڕوایی بە خوا مەزن و یارمەتیی نەدانی هەژارو نەداریش، ئەوانیش دیسان دوو لقی درەختــێكن و، دوو كالەكی بــڕكێكن و، دوو ڕووی حەقیقــەتێكن، كــە بریتیــە لــە حەقیقــەتی بێدینیی و دوور لە خوایی.

ئنجا با سەرنجی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بدەین:

{مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِن كُرْبَةً مِنْ كُرَب الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِـنْ كُـرَب يَوْم الْقِيَامَة، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسر، يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْه في الدُّنْيَا وَالآخِـرَة، وَمَـنْ سَتَرَ مُسْلمًا، سَتَرَهُ اللَّهُ في الدُّنْيَا وَالآخرَة، وَاللَّهُ في عَوْن الْعَبْد مَا كَانَ الْعَبْـدُ في عَوْن أَخيه، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا، سَـهَّلَ اللَّهُ لَـهُ بِـهِ طَرِيقًـا إِلَى الْجَنَّة)[1].

١) أخرجه أحمد: ٧٤٢١، ومسلم: ٢٦٩٩، وأبو داود: ٤٩٤٦، والترمذي: ٢٩٤٥، وابن ماجه: ٢٢٥.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: هەر کەسێك خەمێك لە خەمەکانی دنیا لە کەسێك بڕەوێنێ، {نارەحەتیی و گرفتێکی بۆ چارەسەر بکا}، خوا خەمێك لە خەمەکانی ڕۆژی قیامەتی بۆ دەڕەوێنێ {و گرفتێکی بۆ چارەسەر دەکا}، هەروەها هەر کەسێك، کەسێك کە کەوتۆتە سەغڵەتیی و تەنگاوییەکەوە، کاری بۆ ئاسان بکا، خواش لە دنیاو دوارۆژدا کاری بۆ ئاسان دەکا، دیسان هەرکەسێك مسوڵمانێك بپۆشێ، خوا لە دنیاو دوارۆژدا دەیپۆشێ و، خوا هاوکاریی بەندەی خۆی دەکا، تاکو ئەو بەندەیە هاوکاریی برای خۆی بکا، {یان خوشکی خۆی بکا}، هەروەها هەرکەسێك ڕێیەك بگرێتەبەر لەو ڕێیەوە بیەوێ زانست داوا بکا، خوا (سبحانه وتعالى) ئەو ڕێیەی بۆ ئاچووغ و تەخت دەکا، بەرەو بەهەشت.

فەرموودەیەکی دیکە لەوبارەوە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالمِسْكِين، كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ - وأحسَبُه قال: - كَالقَائِمِ لاَ يَفْتُرُ، وَكَالصَّائِمِ لاَ يُفْطِرُ}. [1]

واتە: کەسێك کە کۆشش دەکا، مشوور دەخوات و، هاوکاریی بێوەژن و نەدار دەکا، وەك کەسێکە کە لەڕێی خوادا جەنگ و جیهاد دەکا. {ڕاوییەکە دەڵێ: پێم وایە فەرمووشی}: کەسێك کە هاوکاریی بێوەژن و نەدارو هەژار دەکا، وەك کەسێکە کە شەونوێژ دەکاو نایپچڕێنێتەوەو، هەمیشە ڕۆژووی سوننەت دەگرێ و، ڕۆژووە سوننەتەکان ناپسێنێتەوەو نایانشکێنێ، واتە بەردەوامە لەسەر شەونوێژو ڕۆژووی سوننەت، واتە: خوای کارزان دەیخاتە ئەو پلەیەوە، ئەو پاداشتەی کە دەیدات بە شەونوێژکەری بەردەوام و، ڕۆژووگری بەردەوام، دەیدات بە کەسێکیش کە یارمەتیی بێوەژن و هەتیو و نەدارو هەژار دەدات.

---

١) أخرجه أحمد: ٨٧١٧، والبخاري: ٥٠٣٨، ومسلم: ٢٩٨٢.

ئاڵقەی دوازدەیەم:

# ئەدەب و ڕەوشتی بەرز لەگەڵ خەڵک دا بە گشتی

ئایا لەگەڵ خەڵك دا بە گشتی، پێویستە ڕەوشت و ئەدەبمان چۆن بێ و، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین؟ لەم ئاڵقەیەدا باسی ئەوە دەکەین، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەتێکی قورئانی بەرزو بەپێزی خواو، چەند دەقێکی سوننەتی پێغەمبەری پێشەوادا (صلی الله علیه وسلم):

١) خوا (سبحانه وتعالى) لەسووڕەتی (البقرة)، ئایەتی (٨٣)دا، دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ ، واتە: کام قسەیە باشە، ئەوە لەگەڵ خەڵکدا بکەن.

مرۆڤی مسوڵمان دەبێ لەگەڵ هەموو خەڵك دا، قسەی باش بکا، هەم شێوازی قسەکردنەکەی باش بێ، هەم نێوەڕۆکی قسەکردنەکەش، چونکە جاری وایە: مرۆڤ شێوازی قسەکردنەکەی باشە، بەڵام نێوەڕۆکەکەی خراپە، جاری واش هەیە: نێوەڕۆکەکەی باشە، بەڵام شێوازەکەی خراپە، بەڵام کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾، کام قسەیە باشە، ئەوە لەگەڵ خەڵکدا بکەن، واتە: با قسەکەتان باش و پەسند بێ، هەم لە ڕووی نێوەڕۆکەوە، هەم لە ڕووی فۆڕم و شێوازی دەربڕینەوە.

بۆیە خوا (سبحانه وتعالى) لەبارەی (داود)ەوە (عليه السلام) دەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾﴾ ص: ٢٠.

واتە: هەم حیکمەت و هەم قسەی ڕوونمان بە داود بەخشیبوو.

واتە هەم لەڕووی شێوازەوە قسەکەی ڕوون بوو، ئەوانەی دەیدواندن، گوێبیستی دەبوون، باش لێی تێدەگەیشتن و، هەم نێوەڕۆکی قسەکردنەکەشی، (حیکمەت) یانی: زانیاریی ڕاست و بەکەڵك بوو.

٢) هەر لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (١٩٥)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾ . واتە: هەروەها چاکە بکەن، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن.

وەك چۆن مرۆڤی مسوڵمان، دەبێ قسەی باش بێ لەگەڵ خەڵکدا، لەڕووی

نێوەڕۆك‌و لەڕووی شێوازەوە، بەهەمان شێوە: دەبێ مامەڵەو کردەوەی باشیشی بۆیان و لەگەڵیان هەبێ، ﴿وَأَحۡسِنُوٓاْ﴾، چاکەکار بن، چاکە بکەن، بەدڵنیایی خوا چاکەکارانی خۆش دەوێن.

بۆ هی پێشێ دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ﴾، یانی خەڵك بە گشتی ، بە مسوڵمان‌و نامسوڵمانەوە. بەڵام ئەوەی دووەمیان، خوای زاناو دانا دیاریی نەکردوە لەگەڵ کێ دا چاکە بکەین، بە گشتی فەرموویەتی، کەواتە: چەمکەکەی بە گشتی دەمێنێتەوە، یانی: چاکە بکەن لەگەڵ خەڵك دا بە گشتی.

ئنجا با تەماشای چەند دەقێکی سوننەتیش بکەین:

٣) یەکیان ئەو دەقەیە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:
{الـدِّينُ: النَّصِيحَةُ، قُلْنَـا: لِمَـنْ؟ قَـالَ: للهِ وَلِكِتَابِـهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّـةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ} [١]

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێك فەرمووی: دینداریی دڵسۆزییە، بە تەنگەوە بوونە، {هاوەڵان دەڵێن} گوتمان: دڵسۆزیی‌و بەتەنگەوە بوون بۆ کێ؟ فەرمووی: بۆ خوا (سبحانه وتعالی) و، بۆ کتێبی خوا و، بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و، بۆ حوکمڕانان‌و بەرپرسانی مسوڵمانان و، بۆ مسوڵمانان بە گشتی.

جارانی دیکەش باسم کردوە، کە زۆر کەس وشەی (نصیحة) بە ئامۆژگاریی لێك دەداتەوە، بەڵام وانیە، (موعظة) ئامۆژگارییەو، (نصیحة) جیایە، (نصیحة) یانی: دڵسۆزیی، ئەگەرنا ئامۆژگاریی کتێبی خواو، ئامۆژگاریی خوا

---

١) أخرجه أحمد: ١٦٩٨٢، ومسلم: ٥٥، وأبو داود: ٤٩٤٤.

چۆن دەکرێ! ئامۆژگاریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چۆن دەکرێ!

(النصیحة) وەك زانایان گوتوویانە: (النُّصحُ هوَ إرادَةُ الْخَيْرِ لِلْمَنْصُوحِ)[١]، (نصح) بریتیە لەوەی: ئەو کەسەی کە تۆ (نُصح)ەکەی ئاڕاستە دەکەی، چی بۆ ئەو چاکە، ئەوەی بۆ بکەی و ئەوەی پێ بڵێی، کەواتە: (نصح و نصیحة) یانی: دڵسۆزیی نواندن و بەخەمەوەبوون.

بۆیە لە زمانی کوردیی دا، ئەگەر بڵێین: بە تەنگەوە بوون و بەپەرۆشەوە بوون و، دڵسۆزیی، ئەوە مانای پڕ بەپێستی (نصیحة)یە.

٤) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرمویّ:
{الْمُؤْمِنُ يَأْلَفُ وَيُؤْلَفُ، وَلا خَيْرَ فِيمَنْ لا يَأْلَفُ وَلا يُؤْلَفُ، وَخَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ}[٢].

واتە: بڕوادار خەڵکیش هۆگری خۆی دەکات و، خۆشی هۆگری خەڵکی دەبێ و، کەسێك نە بتوانێ خەڵك هۆگری خۆی بکات، نە هۆگری خەڵك بێ، خێری پێوە نیەو، باشترینی خەڵك سوودبەخشترینیانە بۆ خەڵك.

کەواتە پێوەری چاکبوون لەلای خوا، ئەوەیە کە ئینسان سوودبەخشتر بێ بۆ خەڵك و، کەڵکی بۆیان هەبێ و، سوودیان پێ بگەیەنێ، چ سوودی ماددیی، چ سوودی مەعنەویی، خەڵك بە گشتی و بێ جیاوازیی.

٥) هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمویّ: {تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ}[١] واتە: زەردەخەنەکردنت لەڕووی برای خۆت دا، خێرو پاداشتی هەیە.

---

١) النُّصح: تَحَرِّي فِعلٍ أو قولٍ فيه صلاحُ صاحبه. (مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٨٠٨).
٢) أخرجه أحمد: ٢٢٨٩١، وأخرجه أيضًا: الطبراني: ٥٧٤٤.

یانی: چاکەیەکە و خێرو پاداشتی لەبەرامبەر دا هەیە، بێگومان لەگەڵ خوشکی مسوڵمانیشدا بەهەمان شێوە، بەڵام وادیارە کوڕەکە هی پیاوان بووە.

٦) هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {تَهادوا تَحابُّوا} (٢) .

واتە: دیارییو خەڵات بدەن بە یەکدی، دەبێتە هۆی یەکدی خۆشویستنتان.

٧) هەر لەوبارەوە، کە دەبێ چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵك دا بکرێ؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الْمُسْلِمُ الَّذي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ أَفْضَلُ مِنَ الَّذي لَا يُخَالِطُهُمْ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ} (٣) .

واتە: ئەو مسوڵمانەی کە لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ دەبێ، مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکاو، خۆڕاگریش دەبێ لەسەر نارەحەتیی و ئازاریان، باشترە لەو مسوڵمانەی کە لەگەڵیان تێکەڵ نابێو، خۆڕاگریش نابێ لەسەر ئازاریان.

بەڵێ مسوڵمان نابێ دوورە پەرێز بێ، مسوڵمان دەبێ ئەرێنیی بێ، کراوە بێ، لەگەڵ خەڵك تێکەڵ بێ، بەڵام تێکەڵبوونێکی ئەرێنیی، تێکەڵبوونێکی کاریگەری بەشێوەیەك، کە سوودیان پێ بگەیەنێ و، لەسەر نارەحەتییەکانیشیان خۆڕاگر بێ، وەك (لوقمان) ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکا، دەڵێ: ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ١٧ ﴾.

---

١) رواه الترمذي:٤٤٥، وقال الألباني: صحيح.

٢) السنن الكبرى للبيهقي، ١٩٦/٦.

٣) الترمذي: ٢٥٠٧.

واتە: ڕۆڵەگیان! نوێژ بەرپا بكەو، فەرمان بە پەسند بكەو، ڕێگریی لە ناپەسند بكەو، لەسەر ئەوەش كە دێتە ڕێت خۆڕاگربە.

هەركەسێك فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند بكات، گرفت و ناڕەحەتیی دێنە ڕێ، چونكە ئەوانەی كە لە ئاوی لێڵدا ڕاوێ دەكەن، دەست هەڵناگرن لە خراپەی خۆیان و، ئەوانەی كە كەیفیان بە چاكە نایەت، كاتێ كە فەرمان بە چاكە دەكەی و، ڕێ لە خراپە دەگری و، لەگەڵتدا تێك دەگیرێن، دەبێ خۆڕاگر بی.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾، یانی: بێگومان خۆڕاگریی لەسەر ئەوەی كە دێتە ڕێت، لەو كارانەیە كە پێویستی بە عەزیمەت دەكا، پێویستی بە ئیرادەیەكی پتەو دەكا، یاخود: لەو كارانەیە كە خوا داكۆكی لەسەر كردوون.

٨) لە فەرمایشتێكی دیكەدا هاتوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَن اسْتَعَاذَ منكم بِاللَّه فأعيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَ بِاللَّه، فَأَعْطُوهُ، وَمَنْ دَعَاكُمْ فَأَجِيبُوهُ، وَمَنْ صَنَعَ إِلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُونَهُ، فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ} (١)

واتە: هەر كەسێك پەنای لێ بەخوا گرتن، {شتێك بوو، گوتی: پەنا بەخوا دەگرم، تووشی زیانم مەكەن} ، پەنای بدەن، {بڵێن: مادام پەنات بەخوا گرت، تەواو پەنادراوی} ، هەروەها هەر كەسێك بەناوی خواوە داوای لێ كردن، پێی بدەن، هەروەها هەركەسێك بانگی كردن، بە دەمیەوە بچن، {كە دەفەرموێ: هەركەس، یانی: مسوڵمانو نامسوڵمان} . دیسان هەركەسێك چاكەیەكی

١) أخرجه أحمد: ١٢٧، وأبو داود: ١٦٧٢، وصححه الألباني.

لەگەڵدا کردن، پاداشتی بدەنەوەو، ئەگەر شتێکتان شك نەبرد، پاداشتی پێ بدەنەوە، بۆی بپاڕێنەوە، هەتا دەگەنە ئەو قەناعەتەی کە بە ئەندازەی چاکەکەی کە لەگەڵیدا کردوون، دوعای خێرتان بۆ کردوە.

٩) لە فەرمایشتێکی دیکەدا کە لەو بارەوە هاتوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَخُونُهُ وَلاَ يَكْذِبُهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ، عِرْضُهُ وَمَالُهُ وَدَمُهُ، التَّقْوَى هَا هُنَا، بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْتَقِرَ أَخَاهُ المسلم} (١) .

واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە، نە خیانەتی لێ دەکا، نە درۆی لەگەڵ دەکا، نە لە تەنگانەدا پشتی بەردەدا، هەموو شتێکی مسوڵمان لە مسوڵمان قەدەغەیە: ئابڕوو و کەرامەتی، ماڵو سامانی، خوێنی، تەقوا لێرەدایە (ئاماژەی بۆ سینەی موبارەکی کرد). {واتە: ڕیشەی تەقوا، بنەکەکەی، لە دڵو دەروونی مرۆڤ دایە}، مرۆڤ ئەوەندە خراپەی بەسە، کە بە کەم تەماشای برای مسوڵمانی بکات و بە سووك سەیری بکات.

١٠) فەرمایشتێکی دیکە لەو بارەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا اَلنَّاسُ! أَفْشُوا اَلسَّلَامَ، وَصِلُوا اَلْأَرْحَامَ، وَأَطْعِمُوا اَلطَّعَامَ، وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا اَلْجَنَّةَ بِسَلَامٍ} (٢) .

واتە: ئەی خەڵکینە! سڵاو کردن بڵاو بکەنەوە، {زۆر سەلام لە یەکدی بکەن} و، خواردن ببەخشن، {خواردن بە خەڵك بدەن} و، پەیوەندیی خزمایەتیی بگەیەنن و، لەکاتێك دا کە خەڵك خەوتوون بە شەوێ، شەونوێژ

١) أخرجه الترمذي: ١٩٢٧، وقال: حسن غريب، وصححه الألباني.
٢) الترمذي: ٢٤٨٥ وقال: حسن صحيح.

بكەن، بە سەلامەتیی دەچنە بەهەشت.

تەماشا بكەن! ئەو هاوسەنگییە: ١- زۆر سلاو لە خەڵك كردن، ٢- خواردن بە خەڵك دان، ٣- گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، ٤- شەونوێژكردن، ئنجا بەهەشت بۆخۆتان مسۆگەر دەكەن، بەو چوار كردەوە سەرەكییە.

یەكێك لە نیشانە سەرەكییەكانی مسوڵمانەتیی ڕاستو دروست, بریتیە لە: هاوسەنگیی، كە مرۆڤی مسوڵمان دەبێ بتوانێ لە هەموو مەیدانانـدا ئەسپی خۆی تاوبدا، نەك بە باریكە ڕێیەكدا بڕوات، نەك تەنیا سەرگەرمی دوو-سێ ئیشان بێ! بەڵكو دەبێ نوێژكەری باش بێ و، خواردنیش بە خەڵك بدات و، سلاویشیان لێ بكات و، پەیوەندیی خزمایەتییش بگەیەنێ، لەگەڵیشیان بە ڕێزو حورمەت بێ.

١١) كۆتا فەرموودە كە لەو بارەوە دەیهێنینەوە، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، كە دەفەرموێ: {إِنَّكُمْ لَنْ تَسَعُوا النَّاسَ بِأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَسَعُهُمْ مِنْكُمْ بَسْطُ الْوَجْهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ}[1].

واتە: ئێوە بەماڵو سامانتان فریای هەمووی خەڵكی ناكەون، {ناتوانن ماڵو سامان بدەن بە هەموو خەڵك، پارەتان هێندە نیە} ، بەڵام ڕووی گەش و خۆشتان و، ڕەوشتی جوانتان بەشی هەمووان دەكات.

چی تێ دەچێ، كە ئینسان لەگەڵ هەموو كەسدا ڕووی خۆش بێ! لەگەڵ هەموو كەسدا ڕەوشتی جوان بێ! لەگەڵ هەموو كەسدا بەڕێزو حورمەت بێ! بە پێچەوانەوە: ڕووگرژیی‌و تاڵیی، مەسرەفی زۆر بە ئینسان دەكا، هەم ئینسان ئەزیەت دەدات، هەم دەوروبەرەكەی ئەزیەت دەدات، هەم كەشێكی تەنگ‌و تاڵ

---

١) الحاكم في المستدرك: ٤٢٧.

بڵاودەكاتەوە، بەڵێ لە ڕاستییدا: ڕەوشتی خراپو ئاكاری خراپ، ئینسان ئەزیەت دەداو، مەسرەفی زۆر بە ئینسان دەكا. چونكە كەسێك بە زمان خەڵك نارەحەت بكا، بە ڕووی گرژی، بە ڕەوشتی خراپی، بەدەست بزێویی دزێوی، بە تەئكید هەم خۆی دەخاتە مەینەتییو ئەزیەتەوە، هەم خەڵكو دەوروبەریشی.

١٢) كۆتایی ئەم بابەتە هەمووی بەم ئایەتە موبارەكە دێنین، ئایەتی (١٠٤) لە سوورەتی (آل عمران)، كە خوا (سبحانه وتعالى) ڕوو لە ئێمەی مسوڵمان دەكا، دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٠٤) ﴾.

واتە: ئێوە كۆمەڵێك بن، ئەی مسوڵمانینە! یان با لەنێو ئێوەدا كۆمەڵێك هەبن، {ئەم سێ كارە بكەن}:

١- ﴿يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ﴾، خەڵك بانگ بكەن بۆ هەرچی چاكەیە {لەنیازی دڵ و قسەی زمان و كردەوەی ئەندامەكان و، لە هەموو بوارەكانی ژیان و گوزەران و ئاستەكانی كۆمەڵگادا}.

(راغب الأصفهاني) ئاوا پێناسەی (خَیْر) دەكا: (ما يرغب فيه الكلّ)[1].

(خیر) بریتیە لەوەی كە هەموو كەس بۆی ئارەزوومەندە، چ پەیوەندیی بەلایەنی تاكییەوە هەبێ، چ بە بواری خێزانیی، چ كۆمەڵایەتیی، چ سیاسیی، چ ماددیی بێ، چ مەعنەویی.

٢- ﴿وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ﴾، هەروەها هەرچی پەسندە، فەرمانی پێ بكەن، واتە: هەوڵبدەن شتی پەسندو چاك، لە كۆمەڵگاو دەوروبەری خۆتان دا

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٣٠٠.

بچەسپێنن.

٣- ﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾، هەروەها ڕێگریی بكەن لە هەرچی ناپەسندو خراپە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

دیارە وشەی (المعروف) و (المنكر)، كە دەبێ (المعروف) فەرمانی پێ بكرێ و، (المنكر) ڕێگریی لێ بكرێ، لە زمانی عەرەبییدا هەردووكیان (ألـ)ی تەعریفیان لەسەر، ئەو (الـ)ەش لێرەدا مانای (جنس) دەگەیەنێ، واتە: هەرچی شتی پەسندە، دەبێ فەرمانی پێ بكەن و، هەرچی شتی ناپەسندە، ڕێگریی لێ بكەن.

ئنجا هەرچی شتی پەسندە: چ پەیوەندیی بە لایەنی بووناسییەوە هەبێ، چ بە ئیمانو عەقیدەوە، چ بە عیبادەتو پەرستشەكانەوە، چ بە ڕەوشتو ئاكارەوە، چ بە باری كەسییەتیو بواری خێزانیی، چ بە بواری كۆمەڵایەتیی، چ بە بواری سیاسیی...هتد، هەرچی پەسندە، دەبێ هەوڵبدرێ بچەسپێندرێ، هەروەها هەرچی ناپەسندە، دیسان پەیوەندیی بە هەر كام لە ڕەهەندەكانی ژیان و، هەر كام لەلایەنەكانی مسوڵمانەتییەوە هەبێ، دەبێ هەوڵبدرێ، ئەو ناپەسندو خراپانە، ڕیشەكێش بكرێن و، كۆمەڵگایان لێ بژار بكرێ.

ئنجا كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾، هەر ئەوانەش سەرفرازن، یانی: تەنیا ئەوانەی كە خەڵك بانگ دەكەن، بۆ هەرچی چاكەیە و، هەوڵدەدەن تێكڕای شتی پەسندیان لەنێودا بچەسپێنن و، سەرجەم شتی بەزەرو خراپیان لەنێودا ڕیشەكێش بكەنو، كۆمەڵگا بژار بكەن، لە خراپەكان و، بیڕازێننەوە بە چاكەكان، ئا ئەوانە سەرفرازن و، ئەوانە بە مراد گەیشتوون.

ئاڵقەی سێزدەیەم:

# ئەدەب لەگەڵ مزگەوتدا

بەڕێزان!

ئایا ئێمە لەگەڵ ماڵەکانی خوادا، لەگەڵ مزگەوتەکاندا، دەبێ چۆن مامەڵە بکەین و، ڕەوشتو ڕەفتارو ئاکارمان چۆن بێ؟ لە سێ(٣) بڕگەداو، لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەتێکی خوای پەروەردگارو، چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، باسی ئەو ئەدەبو ڕەوشتانە دەکەین، کە مسوڵمانان دەبێ ڕەچاویان بکەن، لە مامەڵە کردن لەگەڵ ماڵەکانی خوا، لەگەڵ مزگەوتەکاندا.

**بڕگەی یەکەم: گەورەیی پێگەی مزگەوتان، ماڵەکانی خوا:**

١- خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الجن)-١٨-دا، دەفەرمویَ: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ ﴾ .

وتە: مزگەوتەکان تەنها هی خوان، ئنجا لەگەڵ خوادا لە کەسی دیکە مەپاڕێنەوە.

کەواتە: مزگەوت ماڵی خوایەو نابێ هیچ کەس بە ماڵی خۆی بزانێ و، نابێ هیچ کەس بە موڵکی خۆی بزانێ، هەر مزگەوتێك کە دروست دەکرێ، هەرکەسێك لە پشتییەوە بێ: چ دامەزراوەییەکی حکوومییە، چ شەخسێکە، چ هۆزێکە، چ حزبێکە، چ بنەماڵەیەکە، نابێ نیەتی ئەوەی لێبێنێ کە موڵکی خۆیەتی، بەڵکو کە دروستی کرد، مادام ناوی لێنا مزگەوت، ئەوە موڵکی خوایە (سبحانه وتعالى)و، بۆ هەموو کەس وەك یەکە.

ئنجا گرنگترین شتێك کە لە مزگەوتدا دەکرێ، ئەوەیە کە: ﴿فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا﴾، تەنیا خوای تێدا بپەرسترێ و، لەگەڵ خوادا لە کەسی دیکە پاڕانەوە نەکرێ و، بەندایەتیی بۆ کەسی دیکە نەکرێ.

٢- لە سوورەتی (البقرة)-١١٤-دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ﴾.

واتە: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە ڕێگا دەگرێ، کە مزگەوتەکانی خوا، ناوی خوایان تێدا بهێندرێ و، هەوڵی کاولکردنو تێکدانیان دەدا! واتە: ئەو

کەسە، لە هەموو کەس ستەمکارترە، کە ناهێڵێ ماڵەکانی خـوا نـاوی خوایـان تێدا بەرزبکرێتەوەو، هەوڵ دەدات کاولیان بکات، چ بە کاولکردنی مەعنەویی، چ ماددیی.

مـن نامیلکەیـەکم هەیـە بـەناوی "مزگەوتـەکانی کوردسـتان لـەنێوان ئاوەدانکردنەوەو کاولکردندا"، لە ڕاستییدا مزگەوت کاولکردن هەر ئـەوە نیـە، کە بلّدۆزەری لێبدرێ، وەك کاتی خۆی ڕژێم مزگەوتەکانی لادێکانی کوردستانی ڕووخاند، کاولکردنی ماڵەکانی خواو، وێرانکردنیان تەنیا ئەو حاڵەتە ڕواڵەتییو بەرهەستەی نیە، بـەڵکو وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ﴾، کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە ڕێدەگرێ مزگەوتەکانی خوا، ناوی خوایـان تێـدا بهێنـدرێ و، هـەوڵیش دەدات کاولیان بکات، واتە: لە ڕووی مەعـنەوییەوە کاولیان بکاو، لەنێوەڕۆکی خۆیـان خاڵییـان بکاتـەوە، ئەوانـەی کـە ڕێـدەگرن لـە مزگەتەکانـدا دەرسـی قورئـان بخوێنـدرێ، فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) و، زانسـتە شەرعییەکانیان تێدا بخوێندرێن، مسوڵمانان تێیاندا ئازادانە یادی خـوا بکـەن، بێگومان ئەوەش جۆرێکە لە کاولکردنی ماڵەکانی خواو مزگەوتـەکان، چـونکە کاولکردنی مەعنەویی ئەوەیە، کە پەك بخرێن لـەوەی کـە بـە ئـەرکی خۆیـان هەڵبستن، ئاشکراشە ئەرکێکی شەرعیی کە مزگـەوتی بۆیـە دروسـت دەکـرێ، تێیدا ئەنجام بدرێ، بریتیە لە یادکردن و باسی خواو، باسی ئایینو بەرنامەی خوا (سبحانه وتعالى).

٣- لە سووڕەتی (النور) (٣٦ – ٣٧)دا، خوای پەروەردگار ئاوا لـە بـارەی ماڵەکانی خۆیەوە دەفەرموێ:

﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾ ﴾ النور: ٣٤ - ٣٧

واتە: لە ماڵانێکدا کە خوا مۆڵەتی داوە: ئەو ماڵانـە بەرزبکرێنـەوەو، نـاوی خوایان تێدا بهێندرێ، پیاوانێك لەو ماڵانەدا بە بەیانیانو ئێواران خوا بـە پـاك دەگرن، ئەو پیاوانە، نە بازرگانیی نە کڕینو فرۆشتن لـە یـادی خـواو، لـە نوێـژ بەرپاکردنو لە زەکات دان، بێ ئاگایان ناکـات، لـە ڕۆژێـك دەترسـن کـە دڵ و چاوەکان تێدا هەڵدەگەڕێنەوە.

یانی: لەگەڵ ئەوەشدا کە بازرگانیی و کەسابەت دەکەن، کـڕینو فرۆشـتنیش دەکەن، بەڵام لە پەیوەندیی نێوان خۆیانو خوا و، لە نوێـژ بـەرپاکردنو زەکـات دان، بێ ئاگا نابن.

٤- لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، دەفەرموێ: {أَمَرَ رَسُـــولُ اللَّهِ (صـــلى اللـــه عليـــه وســـلم) بِبِنَـــاءِ الْمَسَـــاجِدِ فِي الـــدُّورِ، وَأَنْ تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ}[1]

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کردوە، کە مزگەوتەکان لـە گەڕەکاندا دروست بکرێن و، پاكو خاوێن ڕابگیرێن و بۆنخۆشیش بکرێن.

١) أخرجه أبوداود: ٤٤٥، والترمذي: ٥٩٤، وصححه الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): ٢٧٩.

کەواتە مزگەوت دروست کـردن، فـەرمانی پێغەمبـەری (صلی الله علیه وسلم) لەسەرە، لە گەڕەك‌و لە شـوێنەکاندا، لـەم هـەرێمی کوردسـتانەی ئێمـەدا، لـە هەندێك گەڕەکانـدا بـەس شـوێنی مزگـەوت دیـاریی نـەکراوە، مەلەوانگـەو، یانە(نادي)و، زۆر شوێنی دیکە گشتییان تێدا ڕەچاو کراون، بەڵام ماڵی خوایـان تێدا دانەنراوە لە نەخشەکەدا! کە ئەوەش کەمتەرخەمییـەکی گەورەیـە، بگـرە گوناهێکی گەورەیە لەنێو میللـەتێکی مسـوڵماندا، شـارێك، گونـدێك بنیـات بنـرێ، کـە بـەزۆرییش وا بـووە، بـە پـارەی حـەڕام و، بـە ڕێکـەوتن لەگـەڵ دەسەڵاتدارانێك، کە شـەریکە دزن لەگەڵیانـدا، دروسـت دەکـرێ و، کـابرا لـە پەنایدا دەبێتە ملیاردێر، کەچی بستێکی بۆ ماڵی خوا تێدا دیاریی نەکردوە!

## بڕگەی دووەم: پاراستنی مزگەوت

دەبێ مزگەوت بپارێزرێ، لە هەر شتێك کە شایستەی مزگەوت نیە.

١) خوا (سبحانه وتعالی) دەفەرموێ:

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴾ الأعراف:٣١.

واتە: ئەی وەچەی ئادەم! ئەی ڕۆڵـەکانی ئـادەم! لـەلای هـەر مزگـەوتێك خۆتان بڕازێننەوە، {یانی: بە ڕازاوەیی و بە جوانیی و بە بۆنخۆشیی بچـنە ماڵی خوا, چونکە تۆ میوانی خوای}.

هی وا هەیە دەچێ بۆ بانگێشتێك، یان دەچێت بۆ کۆڕێك، یان بـۆ شـین‌و شاییەکی خەڵك، خۆی دەڕازێنێتەوەو، لە خۆی دەخەفتێ، بـەڵام دەچـێتە مزگەوتێ بە شەپڕێویی، بـەڵام خـوا دەفـەرموێ: ﴿خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ

مَسْجِدٍ﴾، لەلای هەر مزگەوتێك لەلای هەر شوێنێك كە كڕنووشی بۆ خوا تێدا دەبردرێت، خۆتان بڕازێننـەوە, چـۆن جـوان و ڕێكـە، چـۆن پـاكتر و بۆنخۆشتری، ئاوا بچۆ بۆ ماڵی خوا.

٢) لەو بارەوە كە دەبێ ماڵی خوا، مزگەوت لە بۆنی نـاخۆش و شـتی پـیس بپارێزرێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەموێ:
{مَنْ أَكَلَ الْبَصَلَ وَالثُّوم وَالْكُرَّاث، فَلا يَقْرَبَنَّ مسْجِدَنَا، فَإِنَّ المَلائِكَـةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يتأَذَّى مِنْهُ بَنُو آدمَ} [١].
واتە: هەر كەسێك پیازو سیرو كەوەر، {یاخود كوڕادە، یان سـیرمۆكە}ی خوارد، {كە بۆنیان ناخۆشە}، با نیزیكـی مزگـەوتمان نەكـەوێ، چـونكە فریشتەكانیش نارەحەت دەبن بـەوەی كـە وەچـەی ئـادەم پێـی نارەحـەت دەبن.
وەك چۆن مرۆڤەكان بۆنی ناخۆشیان پـێ ناخۆشـە، فریشـتەكانیش بـۆنی ناخۆشیان پێ ناخۆشەو، فریشتەكانیش لە ماڵەكانی خوا دان.

٣) فەرمایشتێكی دیكە لەو بارەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:
{الْبُصَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا} [٢].
واتە: تـف ڕۆكـردن لـە مزگـەوت گوناهـە، {گونـاهێكی گەورەیـە} و، سڕینەوەی ئەو گوناهەش لابردنیەتی.

---

١) أخرجه مسلم: ٥٦٤، والترمذي: ١٨٠٦، وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى:٦٦٨٥.
٢) البخاري: ٤٠٥، ومسلم: ٥٥٢.

ئەو تفە، یان بەڵغەمە، یان چڵمە، کە ڕۆکراوە، دەبێ مزگەوتی لێ پاك بکرێتەوە، لێرەدا بۆیە دەفەرموێ: (دفنها) واتە: شاردنەوەی، چونکە کاتی خۆی مزگەوتەکان چەو و لم بوون، بەڵام ئێستا کە فەرشی تێدا ڕاخراوە، دەبێ خاوێنی بکەیەوەو، جاری وایە وێڕای سڕینەوە، حەوجێی شۆردنیشە.

٤) هەر لەوبارەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{إِنَّ هَذِهِ الْمَسَاجِدَ، لَا تَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنْ هَذَا الْبَوْلِ، وَلَا الْقَذَرِ، إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ اللَّهِ تعالى، وَقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ} [١].

واتە: ئەم مزگەوتانە، ناگونجێن بۆ میز، یاخود شتی پیس، {کاتی خۆی خەڵك دواکەوتوو بووە، بەتایبەتی کە خەڵکێك تازە هاتۆتە نێو ئیسلامەوە، بۆ نموونە: لە دەقەکانی سوننەتدا هاتوە، کە عەرەبێکی خێڵەکیی ڕۆژێك یەکسەر لە مزگەوتێ میزی کردوە! پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەو مزگەوتانە ناشێن و شایستە نین بۆ هیچ کام لەم شتانەی پیسن}، بەڵکو بۆ یادی خوای بەرزن و، بۆ قورئان خوێندنن، {و بۆ بەندایەتیی بۆ خوا کردنن}. [٢]

---

١) مسلم: ٢٨٥.

٢) {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي طَائِفَةِ الْمَسْجِدِ، فَزَجَرَهُ النَّاسُ، فَنَهَاهُمْ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم، فَلَمَّا قَضَى بَوْلَهُ أَمَرَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم، بِذَنُوبٍ مِنْ مَاءٍ" فَأُهْرِيقَ عَلَيْهِ} (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البخاري: ٢١٩، ومسلم: ٢٨٤)

## بڕگەی سێیەم: چەند ئەدەبێكی گرنگ، بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ مزگەوتدا:

وێڕای ئەوانەی كە باسمان كردن، با چەند ئەدەبێكی دیكەی گرنگ بۆ مامەڵە لەگەڵ مزگەوتدا، بخەینە ڕوو:

١) یەكێك لە ئەدەبەكان ئەوەیە، ئینسان كاتێك دەچێتە ژوور مزگەوت، پێی ڕاستی پێش بخات و، كاتێك دێتە دەرێ، پێی چەپی پێش بخات، ئەم فەرمایشتە لەو بارەیەوە دێنین:
{كَانَ رَسُول (صلى الله عليه وسلم) يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ في شَأْنِهِ كُلِّهِ: في طُهُورِهِ وتَرَجُّلِهِ وتَنَعُّلِهِ} [١].
دایكمان عائیشە (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەزی لەوە دەكرد لە هەموو كاروبارەكانیدا بەلای ڕاستی دەست پێ بكا: كە دەستنوێژی دەگرت، یان كە خۆی دەشۆرد، پێشێ لای ڕاستی دەشۆرد، هەروەها كە سەری دادەهێنا، پێشێ لای ڕاستی دادەهێنا، دیسان كە پێڵاوی لەپێ دەكرد، پێشێ پێی ڕاستی لەپێ دەكرد، {بۆ دانانی پێڵاویش پێشێ لای چەپ و، بۆ هاتنە دەریش لە مزگەوت پێی چەپی پێش دەخست}.

١) أخرجه البخاري: ١٦٨، ومسلم: ٢٦٨، عن عائشة رضي الله عنها.

(النووي) لە (رياض الصالحين)ەكەی خۆیدا،[1] ئـەم ناونیشـانەی هێنـاوە: (باب استحباب تقديم اليُمنى في كل ما هو من باب التكريم، كالوضـوء والغسل والتيمم، ولَبس الثوب والنَّعل والخُف والسراويل ودخول المسجد).

واتە: باسی ئەوە كە وا باشـە لای ڕاسـت پـێش بخـرێ، لـە هـەموو ئـەو شتانەدا كە جێی ڕێزن، وەك: دەستنوێژگرتن و تەيەمموم كردن و خۆشـۆردن و پۆشاك لەبەر كردن، پێڵاو كردنەپێ و خوف {يان گۆرەوی} دەپێ كـردن و شەڕواڵ دەپێ كردن و چوونە مزگەوت.

٢) ئەدەبێكی دیكـەی چـوونە مزگـەوت ئەوەیـە، ئینسـان كاتێـك دەچـێتە مزگەوت، دانەنیشێ تاكو دوو ڕكات نوێژ دەكات، وەك: پێغەمبـەر (صلى اللـه عليـه وسـلم) دەفـەرموێ: {إِذَا دَخَـلَ أَحَـدُكُمْ الْمَسْـجِدَ فَـلاَ يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ}.[2]

واتە: يەكێكتان كە چووە مزگەوت، با دادەنیشـێ تـاكو دوو ڕكـات نوێـژ دەكا.

ئەو دوو ڕكاتەش، شەرعزانان ناویان لێنـاوە: (ركعـتي تحيـة المسـجد) دوو ڕكاتی سڵاو كردن لە مزگەوت، چۆن سڵاو لە مزگەوت دەكەی؟ دوو ڕكات نوێژی تێدا دەكەی.

٣) هەروەها لە ئەدەبەكانی هەڵس و كەوت لەگەڵ مزگەوتدا، ئەوەیە، كە لـە مزگەوتدا نابێ كڕینو فرۆشتن بكرێ و، نـابێ دەنـگ بـەرز بكرێتـەوە و، كەسـێك شـتێكی لێ ون بـووە، لـە مزگەوتـدا هـاوار بكـا، وەك لـەم

---

١) ص٢٨٧.

٢) أخرجه البخاري: ١٢٦٣، ومسلم: ٧١٤.

فەرمایشتەدا هاتوە:
{مَنْ سَمِعَ رَجُلًا يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ فَلْيَقُلْ: لَا رَدَّهَا اللَّهُ عَلَيْكَ؛ فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا} [١].

واتە: هەر کەسێك گوێی لێ بوو، کەسێك بانگی شتێکی دەکرد، شتێکی لێ ون بووبوو، بانگی دەکرد، جاڕی بۆ دەدا، با بڵێ: (یاخوا نەیدۆزییەوە)، خوا بۆت نەهێنێتەوە، چونکە مزگەوت بۆ ئەوە دروست نەکراوە.

بەڵێ، مزگەوت دەبێ ڕێزو حورمەتو ویقاری بپارێزرێ و، نەکرێتە شوێنی دەنگ هەڵێنانو، کڕینو فرۆشتنو فشقیات، یان هەندێ جۆرە قسەو باس کە لایەقی مزگەوت نیە.

٤) یەکێکی دیکە لە ئەدەکانی مزگەوت ئەوەیە، ئینسان کاتێك دەچێتە ژوور مزگەوت بڵێ: {اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوابَ رَحْمَتِكَ} [٢]. واتە: ئەی خوایە! دەرگاکانی بەزەیی خۆتم بۆ بکەوە.

هەروەها کاتێك دێتە دەرێ، سوننەتە بڵێ: {اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ} [٣] ئەی خوایە! من لە بەخششی تۆ داوا دەکەم.

واتە: تۆ کە لە مزگەوت دەچیە دەرێ، دەچیە نێو ژیانو کارو کەسابەت و، مەزەنەی ئەوەیە کە تۆ بژیو و بەخششی خوات پێ بڕێ، بڵێ: خوایە! لە بەخششی تۆ داوا دەکەم، بەڵام کاتێك دەچیە نێو مزگەوت، بۆیە

١) أخرجه مسلم: ٥٦٨.
٢) أخرجه مسلم: ٧١٣، وأبو داود: ٤٦٥.
٣) أخرجه مسلم: ٧١٣، وأبو داود: ٤٦٥.

دەچی، کە خوا بەزەیی پێت دابێ و لێت ببووریٚ و پاداشتت هەبێ، بۆیە لە ڕەحمەتو بەزەیی خوای بەخشەر بۆ خۆت داوا بکە.

لەکۆتاییدا دەڵێم:

بێگومان مزگەوت کە ماڵی خوایەو، ئەوانەی کە مزگەوت دروست دەکەن خێرو پاداشتێکی گەورەیان هەیە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە:

{مَنْ بَنَى مَسْجِدًا لِلَّهِ كَمَفْحَصِ قَطَاةٍ أَوْ أَصْغَرَ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ} [1]

واتە: کەسێك ماڵێك بۆ خوا دروست بکات، ئەگەر بەقەدەر هێلانە کۆترێکیش بێ، خوا ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکات.

هەڵبەتە مزگەوت هەرگیز بە ئەندازەی هێلانە کۆتر نابێ، بەڵام مەبەست ئەوەیە هەرچەندە بچووك بێ، بەڵام بەڕاستیی ئەوە شتێکی زۆر خراپە، ئەو کەسەی کە مزگەوت دروست دەکا، دوایی بە موڵکی تایبەتیی خۆی دەزانێ! ئاخر بە حیساب تۆ ماڵت بۆ خوا دروست کردوە، ئنجا کە ماڵت بۆ خوا دروست کردوە، ماڵی خوا هی هەموو خەڵکی خوایەو، تۆ نابێ لەو سەرەوە لە خوای بستێنیەوە ناوی خۆتی لێ بنێی!!

هەڵبەتە مەبەستم ئەوە نیە کە ئەگەر کەسێك ناوی خۆی، یاخود ناوێك لە مزگەوتەکە دەنێ پێی بناسرێتەوە، ئەوە گرنگ نیە، بەڵام ئەوە گرنگە کە ئەو

---

١) أخرجه ابن ماجه: ٧٣٨، قال البوصيري: هذا إسناد صحيح، والديلمي: ٥٧١٩.

لە دڵی خۆیدا بۆ ئەوەی نەبێ بڵێن: ئەوە فڵان كەس دروستی كردوە، ئەگەرنا پاداشتەكەی دەبێتەوە بە هیچ، نابێ بۆ خۆ هەڵكێشانی بێ، ئەوە گرنگە.

پاشان نابێ وا مامەڵە لەگەڵ ئەو مزگەوتەدا بكات، كە موڵكی خۆیەتی، خەڵكێكی لێ قەدەغە بكات و، خەڵكێكی بۆ فەرموو بكات!! یان شوێنێك شوێن بۆخۆی و هەندێك شوێنیش بۆ خەڵكێكی دیكە دیاریی بكات، لە ڕاستییدا كێ پێشێ دەچێتە مزگەوت، بۆ كوێ دەچێ، ئەو زیاتر شایستەی ئەو شوێنەیە كە لێی دادەنیشێ و، هیچ كەس بۆی نیە هەندێك شوێن لە مزگەوتدا بۆخۆی قۆرخ بكات.

ئاڵقەی چواردەیەم :

# ئەدەب لە بازاڕو شوێنە گشتییەكاندا

بەڕێزان!

ئایا ئێمە لە بازاڕ، لە جێی كارو كەسابەت، لە شوێنە گشتییەكان دا، كە بۆ هەموو كەس وەك یەكن، دەبێ چۆن مامەڵە بكەین و، ئەو ئەدەبو ڕەوشتانە چین، كە دەبێ ڕەچاویان بكەین؟ لەم ئاڵقەیەدا، لە چوار(٤) بڕگەدا باسی ئەوە دەكەین.

## بڕگەی یەکەم: حوکمی گشتیی چوونە بازاڕو شوێنە گشتییەکان:

١) خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (النور) ئایەتی (٢٩)دا دەفەرموێ:

﴿ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: گوناهتان ناگاتێ کە بچنە ماڵانێکەوە، {بچنە چەند جێگاو شوێنێکەوە} ، کە کەسیان تێدا نیە، {واتە: کە کەسی نیشتەجێیان تێدا نیە، بەو واتایە هی کەسانێکی دیاریی کراو نین} و، لەوێ دا بەهرە وەربگرن، خواش دەزانێ چی ئاشکرا دەکەن‌و چی پەنهان دەکەن!

زانایان لە تەفسیرەکان دا دەڵێن: ﴿بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ ﴾، وەك خانەکان(الخانات)، کاتی خۆی لە جیاتی هوتێل، خان هەبووە، هەروەها ئەو شوێنانەی کە شوێنی گشتیین بۆ ئیسر}احەتی خەڵك و تێدا مانەوەی خەڵك، یان جێبەجێ کردنی کار و پێویستییەکانیان.

کەواتە ﴿بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ ﴾ واتە: ئەو شوێنانەی عائیلەیان تێدا نیە، ئەگەرنا مەرج نیە هیچ کەسیان تێدا نەبێ، بۆ وێنە هۆتێل خەڵکێکی هەر تێدایە سەرپەرشتیی دەکا، هەروەها شوێنە گشتییەکانی دیکە، ئنجا خوا دەفەرموێ: گوناهتان ناگاتێ بچنە نێو ئەو شوێنانەوەو، لێیان بەهرەمەند بن، بەڵام خوا دەزانێ: چی ئاشکرا دەکەن‌و، چی پەنهان دەکەن، واتە: بزانن چۆن دەچن‌و، چۆن مامەڵە دەکەن!

٢) هەروەها لەوبارەوە لە سووڕەتی (الجمعة) ئایەتەکانی: (٩-١٠)دا خوا (سبحانه وتعالى) بانگی ئێمەی بڕوادار دەکاو، دەمان دوێنێ و، دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٠﴾ .

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر لەڕۆژی جومعەدا، بانگکرا بۆ نوێژ، ئێوە بەرەو یادی خوا بڕۆن بەخێرایی، بە جددیی و، دەست لە کڕینو فرۆشتن هەڵگرن، ئەوە بۆ ئێوە باشترە ئەگەر بزانن. ئنجا هەر کات نوێژ تەواو بوو، بە زەویی دا بڵاوببنەوەو لەبەخششی خوا داوا بکەن و، زۆریش یادی خوا بکەن، بۆ ئەوەی سەرفراز بن.

ئەم دوو ئایەتە موبارەکە لێیان وەردەگیرێ، کە ئیسلام وەك چۆن گرنگیی داوە بەوەی مسوڵمانان ئەهلی مزگەوت بن و، گرنگیی بە مزگەوتو ماڵەکانی خوا بدەن و، پەرستشەکانیان تێدا ئەنجام بدەن، بەهەمان شێوەش: دەبێ ئەهلی بازاڕو کارو کاسبییش بن و، گرنگیی بە بازاڕو پەیداکردنی بژێو و ڕزقو ڕۆزییش بدەن، ئەوەتا خوا دەفەرموێ: ئەگەر بانگدرا بۆ نوێژ لە ڕۆژی جومعەدا، {کە جومعەکردن لەسەر پیاوانی مسوڵمان فەڕزەو، بۆ ئافرەتانیش سوننەتەو شتێکی پەسندە، بەڵام لەسەریان واجب نیە} ، ئەگەر بانگدرا دەست لە کڕینو فرۆشتن هەڵگرن، واتە تاکو بانگ دەدرێ، بۆتان هەیە کڕینو فرۆشتن بکەن، مادام لەدوای بانگ فریا بکەون، بچنە مزگەوت بۆ نوێژەکەتان، هەتا ئەو کاتە بۆتان

هەیە، دواییش دەفەرموێ: ئەگەر نوێژەکەش تەواو بوو، دووبارە بڵاوبنەوە بە زەویی داو، لە بەخششی خوا داوا بکەن، واتە دوای نوێژیش دیسان بۆتان هەیە بگەڕێنەوە سەر کڕین‌و فرۆشتن‌و کارو کاسبیی خۆتان.

ئەمەش ئەمە دەگەیەنێ، کە ئیسلام نەك هیچ هەستیارییەکی نیە بە کارو کاسبیی‌و ڕزق‌و بژیو پەیدا کردن، بەڵکو مسوڵمانانی بۆ هاندەداو لەسەر مسوڵمانانی پێویست دەکا، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەسەر حیسابی جێ بەجێ کردنی ئەرکە شەرعییەکان نەبێ، دەنا پەیداکردنی بژیوی حەڵاڵیش هەر ئەرکێکی شەرعییەو، ئەویش هەر طاعەتێکە مسوڵمانان بۆ خوای خۆیان ئەنجامی دەدەن.

## بڕگەی دووەم: وریایی لە بازاڕ

ئایا چۆن تەماشای شوێنەکانی سەرزەوی دەکرێ؟ با لەو بارەوە ئەم دوو فەرمایشتە بێنین:

١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:
{أَحَبُّ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ مَسَاجِدُهَا، وَأَبْغَضُ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ أَسْوَاقُهَا}[١].

واتە: خۆشەویستترین شوێنەکان لەلای خوا، مزگەوتەکانن و، بوغزێنراوترین شوێنەکان لەلای خوا بازاڕەکانن.
بۆچی مزگەوتەکان لەلای خوا لە هەموو پارچە زەوییەکان خۆشەویستترن؟ چونکە یادی خوایان تێدا دەکرێ و، چاکەیان تێدا دەکرێ و، بەندایەتییان بۆ خوا تێدا ئەنجام دەدرێ، ئەدی ئایا بازاڕەکان بۆچی بوغزێندراون؟ بێگومان لەبەر ئەوە نیە، کە کارو کەسابەتی حەڵاڵیان تێدا دەکرێ! بەڵکو لەبەر ئەوەی ناشەرعییان تێدا دەکرێ، قۆڵی خەڵکییان تێدا دەبڕدرێ و، سوێندی بەدرۆیان تێدا دەخورێ، بەکورتی: گوناهو تاوانییان تێدا ئەنجام دەدرێ، ئەگەرنا بازاڕێك کاسبیی حەڵاڵی تێدا بکرێو، یادی خوای تێدا بکرێو، چاکەی تێدا بکرێ، بە تەئکید ئەویش هەر نیمچە مزگەوتێکەو، ئەویش هەر کراوە بەشوێنێك، کە وەك پەرستگا وایە، بەڵام دیارە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زانیویەتی بازاڕ و شەقامەکان و شوێنە

---
١) أخرجه مسلم: ٢٤٥١.

گشتییەكان چییان لێ دێ؟ ئنجا ئەگەر تەماشای دنیاش بكەین، دەزانین كە بەڕاستیی لە بازاڕەكاندا، گوناهو تاوانو لادانو غەڵەتو پەڵەت زۆرە.

٢) فەرمایشتێكی دیكە لەو بارەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{لاَ تَكُنْ أَوَّلَ مَنْ يَدْخُلُ السُّوقَ، وَلاَ آخِرَ منْ يخْرُجُ مِنْهَا، فِيهَا بَاضَ الشَّيْطَانُ وَفَرَّخَ}[1].

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە سەلمانی فارسیی فەرمووە: یەكەم كەس مەبە كە دەچێتە بازاڕ، دوایەمین كەسیش مەبە كە لە بازاڕ دەردەچێ، چونكە شەیتان لەنێو بازاردا گەرا دادەنێو، بێچووان دادەنێ.

واتە لەنێو بازاڕدا زیاتر كەسانێك هەن: ئەوە دەڵێنو ئەوە دەكەن، كە شەیطان دڵی پێ خۆشە، وەك بەچكە شەیطانێك بن، وان!

## بڕگەی سێیەم: خۆپاراستن لە فرتو فێڵ

ئنجا با لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەكردنەوەش لە بازاڕدا، ئاماژە بە سێ(٣) فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بكەین:

١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ، فَلَيْسَ مِنَّا، وَمَنْ غَشَّنَا، فَلَيْسَ مِنَّا} [2].

واتە: هەركەسێك چەكمان لەدژ هەڵبگرێ، لە ئێمە نیەو، هەركەسێك فێڵمان لێ بكات، لە ئێمە نیە.

---

١) أخرجه مسلم: ٢٤٥١، عن سلمان الفارسي.

٢) أخرجه مسلم:١٠١.

{فێڵمان لێ بکا} ، واتە لەکارو کاسبییدا فێڵ‌و ساختەی تێدا بێت و پێچ‌و غەش‌و خیانەتی هەبێ، ئەوە لەو کردەوەیەیدا لە مسوڵمانان نیە، نەك لە ڕیزی ئیسلام یەکجاریی چووبێتە دەرەوەو کافر بووبێ، واتە: مسوڵمان موخەننەت‌و فێڵبازو قوڵبڕ و ساختەچیی نیە، مسوڵمان ڕێك‌و ڕاستە لە کارو کاسبیی دا.

٢) {عَنْ أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعامٍ، فأدْخَلَ يَدَهُ فيها، فَنالَتْ أصابِعُهُ بَلَلًا فقالَ: ما هذا يا صاحِبَ الطَّعامِ؟ قالَ أصابَتْهُ السَّماءُ يا رَسولَ اللَّهِ، قالَ: أفَلا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعامِ كَيْ يَراهُ النَّاسُ، مَن غَشَّ فليسَ مِنَّا)[1].

(أبو هريرة) (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەلای کۆمەڵە خواردنێك دا تێپەڕی، {ئایا کۆ گەنمێك بووە هەڵدراوەتەوە، یاخود جۆ بووە، یاخود هەر زادو زەخیرەیەك بووە} ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستی خستە نێو ئەو کۆخۆراکە، {دەغڵ، یان هەرچی بوو} ، پەنجەکانی تەڕ بوون، فەرمووی: ئەی خاوەنی خواردن ئەوە چییە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! ئەوە باران لێی داوە، فەرمووی: ئەگەر باران لێی داوە، بۆچی ئەوەی کە تەڕ بووە، نەتدەخستە سەری، بۆ ئەوەی خەڵك بیبینێ، {ئێستا خەڵك دێ لێت دەکڕێ، تۆش بۆیان دەپێوی، بەتەڕەکەشەوە، ئەو کاتە کێشەکەی[2] زیاترەو، هەروەها دوایی بۆن خنك دەبێ} .

١) أخرجه مسلم: ١٠٢.

٢) کێش: وزن

دوایی فەرمووی: (مَن غَشَّنَا، فَلَيسَ مِنَّا)، واتە: ئەوەی فێڵمـان لێ بکـا، لە ئێمە نیە، واتە: پێغەمبەری خوا ئەو کارەی بەجۆرێك لە غەش و فێڵ و خیانەت لە قەڵەم داوە.

٣) هەر لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەش هەیە:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

{ثَلاثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمْ اللَّه يوْمَ الْقِيَامة، وَلا ينْظُرُ إلَيْهِمْ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، ولَهُمْ عذَابٌ أليمٌ، قَالَ: فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللهِ ثَلَاثَ مـرَار، قَـالَ أَبُـو ذَرٍّ: خَـابُوا وَخَسـرِوا، مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَـال: الْمُسْـبِلُ، وَالْمَنَّـانُ، وَالْمُنَفِّـقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلفِ الْكَاذِب} [1].

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك سێ جاران لەسەریەك فـەرمووی: سـێ کەس لەڕۆژی قیامەتدا، خوا نایاندوێنیّ و، تەماشاشیان ناکـات، {واتـە: بە چاوی مەرحەمەت} و، پاکیشیان ناکاتەوەو، ئازارێکی بـە ئێشیشـیان بۆ هەیە. {سێ جاران پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسـلم) ئـەوەی دووبـارە کردەوە}، (أبو ذر) گوتی: ئەوانە بەدبەختن‌و زیانمەندن، ئەو کەسانە کـێن، ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسـلم)!؟ فـەرمووی: سـێ جـۆرە کەسـن: (الْمُسْبِلُ) ئەو کەسەی پۆشاکەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ، (وَالْمَنَّانُ) هەروەها ئەو کەسە کە چاکە لەگەڵ خەڵکدا دەکات و دوایـی بەچـاویاندا دەداتەوە، {باسـی دەکـات لەملاولـەولا}، (وَالْمُنَفِّـقُ سِـلْعَتَهُ بِـالْحَلفِ الْكَاذِب)، هەروەها کەسێك کە بەسوێندی درۆ شمەکەکـەی خـۆی، کـەل و پەل و کاڵاکەی خۆی ساغ دەکاتەوە.

---

١) أخرجه مسلم: ١٠٦.

سوێندی بەدرۆ دەخوات بۆ ئەوەی خەڵك باوەڕو متمانەی پێ بکات و، بە سوێندی بەدرۆ کاڵایەکەی بە نرخێکی زیاتر لە نرخی شایستەی خۆی دەفرۆشێ، خەڵکیش لەبەر سوێندەکەی، کە سوێندی بەدرۆیە، بڕوای پێ دەکەن.

ئەو سێ جۆرە کەسە:

١) کەسێك کە بەفیزو کەشخە، پۆشاکی خۆی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ.

٢) کەسێك کە منەت دەکات لەسەر خەڵك، کاتێك کە چاکەیان لەگەڵدا دەکا.

٣) کەسێك کە بەسوێندی بەدرۆ کاڵاو شمەکەکەی بەسەر خەڵکدا ساغ دەکاتەوە، بە نرخێکی زیاتر لە نرخی خۆی.

ئەو سێ جۆرە کەسە، خوای دادگەر لەڕۆژی قیامەتدا، نایاندوێنێ و، تەماشایان ناکات و، پاکیان ناکاتەوەو، سزایەکی بەئێشیشیان هەیە.

بەڵام لێتان تێك نەچێ! (الْمُسْبِل)، واتە: ئەو کەسەی کە پۆشاکی خۆی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ، ئەوە عادەتێکی عەرەبەکان بووە، هەیانبووە، نەفەری تایبەتی هەبووە، لە پشتیەوە ڕۆیشتوەو، زیادەی پۆشاکەکەی بۆ هەڵگرتوە، بۆیە وا دەڵێم، چونکە هەندێك کەس لەوانەی کە هەر بەڕواڵەتیی و وشکیی تەماشای فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەن و، تێگەیشتنیان نیە بۆ فەرموودەکان، ورد تێگەیشتنیان نیە، وا دەزانن: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مەبەستی پێی شەڕواڵی کوردیی بووە، یاخود چاکەتو پانتۆڵ بووە! بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو فەرمایشتەکانی دا، باسی (ثوب) یان باسی (إزار)، یاخود (رِداءْ) دەکات، (ثوب) و (رِداءْ) و (إزار) بەو پۆشاکە دەگوترێ: کە بەسەرخۆدا دادراوە، عەرەبەکان عادەتیان وابووە، هەبووە مەترێك

یان زیاتر پۆشاکەکەی لەدوای خشاوە، هەبووە نەفەری تایبەت پۆشاکەکەی بۆ هەڵگرتوە لەدواوە! مەبەست پێی ئەوەیە، مەبەست پێی شەڕواڵ نیە، چونکە ئەو کاتە (سروال)یشیان هەبووە، کە لە بێژەکانی فەرموودەکاندا، وشەی (سروال) نەهاتوە، (إزار) و (رِداءْ) و (ثوب) هاتوون، کە ئەو پۆشاکانەن بەسەرخۆدا دەدرێن.

پاشان کەسێکیش شەڕواڵی، بەڵکو پۆشاکەکەشی درێژ بێ، بەڵام بۆ فیزو کەشخە وانەکا، وەبەر ئەو حوکمە ناکەوێ، چونکە ئەبووبەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، لە (صحیح البخاري)[1]یدا هاتوە، گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)! (إِنَّ ثوبي يَسْتَرْخِي إِلَّا أَنْ أَتَعَاهَده) واتە: پۆشاکەکەی من دادەکەوێ و، لە زەوی دەخشێ، مەگەر ئاگام لێی بێ! فەرموی: (إِنَّكَ لَسْتَ مِمَّن يفعله خيلاء)، واتە: بێگومان تۆ لەوانە نی کە بەفیزو کەشخە وابکەن، یانی: قوماشەکە درێژ بڕدراوەو، وایەو، بەفیزو کەشخە واناکەی.

چونکە لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: (مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاء)[2]، هەر کەسێك پۆشاکەکە بەدوای خۆیدا ڕاکێشێ بەفیزو کەشخە، بەڵام کە بەفیزو کەشخە نەبێ، کابرا وای بۆ دووراوە، تۆزێك لە ئەندازەی خۆی درێژترە، بەتایبەتی شەڕواڵی کوردییو، چاکەتو پانتۆڵ، هەر ناگرێتەوە، خەڵك دەبێ بزانێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مەبەستی چ پۆشاکێك بووەو، لە چ جێگەیەکدا ژیاوە، دەبێ وەك پێغەمبەری خوا مەبەستی بووە، ئاوا لێی تێ بگات، نەك بێنێ فەرمایشتەکان بەسەر ژینگەیەکی دیکەدا، بەسەر جۆرە پۆشاکێکی دیکەدا بچەسپێنێ، دوایی خەڵك سەراسیمەو عاسێ بکات! ئایا لە

---

١) أخرجه البخاري: ٥٤٥١، ومسلم: ٢٠٨٧.
٢) أخرجه البخاري: ٥٤٥١، ومسلم: ٢٠٨٧.

ئەسکیمۆ و سیبیریا و، لەو شوێنانەی کە زۆر ساردن، دەکرێ بەخەڵك بڵێین: دەبێ پۆشاکەکەتان هەتا نیوەی لوولاکتان (إلى نصف الساق) بێ؟! نەخێر، بە تەئکید ئەوە ناگونجێ، کەواتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەبەستی پێ ئەوە نەبووە، بەڵکو مەبەستی پێ پۆشاکی عەرەبیی بووە، ئەو پۆشاکەی کە لەسەر جلان بەخۆدا دەدرێ، تەنیا ئەوەش بەدوای خۆدا ڕادەکێشرێ، ئەگەرنا شەرواڵ لەدوای خۆ ڕاناکێشرێ، هەروەها پانتۆڵ ناگونجێ بەدوای خۆیدا ڕابکێشرێ.

## بڕگەی چوارەم: مافەکانی بازاڕ و ڕێ و بان:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ڕێ و بان و بازاڕو شوێنە گشتییەکاندا، فەرموویەتی:

{إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ فِي الطُّرُقَاتِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, مَا لَنَا مِنْ مَجَالِسِنَا بُدٌّ نَتَحَدَّثُ فِيهَا، قَالَ: فَأَمَّا إِذَا أَبَيْتُمْ إِلا الْمَجْلِسَ, فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ, فَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ؟ قَالَ: غَضُّ الْبَصَرِ، وَكَفُّ الأَذَى، وَرَدُّ السَّلامِ، وَالأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ، وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ}[1].

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: خۆتان بپارێزن لە دانیشتن لەڕێو بابان، {شوێنی سەرە ڕێی خەڵك و شوێنی گشتی}، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! شوێنی دانیشتنمانەو ناگونجێ، دەبێ هەر دابنیشین لەو شوێنانە، پێویستییمان پێیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەگەر هەر

١) أخرجه البخاري: ٦٢٢٩، ومسلم: ٢١٢١.

ناچار بوون دابنیشن، حەقی ڕێگا بدەن، گوتیان: حەقی ڕێگا چییە، ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ؟ فەرمووی:

١) چاوی خۆ پاراستن لەڕوانینی حەرام.

٢) ئازاری خۆگێڕانەوە لە خەڵك، {واتە: توانجو پلار لە خەڵك نەگرتن و، ئازاری خەڵك نەدان، توێکلە مۆز بۆ خەڵك فڕێ نەدان و، پێنەکەنین پێیان؟

٣) وەڵامدانەوەی سلاو.

٤) فەرمان کردن بە پەسند.

٥) ڕێگریی کردن لە نا پەسند.

واتە: ئەو پێنجە حەقی ڕێگان، ئەگەر هەر دانیشتن لەسەر ڕێگایان، لە شوێنە گشتییەکان، ئەو جۆرە حەقانە بدەن و، بەو پێنج ڕەوشت و ئەدەبە مامەڵە بکەن.

ئاڵقەی پازدەیەم:

## ئەدەبی بەڕێدا ڕۆیشتن و سەردان و سلاوكردن و چاك و چۆنیی

بەڕێزان!

چوار بابەت لەم ئاڵقەیەدا دەتوێژینەوە، هەركامیان لـە بڕگەیەكی تایبەت دا:

١) بەڕێگادا ڕۆیشتن.

٢) سەردانو زیارەتی لای خەڵك.

٣) سڵاوكردن.

٤) چاكو چۆنییو تۆقە لەگەڵ دا كردن.

## بڕگەی یەكەم: بەڕێگادا ڕۆشتن:

١) خوا (سبحانە وتعالى) بەمجۆرە پێناسەی بەندە شایستەكانی خۆی دەكا:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا ﴾الفرقان: ٦٣.

واتە: بەندەكانی خوای خاوەن بەزەیی، ئەوانەن كە بە هێمنیی بە ڕێ دا دەڕۆن.

یەكەمین وەصف و خەسڵەت، كە خوای زانا بەندە چاكەكانی خۆی پێ پێناسە دەكا، چۆنیەتی ڕۆیشتنیانە، كەواتە: بەڕێگادا ڕۆیشتنیش، كارێكە، ئەدەبی بەرز و ڕەوشتی پەسندی پێویستە! دەبێ ئینسان بزانێ: چۆن بەڕێ دا دەڕوا، خوای میهرەبان دەفەرموێ: بە هێمنیی و ویقارەوە، بەڕێ دا بڕۆن.

٢) هەر لەوبارەوە، خوای تاك و پاك لە سووڕەتی (لقمان)داو، لەسەر زمانی لقمان (خوا لێی ڕازی بێ)، كە ئامۆژگاریی كوڕەكەی دەكا، لەنێو ئامۆژگارییەكانی دا پێی دەڵێ: ﴿ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ ﴾ لقمان:١٩، واتە: بەشێوەیەكی میانگیر بەڕێیەدا بڕۆ، یانی: با ڕۆیشتنەكەت بەشێوەیەكی میانگیر بێ، نە زۆر پەلە پەل بكە، كە لاقت لەبەریەك بئاڵقێن، نە زۆریش بە مردەلۆخەیی و بە سستیی بەڕێیەدا بڕۆ، بەڵكو بەشێوەیەكی میانگیر.

٣) هەروەها خوا (سبحانە وتعالى) دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ ﴾ الإسراء: ٣٧ .

واتە: بەفیزو کەشخە بەڕێ دا مەڕۆ، چونکە تۆ زەوییت بۆ نادڕێ و، بە بەرزیی چیاکانیش هەڵناگەی.

یانی: نە هێندەی چیایان بەرز دەبی، نە زەوییشت بۆ دەدڕێ، بۆچی فیزو کەشخە دەکەی؟ بە ئارامییو هێمنیو ویقارەوە بەڕێیەدا بڕۆ.

٤) پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) بەتایبەت بۆ چۆنیەتی ڕۆیشتن بەرەو نوێژو بەرەو مزگەوت، دەفەرموێ:

{إِذَا أُقِيمَت الصَّلَاةُ فَلَا تَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَسْعَوْنَ، وَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَمْشُونَ، وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا} (١) .

واتە: ئەگەر نوێژ بەرپا کرا، {واتە: قامەت خوێندرا بۆ نوێژ}، بە پەلەپەل مەچن بۆ نوێژ، {بەڕاکردن}، بەڵکو بە ڕۆیشتنی ئاسایی بچن و، بە سەکینەتو هێمنیی بچن، ئنجا ئەوەندەی فریای کەوتن نوێژەکەتان بکەن و، ئەوەندەی کە لە دەستتان چوو، دوایی تەواوی بکەن.



---

١) رواه البخاري: ٩٠٨، ومسلم: ٦٠٢.

## بڕگەی دووەم: سەردان کردن

١) لەبارەی سەردانو هاموشۆی یەکدییەوە، کە دەبێ چۆن بێ؟ خـوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (النور)، ئایەتی (٢٧-٢٨)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾

خوا (سبحانه وتعالى) هەموو شتێکی فێری ئیمانداران کـردوە، هــەموو شـتە بنەڕەتییەکانی، کە پێویستمانن بۆ دینداریی‌و دنیاداریی، فێری کردووین، لێرەدا دەفەرموێ: ئەی ئەوانــەی بڕواتــان هێنــاوە! {بڕواتــان هێنــاوە بــە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ}، مەچـنە ماڵانێـك جگە لە ماڵــەکانی خۆتــان، تــاکو مۆڵــەت وەرنــەگرن‌و دڵنیـا نــەبن کــە کاتەکەی گونجاوەو سڵاو لە خەڵکەکەی نەکەن.

﴿تَسْتَأْنِسُواْ﴾، زۆربەی هەرەزۆری ڕوونکەرەوانی قورئــان بــە: (تسـتأذنوا) (تاکو مۆڵەت وەرنەگرن) مانایان کـردوە، بــەڵام لــە ڕاسـتییدا ماناکــەی قووڵترە لە مۆڵەت وەرگرتن، بەڵێ مانای مۆڵەت وەرگرتنیش دەگەیــەنێ، بەڵام وێڕای وی، ئەوەش دەگەیەنێ کە تۆ دەبێ بە سەلیقەی خۆت بزانــی، ئایا ئەو کاتە کاتێکی گونجاو و شایستەیە بۆ سەردانی ئــەو شــوێنە، یــان نا؟ چونکە جاری وایە، کە تۆ مۆڵەتت وەرگـرت، هــەر دەڵـێن: فــەرموو،

بەڵام ئەگەر کاتەکەی گونجاو نەبێ و، خەڵکەکە مورتاح نەبن، کاتی ئیسراحەتیان بێ، کاتی خەویان بێ، یاخود بەشتێکی دیکەوە سەرقاڵ بن، تۆ دەبێ هێندە سەلیقەت هەبێ، لەکاتێکدا کە گونجاو نیە، مۆڵەت وەرنەگری.

کەواتە هەر تەنیا مۆڵەت وەرگرتن بەس نیە، ئنجا دەبێ سڵاویش لە خەڵکەکە بکەی، ئنجا بچنە بچیە ژوور.

﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، ئەوە بۆ ئێوە باشترە، بەڵکو پەند وەربگرن، بیرتان بێتەوە.

﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾، ئنجا ئەگەر کەستان لەو ماڵەدا نەبینی، مەچنە تێی، هەتاکو مۆڵەت دەدرێن، ﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا﴾، ئەگەر پێشتان گوترا، بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە. ئەگەر گوترا ئێستا مەجال نیە، دەرفەتمان نیە، بۆمان ناگونجێ، نابێ بڵێی: نەخێر هەر دێم، یان خۆت توورە بکەی، خۆت لالووت بکەی، بەڵکو بە لەباریی بگەڕێوە، ئەسڵەن مۆڵەت وەرگرتن بۆ ئەوەیە، کە ئەگەر بواریان نەبوو گوتیان: بگەڕێوە، بگەڕێیەوە، ئنجا ئەگەر پێیان خۆش بێ‌و پێیان ناخۆش بی، هەر بچێ، پێویست بە مۆڵەت وەرگرتن ناکات.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ﴾، ئەوە بۆ ئێوە پاك‌و چاکترە، {کە ئەگەر پێتان گوترا بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە}. ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾، خواش زانایە بەوەی کە دەیکەن.

٢) ئنجا پێویستە ئەوەش بزاندرێ، کە مۆڵـەت وەرگـرتن بـۆ چـوونە مـاڵی یەکـدی، ئـەویش شـێوەی خـۆی هەیـە، پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{الإِسْتِئْذَانُ ثَلَاثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ وَإِلَّا فَارْجِعْ} [1].

واتە: مۆڵەت وەرگرتن سێ جارانە، ئەگـەر مۆڵـەت درای بچـۆ، ئەگـەرنا بگەڕێوە.

واتە: سێ جاران بۆت هەیە لە دەرگـا بـدەی، لـە جـەرەس بـدەی، سـڵاو بکەی، ئەگەر بزانی گوێیان لێیە، هەرچەندە مۆڵەت وەرگـرتن جیایـە لـە سڵاوکردن، مۆڵەت وەردەگری دوایی سڵاو دەکەی، واتە نەك بچی دە(١٠) جاران هەر لە دەرگا بدەی، هەر جەرەس لێ بـدەی، هـەر تەلـەفۆنیان بـۆ بکەی! بەڵکو تەنیا سێ جاران، ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە بگەڕێوە.

٣) هەروەها ئەدەبێکی دیکەی مۆڵەت وەرگرتن ئەوەیە، کـە بۆیـە مۆڵـەت وەردەگری بچیە ژووری، تاکو بەسەریاندا نەکەوی و، تەماشـایان نەکـەی، وەك لە فەرمایشتی (صحيح)دا هاتوە:

{إِنَّمَا جُعِلَ الإِسْتِئْذَانُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَـرِ} [2]

واتە: مۆڵەت وەرگرتن، لەبەر تەماشاکردن دانراوە.

بۆ نموونە: لەوکاتەدا ئەو مرۆڤە پێی خۆش نیە تۆ بیبینی، لەگەڵ خێزانـی کۆبۆتەوە، یان خۆی دەشوات، یان خێزانی ئیسراحەتی کردوە، یان کچـیان هەن، حەزناکەن خەڵك چاویان پێیان بکەوێ، بۆیە مۆڵەت داندراوە.

---

١) رواه البخاري: ٦٢٤٥، ومسلم: ٢١٥٣.

٢) (صحيح البخاري: ٦٢٤١، وصحيح مسلم: ٢٢٥٦).

٤) هەر لەو بارەوە لە فەرمایشتی دیکە[1]دا هاتوە، کە جارێـك پیاوێـك لـە کەلێنی دەرگاوە تەماشای ماڵی پێغەمبـەر (صلى اللـه عليـه وسـلم) دەکـات، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) شتێکی پێ دەبێـت، شـانەیەك، یـان شتێك کە سەری پێ دەخورێنێ، دەفەرموێ: لێی دەخەفتام کە بەچـاوی دا بکەم، چونکە پێی ناخۆش بووە! مۆڵەت وەرگرتن بۆ ئەوەیە کـە تەماشـا نەکەی، ئنجا تۆ کە لە کونی دەرگاوە تەماشات کرد، ئەدی بۆچی مۆڵەت وەردەگری؟! ئەوانە هەموویان ئەدەبی پێویسـتن و گرنگـە ڕەچـاو بکـرێن، لەکاتی هاموشۆو سەرداندا.

١) {«عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁، أَخْبَرَهُ أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ فِي جُحْرٍ فِي حُجْرَةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَـعَ رَسُـولِ اللهِ ﷺ مِـدْرًى يُخَلِّلُ بِهَا رَأْسَهُ، فَرَآهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْظُرُنِي لَطَعَنْتُ بِهَا فِـي عَيْنَيْـكَ، وَقَـالَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَـا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْلِ النَّظَرِ»} أخرجه الدارمي برقم: (٢٤٣٥).

## بڕگەی سێیەم: سڵاوکردن:

خوا (سبحانه وتعالى) وەك بنچینەیەکی گشتی دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ﴾النساء:٨٦.

واتە: ئەگەر سڵاوتان لێ کرا، لەهەر کەسێکەوە، بە سڵاوکردنێك، بەباشتر لەخۆی، یان وەك خۆی، وەڵامی بدەنەوە.

یانی: کەسێك مسوڵمانە یان نامسوڵمانە، سڵاوت لێ دەکا، بەباشتر لە سڵاوەکەی ئەو وەڵام بدەوە، یان بەلای کەمەوە وەك خۆی وەڵامی بدەوە.

لەبارەی سڵاوکردنەوە، کە تۆ دەستپێشخەربی، لەو بارەوە ئەم فەرمایشتە دێنین:

١) {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو العاص رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم): أَيُّ الإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ} [١].

(عبدالله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاص دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کرد: چ جۆرە مسوڵمانەتییەك باشترە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە خواردن بدەی بە خەڵك و، سڵاو بکەی لە کەسێك کە دەیناسی، لە کەسێکیش کە نایناسی.

---

١) رواه البخاري: ١٢، ومسلم: ٣٩.

بێگومان مەبەست لە (أَيُّ الإِسْلَامِ خَيرٌ؟) یانی: چ بەش و ئەرکێکی ئیسلام و مسوڵمانەتیی باشترە؟

هەڵبەتە سڵاوکردن هەر ئەوە نیە بڵێی: (السلام علیکم)، بەڵکو یانی: سەردانیشیان بکەی و هەواڵیشیان بپرسی.

٢) هەر لەبارەی سڵاوکردنەوە ئەو فەرمایشتەش هەیە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

{لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلامَ بَيْنَكُمْ} [1].

واتە: ناچنە بەهەشت تاکو بڕوا نەهێنن، بڕواش ناهێنن تاکو یەکدیتان خۆش نەوێ، ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر کردتان، ببێتە هۆی یەکدی خۆشویستنتان؟ سڵاو لە یەکدی کردن بڵاو بکەنەوە.

جارێکی دیکەش بۆ جەخت لەسەرکردنەوە دووبارەی دەکەینەوە: مەبەستی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لە وشەی: (سڵاو لەیەکدی کردن) هەر ئەوە نیە بەکەسێك یان کەسانێ: بڵێی سڵاوت لێبێ، (السلام علیکم)، بەڵکو سەردانو هاموشۆو تێکەڵیی و، هەواڵپرسینیش دەگرێتەوە.

---

١) رواه مسلم: ٥٤.

**٣)** لـەبارەی چـۆنیەتی سـڵاوکردنەوە، پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) لـە فەرمایشتێکی دا بۆمان ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

{يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى القَاعِدِ، وَالقَلِيلُ عَلَى الكَثِيرِ - وفي روايةٍ للبخاري -والصغير على الكبير}[١].

واتە: سوار سڵاو لە پیادە دەکات و، پێڕۆ لـە دانیشـتوو، {کەسێك کـە دەڕوات، سڵاو لە کەسێك دەکا کە دانیشـتوە} و، کـەم سـڵاو لـە زۆران دەکەن، {دوو نەفەر دەگەنە شەش-حەوتێك، دەبێ دووەکان سڵاو بکـەن، یـەك دەگاتـە دووان، یەکەکـە سـڵاو لـە دووەکـان بکـا} -هـەروەها لـە ڕیوایـەتێکی بوخـاریی دا هـاتوە، گچکـەش سـڵاو لـە گـەورە دەکـا- {کەسێکی بە تەمەنتر، یەکێکی لەخۆی بێ تەمەنتری دەگـاتێ، واباشـە، کەم تەمەنەکە پێشێ سڵاو بکا لەوی دیکە.



١) رواه البخاري:٦١٣٢، ومسلم: ٢١٦٠.

## بڕگەی چوارەم: تۆقەکردنو چاكو چۆنیی:

١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:
{مَا مِنْ مُسْلِمْين يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصافَحَانِ، إلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أنْ يَفْتَرِقَا}[١].

واتە: هیچ کاتێك دوو مسوڵمان ناگەنە یەکدی، پێکەوە تۆقە ناکەن، مەگەر بەر لەوەی لێك جیا ببنەوە، لێیان بووردراوە {گوناهەکانیان لێ هەڵوەریون و، خوا چاوپۆشیی لێ کردوون}.

٢) هەر لەوبارەوە ئەو فەرمایشتەش هەیە:
{عَنْ أنس رضي الله عنه قال: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، الرَّجُلُ مِنَّا يَلْقَى أَخَاهُ، أَيَنْحَنِي لَهُ؟ قَالَ: لا، قَالَ: أَفَيَلْتَزِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ؟ قَالَ: لا، قَالَ: أَفَيَأْخُذُ بِيَدِهِ وَيُصَافِحُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ}[٢]

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! پیاوێك لە ئێمە بەبرایەکەی دەگات، ئایا بۆی بچەمێتەوە؟ {بۆی بچێتە ڕکووع؟} فەرمووی: نا، گوتی: ئەدی بەخۆیەوە بگوشێو ماچی بکا؟ فەرمووی: نا، گوتی: ئەدی دەستی بگرێو تۆقەی لەگەڵ بکات؟ فەرمووی: بەڵێ.

---

١) رواه أبو داود: ٩٤٢، والترمذي: ٦١٣، وصححه الألباني.
٢) رواه الترمذي: ٢٧٢٨، وحسّنه.

هەڵبەتە لە فەرمایشتی دیکەشدا هاتوە، کە دەشگونجێ ئینسان برای مسوڵمانی خۆی ماچ بکا، نێوچەوانی ماچ بکات، یان کەسێك لەخۆی بەتەمنترە دەستی ماچ بکات، بەڵام لێرەدا ئەو فەرمایشتە ئاوا هاتوە، کە وەك بنچینەی گشتی، تۆقەکردن هەیە لە نێوان مسوڵمانانندا، پیاوان لەگەڵ پیاوان و، ئافرەتان لەگەڵ ئافرەتان دا.

٣) هەر لە بارەی چاكو چۆنییو تۆقەکردنەوە، دەربارەی لەبەریەکدی هەستان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:
{مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَمْثُلَ لَهُ الرِّجَالُ قِيَامًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ} (١)
واتە: هەرکەسێك حەز بکات پیاوان دەستەو نەزەر بۆی بوەستن، دەست لەسەر سینگ، با شوێنی خۆی لەنێو ئاگردا دابنێ.
ئەم فەرموودەیە پێویستە ئەو شێخانەی موریدو دەروێشو صۆفییەکانی خۆیان وا ڕاهێناوە، دەستەو نەزەر بە پێوە بۆیان بوەستن، واباشە باش ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حاڵیی بن و، خۆیشم هەر شێخێکم بینیبێ-بەگوێرەی دەرفەت و بۆلوان- لەوبارەوە هۆشدارییم پێداوە، ئەگەر لە مەجلیسیاندا ئامادەبووبم، چونکە لە ڕاستییدا گەورەترین ئەدەب لەگەڵ شێخ دا، ئەوەیە کە بابای مورید و دەروێش و سۆفیی، پێشێ بەقسەی ئەو پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) بکات، کە ئەو شێخە، یان ئەو مامۆستایە لە شوێنی دانیشتوە، پێشێ دەبێ فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) جێ بەجێ بکرێ. ئنجا بێگومان شێخ نابێ ڕێ بدات، بەشێوەیەك مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، کە

---
١) رواه الترمذي: ٢٧٥٥ وحسّنه، وأبوداود: ٥٢٢٩.

پێچەوانەی فەرمایشتی پێغەمبەرە (صلی اللە علیە وسلم) و، عادەتی عەجەمەکانە، واتە: عادەتی نامسوڵمانانە، وەك لەم فەرمایشتەدا دیارە:

٤) {عَنْ جَابر: اشْتَكَى رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم)، فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ وَهُوَ قَاعدٌ، وَأَبُو بَكْرٍ يُسْمِعُ النَّاسَ تَكْبِيرَهُ، فَالْتَفَتَ إِلَيْنَا، فَرَآنَا قيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْنَا، فَقَعَدْنَا، فَصَلَّيْنَا بِصَلَاته قُعُودًا، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: إِنْ كِدْتُمْ آنفًا لَتَفْعَلُونَ فعْلَ فَارِسَ، وَالرُّومِ، يَقُومُونَ عَلَى مُلُوكِهِمْ وَهُمْ قُعُودٌ، فَلَا تَفْعَلُوا} (١).

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) نەخۆش بوو، {نەیتوانی بەپێوە بوەستێ بۆ نوێژ}، ئێمە لە پشتیەوە نوێژمان کرد بەپێوە، ئەویش دانیشتبوو، ئەبووبەکریش (خوا لێی ڕازی بێ) (اللّٰه أکبر)ەکانی پێغەمبەری (صلی اللە علیە وسلم) بە ئێمە دەگەیاندن، {دەنگی بەرزدەکردەوە، بۆ ئەوەی ئاگامان لە جووڵەکانی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) بێ: چوونە ڕکووع و سەجدەو، بەرزبوونەوەو نزمبوونەوە}، پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) ئاوڕی دایەوە، ئێمەی بەپێوە بینی، ئاماژەی بۆ کردین: دانیشتین، ئێمەش بە دانیشتنەوە نوێژمان لە خزمەت پێغەمبەردا (صلی اللە علیە وسلم) کرد، کاتێك سڵاوی دایەوە فەرمووی: تۆزێك پێش ئێستا خەریك بوو، وەك فارس و ڕۆم بکەن، {فارس و ڕۆم ئەو کاتە کافر بوون، واتە خەریك بوو وەك کافرەکان بکەن}، کە لەسەر سەری پادشاکانیان ڕادەوەستن، ئەوانیش دانیشتوون، ئنجا وا مەکەن.

واتە: کاتێك کە ئیمام دانیشتوە، ئێوەش دابنیشن، تەنانەت لە نوێژیشدا.

١) أخرجه النسائي: ١٢٠٠، وابن ماجه: ١٢٤٠، وأخرجه أيضًا: ابن خزيمة: ٤٨٦، وأحمد: ١٤٦٣٠.

هەڵبەتە لەو بارەوە ڕاجیاییەكی فیقهیی هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆخۆی دووربینیی(إحتیاط)ی كردوە.

٥) هەر لەوبارەوە ئەوەش هەیە، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی پێشوازیی لێكردنی (سعد بن معاذ) و هێنانەخواری لە ولاخ، -بریندار بوو- فەرموویەتی: {قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ} [1] واتە: هەڵسن بۆلای گەورەكەتان، بیهێننە خوار.

ئنجا زانایان دەڵێن: (قیام للقادم) ئەوەیە كە تۆ لەبەر كەسێكی هاتوو هەڵسیو بۆ پێشوازیی بچی، ئەوە شتێكی پەسندەو سوننەتە، بەڵام (وقوف للقاعد) كەسێك كە دانیشتوە، تۆ لەسەر سەری بوەستی دەستەو نەزەر، ئا ئەوەیانە كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی كردوەو نەهی لێ كردوە، كە بەداخەوە وشكە حاڵیبوونی هەندێك كەسی نەزانی بە نەزانیی خۆنەزان، ئەو دوو حاڵەتەی پێكەوە تێكەڵ كردوون و، لە ئەنجامی ئەو كەچفامییەدا، دووچاری هەڵسوكەوتی هەڵەو كرچ و كاڵی سەیر و سەمەرە بوون!



١) أخرجه البخاري: ٢٨٧٨، ومسلم: ١٧٦٨.

## ئاڵقەی شازدەیەم:

# ئەدەبی كۆڕو مەجلیس

بەڕێزان!
لە بواری ڕەوشتو ئەدەبەكانی كۆڕو مەجلیسدا، -كە ئەم ئاڵقەیەمان بۆ تەرخانكردوە- باسی ئەوە دەكەین، كە ئایا مرۆڤی مسوڵمان لەكاتێكدا كە دەچێتە كۆڕو مەجلیسێكەوە، یان لە كۆڕو مەجلیسێكدا ئامادە دەبێ، پێویستە چ ئەدەبێك و، چ ڕەوشتێك لەخۆیدا بپشكوێنێ و، بە چ جۆرە ئەدەبو ڕەوشتێكی بەرزو جوان مامەڵە بكا، لەگەڵ ئەو كەشو بارودۆخەدا كە تێیدایە، كە بریتیە لە كۆڕو مەجلیسێك.
بە كورتییو لە حەوت (٧) بڕگەدا باسی ئەو بابەتە دەكەین:

## بڕگەی یەکەم: ئایا دەبێ مسوڵمانان لە کۆڕو مەجلیس دا، چۆن پێکەوە هاوکاربن و، شوێنی یەکدی بکەنەوەو، پێویستە چ پێوەرێك ڕەچاو بکەن، بۆ ئەوەی کێ لە پێشتر بێ و، کێ لەکوێ بێ؟!

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (المجادلة)-١١-دا، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ١١ ﴾.

ڕاستە واتای ئەم ئایەتە موبارەکە بەمشێوەیە:

خوا(عز وجل) دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکاتێك لە کۆڕو مەجلیس دا پێتان گوترا: جێگا بکەنەوە{بۆ کەسانی دیکە}، جێگا فراوان بکەن، خوا جێو ڕێ تان بۆ فراوان دەکا، {یاخود: دڵو دەروونتان فراوان دەکا، یاخود: لە بەهەشت دا شوێنتان فراوان دەکا}.

هەروەها هەر کاتێك پێتان گوترا: هەڵسن لەو شوێنە، هەڵسن، خوا ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوە، بەرزیان دەکاتەوەو، ئەوانەتان کە زانستیان پێدراوە، بەچەندان پلە بەرزیان دەکاتەوە، {واتە: زیاتر لە بڕوادارانی گشتی} و، خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن.

ئەم ئایەتە موبارەکە، لێی وەردەگیرێ، کە مسوڵمانان کاتێك دەچنە کۆڕ ومەجلیسێکەوە، پێویستە شوێنی یەکدی بکەنەوە، ﴿إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ

﴿فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ﴾، ئەگەر پێتان گوترا، شوێن فراوان بکەنو، جێگە بکەنەوە، کەسێك کە دێ شوێنی بکەنەوە، هەروەها لەکاتێکدا کەسێك لە شوێنێکەو، یەکێکی دیکەی لەو شایستەتر دێ، شایستەتر بەهۆی تەمەنەوە، بەهۆی نەخۆشییەکەوە، یان بەهۆکاری کەمئەندامیی، یان بەهۆی زانستەوە، بەهۆی یەکێك لەو پێوەرانەوە, کە لە ئیسلامدا کراون بەپێوەر، وەك: تەمەن، پێداویستیی تایبەتو کەمئەندامیەتیی، پێویستیی بە هاوکاریی بوون، پلەو پایەی زانستیی، کەسێك لە شوێنێك دانیشتوە، بەلاّم یەکێکی دیکەی لەو جۆرانە دێ، ئەگەر پێتان گوترا: لەوێ هەڵسن، هەڵسن و، لەسەر دڵتان قورس نەبێ.

دوایی خوا (سبحانه وتعالى) ڕایدەگەیەنێ، کە بە گشتی بڕواداران بەرز دەکاتەوە: ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ﴾، بەگشتی ئەهلی ئیمان بەرزن لەلای خوا، خوا پلەو پایەی بەرزیان پێ دەبەخشێ، لە بەهەشتدا، ﴿وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ﴾، بەلاّم ئەوانەی کە زانستیان پێدراوە، بە چەندان پلە بەرزیان دەکاتەوە، واتە ئەوان لەلای خوای دادگەر و کارزان پلەو پایەیان بەرزترە، هەڵبەتە بە مەرجێك کە بەپێی زانستەکەیان ڕەفتار بکەن و، پێی بەڕێوە بچن، ئەگەرنا زانیارییەك خاوەنەکەی کاری پێ نەکا، لەجیاتی ئەوەی پێی بەرزبێتەوە، پێی نزم دەبێتەوەو، لەجیاتی ئەوەی بۆی ببێتە بەڵگە، لەسەری دەبێتە بەڵگە.

**بڕگەی دووەم: یەکەمین ئەدەبی مەجلیس بریتیە لە سەلام کردن:**

خوای تاك و پاك دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ النور: ٦١.

واتە: {ئەی بڕوادارینە!} ئنجا هەر کاتێك چوونە ماڵانێکەوە، ئەوە سڵاو لەخۆتان بکەن، سڵاوێك لەلایەن خواوە، کە بەپیت و پیرۆز و پاك و چاکە، خوا بەو شێوەیە ئایەتەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕۆشن دەکاتەوە، بەڵکو بفامن.

واتە ئینسان کە دەچێتە کۆڕو مەجلیسێك، دەبێ سڵاو بکا، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿فَسَلِّمُوا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ﴾، سڵاو لەخۆتان بکەن، واتە: براو خوشکەکانیشت کە لەوێن و، سڵاویان لێ دەکەی، وەك ئەوەیە سڵاوت لەخۆت کردبێ.

هەندێ لە زانایانیش وایان لێ فامیتەوە، لەم ئایەتە موبارەکە، کە تۆ چوویە ماڵ، یان چوویە هەر شوێنێك، ئەگەر کەسیشی لێ نەبێ، سڵاو بکە، بڵێ: (السلام علينا وعلى عبادالله الصالحين)، سەلام لە ئێمە و لە بەندەچاکەکانی خوا، پێویستە لە هەموو حاڵان دا سڵاو هەر بکرێ.

## بڕگەی سێیەم: نابێ هیچ کەسێك لەشوێنی خۆی هەڵستێنرێ و، یەکی دیکە شوێنەکەی دابنیشێ:

هەڵبەتە -وەك پێشتر باسمان کرد-: بابایەکی ڕیش سپی و، بەرپرس و، مشوورخۆر، دەتوانێ بە یەکێك بڵێ: هەڵسە، بێ زەحمەت با فلان کەس لەوێ دابنیشێ، بەڵام نابێ هیچ کەس لەخۆوە کەسێك لە شوێنی خۆی هەڵسێنێ‌و لە شوێنەکەی دابنیشێ.

لەو بارەوەش ئەم دوو دەقە دێنین:

١) {عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُقَامَ الرَّجُلُ مِنْ مَجْلِسِهِ، وَيَجْلِسَ فِيهِ آخَرُ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا}[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕێتەوە، کە: ڕێگریی کردوە، لەوەی پیاوێك لە شوێنی خۆی، لە کۆڕو مەجلیس دا هەڵبستێندرێ و، یەکی دیکەی تێدا دابنیشێ، بەڵام لەجیاتی یەکدی هەڵستاندن، شوێنی یەکدی بکەنەوەو، پاڵ وێك بدەن و، بۆشایی دروست بکەن، {با خەڵکی دیکە لەوێ دابنیشێ}.

کەواتە ئایەتەکە، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ﴾ المجادلة:١١، ئەو گوتران(قیل)ە بۆ کەسێکە کە بەرپرس بێ، بۆ وێنە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کۆڕو مەجلیسەکەدا بووەو، یەکێك لە هاوەڵان هاتوە، ڕیش سپی بووە، یان بەشێوەیەك لە شێوەکان پێویست بووە، کە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)

١) رواه البخاري ٥٩١٥.

نزیکتر بێ، یەکێکی دیکەی کە گەنجێك بووە، یاخود بەشێوەیەك بووە، ئەوی هەڵستاندووەو، ئەوی دیکەی لەشوێن داناوە، بەڵام جگە لەو حاڵەتە هیچ کەس بۆی نیە، لەخۆوە کەسێك لەشوێنی خۆی هەڵسێنێ و بۆ خۆی لە جێیەکەی دا دابنیشێ.

٢) هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە: {إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَجْلِسٍ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ}[١].

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ئەگەر یەکێکتان لە شوێنی دانیشتنی خۆی هەڵسا، {لە کۆڕو مەجلیسدا}، دوایی هاتەوە بۆ ئەو شوێنەی خۆی, ئەوە پێی شایستەترە.

واتە: نابێ یەکسەر یەکێك بچێتە شوێنەکەی دابنیشێ، بەڵکو ئەگەر چووە شوێنەکەشی دانیشت، کاتێك کە ئەو کەسە دەگەڕێتەوە، مادام یەکجاریی نەڕۆییبێ، بۆ وێنە: بۆ ئیشێکی کاتیی چۆتە دەر، یان قسەیەکیان پێ بووە، کە هاتەوە، نابێ شوێنەکەی بگیرێ، دوایی نەزانێ لە کوێ دابنیشێ.



١) أخرجه أحمد: ٧٥٥٨، والبخاري في الأدب المفرد: ١١٣٨، ومسلم: ٢١٧٩، وأبو داود: ٤٨٥٣، وابن ماجه: ٣٧١٧.

## بڕگەی چوارەم: کاتێك مرۆڤ دەچێتە کۆڕو مەجلیسێکەوە، لەکوێ دابنیشێ و، چۆن شوێنی خۆی بکاتەوە؟

لەو بارەوەش دوو دەقی سوننەت دێنین:

١- {عن جابر بن سمرة رضي الله عنه قال: كُنَّا إِذَا أَتَيْنَا النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) جَلَسَ أَحَدُنَا حَيْثُ يَنْتَهِي، أي المجلس} [(١)]

(جابیری کوڕی سەمورە) دەڵێ: ئێمە کە دەچووینە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، یەکێك لە ئێمە دەچوو لەو شوێنە دادەنیشت، کە کۆتایی کۆڕو مەجلیسەکەیە.

واتە: لەکوێ بۆشایی هەبووایە، لەوێ دادەنیشت، یان لەکوێ ڕیزی دانیشتووان تەواو دەبوو، لەکۆتاییەکەیانەوە دادەنیشت.

٢- هەر لەوبارەوە کە ئینسان دەبێ چۆن دابنیشێ، ئەم دەقەش هەیە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لا يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ اثْنَيْنِ ، إِلا بِإِذْنِهِمَا} [٢] واتە: حەڵاڵ و، ڕەوا نیە، بۆ هیچ کەسێك کە دوو کەسان لێك جیا بکاتەوەو، لەنێوانیاندا دابنیشێ، مەگەر بە مۆڵەتی خۆیان.

دەگونجێ بڵێ: ئەرێ مۆڵەتتان لەسەرە، بێمە نێوانتان دابنیشم، ڕەنگە لە هەردووکیان ڕاببینێ، بەڵام بەبێ ئاگاداری خۆیان، یەکسەر بچێتە نێوانیان، خۆیان بترینجێنێتە نێوان، ئەوە شتێکی نارەوایەو، پێچەوانەی ئەدەب و ڕەوشتی مسوڵمانانەی کۆڕو مەجلیسە.

---

١) رواه الترمذي: ٢٧٢٥ وحسّنه.

٢) أخرجه أحمد: ٦٩٩٩، وأبو داود: ٤٨٤٥، والترمذي: ٢٧٥٢ وقال: حسن صحيح.

**بڕگەی پێنجەم: چۆنیەتی قسە پێكەوەكردن لەكۆڕو مەجلیس دا :**

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە دەفەرموێ: { إِذَا كُنْتُمْ ثَلاثَةً فَلا يَتَنَاجى اثْنَانِ دُونَ الآخَرِ حتَّى تَخْتَلِطُوا بالنَّاسِ؛ مِنْ أَجْلِ أَنَّ ذَلكَ يُحزِنُهُ }[١]

.

واتە: ئەگەر سێ كەس بوون لە كۆڕو مەجلیسێك دا، با دووان بەیەكەوە چپە نەكەن، قسەی پەنهان پێكەوە نەكەن، {خۆیان لەوی دیكە جیا بكەنەوە}، هەتا دوایی تێكەڵ بە خەڵك دەبن، یانی: كە تێكەڵ بە خەڵك بوون، قەیناكات دوو دووش پێكەوە قسە بكەن، یان ئەو دووانە بەیەكەوە قسە بكەن، {چونكە ئەویش دەتوانێ لەگەڵ یەكێكی دیكەدا قسە بكات}، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئەوە دڵتەنگی دەكات و دڵی نارەحەت دەبێ، {چونكە: ئەو كەسە ڕەنگە وا گومان بەرێ: باسی ئەو بكەن، یان دەڵێ دەبێ چ شتێك هەبێ لەمنی پەنهان بكەن}، واتە: ئەوەش پێچەوانەی ئەدەبی كۆڕو مەجلیسە، كە كاتێك سێ نەفەر پێكەوە دادەنیشن، دووانیان پێكەوە قسە بكەن، ئەگەر چوار نەفەربن دوو دوو دەتوانن بەیەكەوە قسە بكەن، یاخود ئەگەر زیاتر بن، ئەوكاتە ئەو گرفت و ئیشكالە پەیدا نابێ.

١ أخرجه أحمد: ٤٠٣٩، والبخاري: ٥٩٣٢، ومسلم: ٢١٨٤.

## بڕگەی شەشەم: ئایا لەكاتێك دا ئینسان لە كۆڕو مەجلیسێك دەبێ، كە باس و خواس و قسەو قاڵی زۆری تێدا دەكرێ، واباشە كاتێك لەو كۆڕ و مەجلیسە هەڵدەستێ، چی بڵێ؟!

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە دەفەرموێ: {مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِس فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ، إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ}[1].

واتە: هەركەسێك لە كۆڕو مەجلیسێك دا دانیشت، كە قسەوقاڵی زۆر تێدا بوو، {(لغط) یانی: غەڵبە غەڵبو دەنگە دەنگو، قسەو قاڵ}، بەر لەوەی كە لەو كۆڕو مەجلیسە هەڵسێ، ئەگەر ئەم زیكرەی خوێند: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ) واتە: پاكیی بۆ تۆ ئەی خوایەو، ستایش بۆ تۆ، (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ) شایەتیی دەدەم كە جگە لەتۆ هیچ پەرستراوێك نیە. (أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)، داوای لێبوردنت لێ دەكەم و، بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە. ئەگەر ئەوەی گوت، (إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ). ئەوە حەتمەن هەرچی لەو كۆڕو مەجلیسەدا بوویەتی، لە گوێگرتن لە قسەیەكی خراپ، یان قسەیەكی خراپو ناشایستی بەدەم دا هاتبێ، بەهۆی ئەو زیكرەوە، ئەو وردە گوناهانە لێی دەسڕێنەوەو بۆی دەبوردرێن.

١ أخرجه الترمذي: ٣٤٣٣، وقال حسن غريب صحيح. وابن حبان: ٥٩٤، والبيهقي في شعب الإيمان: ٦٢٨.

## بڕگەی حەوتەم: لەكاتی پێكهێنانی كۆڕ و مەجلیس دا:

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆرجار لە كۆتـایی كـۆڕو مەجلیسـەكانیدا ئەم دوعایانەی دەكردو، بەم شێوەیە دەپاڕایەوە:

{عن ابن عمر (رضي الله عنهما) قال: قَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُومُ مِنْ مَجْلِسٍ حَتَّى يَدْعُوَ بِهَذِهِ الدَّعَوَاتِ: اللَّهُمَّ اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعَاصِيكَ، وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ، وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَا مُصِيبَاتِ الدُّنْيَا، وَمَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا، وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا، وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا، وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا، وَلَا تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا، وَلَا تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا، وَلَا مَبْلَغَ عِلْمِنَا، وَلَا تُسَلِّطْ عَلَيْنَا مَنْ لَا يَرْحَمُنَا}[١].

عبداللە ی كوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: كەم وا هـەبووە پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) لە كۆڕو مەجلیسێك هەڵسێ، هەتاكو ئەم دوعایانە نـەكات و، بەم شێوەیە لەخوا نەپاڕێتەوە:

ئەی خوایە! ئەوەندە ترس‌و سام‌و هەیبەتی خۆتمان پـێ ببەخشـە، كـە ببێتـە هۆی ئەوەی لەسەرپێچیی‌و گوناهی تۆ بمانگێڕێتەوە، هەروەها ئەوەندە تاعـەت‌و فەرمانبەرییتمان پێ ببەخشە، كە بمانگەیەنێتە بەهەشتەكەت، هەروەها ئەوەندە یەقین‌و بڕوابپتەوییمان پێ ببەخشـە، كـە بـەڵاو گرفتارییـەكانمان لەسـەر سـووك بكات. ئەی خوایە! بەهرەمەندمان بكە لە: هێزی بیستنەكانمان‌و دیتنەكانمان و،

١) أخرجه الترمذي: ٣٥٠٢، وقال: حسن غريب. والحاكم: ١٩٣٤، وقال: صحيح على شرط البخاري.

هێزو پێزمان هەتا دەمانژیەنی و، بیانکە بە میراتگرمان، {واتە: با ئەو هەستەوەرانەمان بمێنن، تاکو دەمرین} و، خوایە! هەرکەسێك ستەممان لێ دەکا، تۆڵەمان بۆ لێی بکەوە، {یارمەتیمان بدە لەدژی کەسێك کە دژایەتییمان دەکا}، با بەڵاو گرفتارییمان لە دینماندا نەبێ و، با دنیا گەورەترین ئامانجمان نەبێ و، ئەوپەڕی زانستمان نەبێ و، کەسێکمان بەسەردا زاڵ مەکە کە بەزەیی پێماندا نایەت.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم دوعایانەی دەکرد، ئنجا لە کۆڕو مەجلیس هەڵدەستا.

واش پێدەچێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێك جار دووعایەکی پێشتر-هی بڕگە شەش- و هەندێك جاریش ئەو دووعایەی کردبێ، بەپێی جیاوازیی حاڵەتەکان.

هەروەها هەر لە سوننەت دا هاتوە، کە سێ ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی (الصّافات) بکرێنە کۆتایی و (مسك الختام)ی کۆڕ و مەجلیس:

﴿ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾ ﴾ الصافات:١٨٠-١٨٢

## ئاڵقەی حەڤدەیەم :

# ئەدەبی قسەكردن و گوێ گرتن

بەڕێزان!
لەم ئاڵقەیەدا چەند ئەدەب و ڕەوشتێك لەبارەی چۆنیەتی قسەكردن و، چۆنیەتی گوێ بۆ خەڵك گرتن و، چۆنیەتی پێكەوە دووان، لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، دەخەینە ڕوو، ئەویش لەبەررۆشنایی ژمارەیەك لە ئایەتەكانی قورئان و، دەقەكانی سوننەتدا، قسە لەوبارەوە دەكەین، كە لە دە (١٠) خاڵ دا دەیانهێنین:

١) دەقی یەكەمیان كە دەیهێنینەوە، سێ ئایەتەكانی سەرەتای سووڕەتی (المؤمنون)ن، كە خوا دەفەرموێ:

﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَـٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: بەدڵنیاییی بڕوادارانێك سەرفراز و بە مراد گەیشتوون، كە لە نوێژەكانیان دا ملكەچن و، پشتهەڵكردووشن لە قسەی پووچو ڕەفتاری پووچ.

(لغو) هەر قسەیەك و، هەر كردەوەیەكە، كە پووچ بێ، یانی: هیچ سوودێكی نەبێ و خاوەنەكەی لێی بەهرەمەند نەبێ.

كەواتە: یەكەم ئەدەبی قسەكردن ئەوەیە، كە ئینسان خۆی لە قسەی پووچ، لە قسەی بێ كەڵك بپارێزێ، چونكە (راغب الأصفهاني) دەڵێ، (لغو) لە (لغا)وە هاتوە، (واللّغا صوت العصافير)، (لغا) بە دەنگی پاساریی، دەنگی چۆلەكان دەگوترێ، لەبەر ئەوەی ئەو دەنگە، ئەو جریوە جریوە، بۆ ئێمە شتێكی بێ سوودەو، هیچی لێ تێناگەین.

كەواتە: تەنانەت قسەی پووچو بێكەڵكیش، مسوڵمان نابێ بیكات، چ جای قسەی گوناهو خراپ، درۆو غەیبەتو بوختان، ئەوانە هەر هیچ، چونكە ئەوانە گوناهی گەورەن، بەڵكو مسوڵمان خۆی لەسەر قسەی پووچیش دەپارێزێ، قسەی پووچیش ئەوەیە، كە گوناه نەبێ، بەڵام سوودو كەڵكێكیشی نەبێ.

٢) خوای بێ هاوەڵ لە ئایەتی (١١٤)ی سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ:

﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾﴾.

واتە: زۆر لە چپەچپ کردنی ئەوان، {(نجوى) یانی چپە، قسەی بە ئەسپایی، قسەی پەنهانو چپەچپ بەیەکەوە کردن} هیچ سوودو کەڵکێکی تێدا نیە، مەگەر کەسێك فەرمان بەخێر و بەخشینێك، یان کارێکی ئاشتەوایی نێوان خەڵك بکات {یانی: لە سێ حاڵدا قسەی بە چپە پەسندە: ١) کەسێك فەرمان بکات بە هاوکاریی کردنو یارمەتییدانو خێرکردن بە کەسێك. ٢) یاخود فەرمان بکات بە شتێکی پەسند. ٣) یاخود فەرمان بکات بە ئاشتەوایی لەنێوان خەڵك دا}.

﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾، هەر کەسێکیش یەکێ لەو سێیە، یاخود هەرسێکیان بکا، {واتە: هاوکاریی کردنی خەڵك، یاخود قسەو کردارێکی پەسندو چاك، یاخود ئاشتەوایی و پێکهێنانەوەی خەڵك}، بەڵام لە کردەوەکەیدا مەبەستی پێ وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا بێ، ﴿فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ ئەوە بەدڵنیایی لەمەودوا پاداشتێکی مەزنی دەدەینەوە.

کەواتە قسەی بە چپە چپو پەنهان، فسکەفسك پێکەوە کردن، خراپە، مەگەر بۆ ئامانجێکی شەرعیی بێ، بۆ ئەوە بێ کە جاری وا هەیە، قسەیەك پێویستە بە پەنهانیی بکرێ، بە چپە بکرێ، بۆ وێنە: تەگبیرێك دەکرێ بۆ

یارمەتییدانی كەسێك، بۆ ئاشتەواییەك، بۆ شتێكی پەسند، ئەوە قەیناكات، ئەگەرنا واباشە بە ئاشكرا قسە بكرێو، ئامادەبووانی كۆڕو مەجلیس هەموویان گوێیان لێ بێ.

٣) دەقی سێیەم لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دێنینەوە، كە دەفەرموێ: {مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ}[١].

واتە: هەركەسێك بڕوای بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی باش بكا، {ئەگەر قسەی باش دەزانێ با بیكا} ، یان بێ دەنگ بێ.

هەر بۆیە گوتراوە: ئەگەر قسەكردن زیو بێ، بێ دەنگیی زێڕە، هەڵبەتە ئەوە لەكاتێكدایە: ئەو كەسەی قسە دەكا، قسەی چاكو خراپ تێكەڵ بكات، ئەگەرنا لە ڕاستییدا قسەی حەقو لەشوێنی خۆیدا، لە زێڕیش باشترە، نەك هەر زیو نیە، لە زێڕو گەوهەریش باشترە، وەك دوایی ئاماژەی پێ دەكەین، لەبەر ڕۆشنایی هەندێك لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم).

٤) دەقێكی دیكە كە بۆمان باسی ئەدەبێكی دیكەی بواری قسەكردن و گوێگرتن دەكات، ئەوەیە كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ}[٢]

واتە: هەر كەسێك گرەنتیی پاراستنی ئەوەی نێوان دوو شەویلاگەكانیو، ئەوەی نێوان دوو لاقەكانیم بۆ بكات، منیش گرەنتیی چوونە بەهەشتی بۆ دەكەم.

---

١) رواه البخاري: ٥٦٧٢ ومسلم ٤٧.

٢) رواه البخاري: ٦١٠٩.

كە ئەوەی نێوان دوو شەویلاگەكان: زمانەو، ئـەوەی نێـوان دوو لاقـەكانیش: ئەندامی زاوزێ یە.

واتە هەر كەسێك خۆی لەو گوناهانە بپارێزێ كە بە زمان دەكرێن و، خۆی لە گوناهە جنیسییەكان بپارێزێ، منیش گرەنتیی چوونە بەهەشـتی بـۆ دەكـەم و دڵنیایی دەدەمێ كە سەرفرازە.

٥) دەقی پێنجەم كە دەیهێنینەوە: لەلایەكەوە گرنگیی قسەو، لەلایەكی دیكەوە ترسناكیی قسە دەردەخات، گرنگیی قسە، ئەگەر بەباری خێردا بێ و، ترسناكیی قسە، ئەگەر بەباری خراپ دا بێ، باسی ئەوە دەكا:

پێغەمـبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ، مَا يَتَبَيَّنُ فِيهَا، يَزِلُّ بِهَا فِي النَّارِ أَبْعَدَ مِمَّا بَيْنَ الْمَشْرِقِ والمغرب}[١].

واتە: جاری وا هەیە بەندە قسەیەك دەكا، لێی ورد نابێتەوە، هێندە پێیدا بـە ئاگری دۆزەخدا دەچێتە خوار، وەك نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا. واتە: زۆر پێی بە دۆزەخدا قووڵ دەبێتەوەو پێی لەخوا دوور دەكەوێتەوە.



١) أخرجه أحمد: ٨٩٠٩، والبخاري: ٦١١٢، ومسلم: ٢٩٨٨.

٦) هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش هەر هەیە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوانِ اللَّهِ تَعالى مَا كَانَ يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بلَغَتْ، يكْتُبُ اللَّهُ لَهُ بِهَا رِضْوَانَهُ إِلَى يَوْمِ يلْقَاهُ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بالكَلمةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ، مَا كَانَ يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بلَغَتْ، يكْتُبُ اللَّهُ لَهُ بِهَا سَخَطَهُ إِلَى يَوْمِ يلْقَاهُ}[1].

واتە: پیاوی وا هەیە قسەیەك دەكات لـە ڕەزامەنـدیی خـوادا، پێـی وا نیـە ئەوەندە گرنگ بێ بیگەیەنێتە ئەو پلەیە، بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) بـەهۆی ئـەو قسەیەوە ڕەزامەندیی خۆی بۆ دەنووسێ تاكو قیامەت، بەپێچەوانەشەوە: كەسی وا هەیە قسەیەك دەكا، لە تووڕەیی خوادا، {لە شتێكدا كـە مایـەی تـووڕەیی خوایە}، گومانی وا نیە كە بیگەیەنێتـە ئـەو ڕاددەیـە، {لـە شـۆڕبوونەوە بـە زەلكاوی گوناه دا}، بەڵام خوا بەهۆی ئـەو قسـەیەوە، تـووڕەیی خـۆی لەسـەر دەنووسێ، تاكو ڕۆژی دوایی.

واتە: خوا بەهۆی ئەو وشەیەوە لێی تووڕە دەبـێ، هـەروەك ئـەوەی پێشـێیان بەهۆی ئەو قسە حەقەوە، لێی ڕازی دەبێ.



1) أخرجه أحمد: ١٥٨٩٠، والترمذي: ٢٣١٩، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٣٩٦٩.

٧) دەقێکی دیکە کە لەو بارەوە دەیهێنین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێ: {إِنَّ أَحَبَّكُم إِلَيَّ وأَقْرَبكُم مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَحَاسِنَكُمْ أَخْلَاقًا، وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ وَأَبْعَدَكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا، يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الثَّرْثَارُونَ، وَالْمُتَشَدِّقُونَ والمتفَيهِقونَ}[١].

واتە: لە ڕۆژی دوایی دا، ئەوانەتان لەلام خۆشەویست ترن و لەمنەوە نزیکترن، وەك شوێنی نشینگەو دانیشتنیان، کە ڕەوشتیان بەرزو جوانترە، هەروەها ئەوانەتان لەلام بوغزێنراوترن و لەمنەوە دوورترن لەڕووی پێگەو پلەوە: کە زۆربلێن و، بە فیزو کەشخە قسە دەکەن و، بە خۆبەزانا زانییەوە قسەدەکەن.

چونکە (الثَّرثار: الكثير الكلام)، کەسێك کە زۆر قسە دەکا، (والمتشدِّق: المتطاول على الناس بكلامه)، کەسێك کە قسە دەکا، بەلاّم بە فیزو کەشخەوە قسە دەکا، (المتفيق) کەسێك کە قسە دەکا، بەپڕی زاری، یاخود وا قسە دەکا، کە زۆر لە خەڵك شارەزاترە، بە خۆ پێ زۆرییەوە قسە دەکا.

٨) دەقی هەشتەم کە لەوبارەوە دەیهێنین، ئەوەیە کە شەڕە قسەو دەم بەدمە شتێکی خراپە لە کۆڕو مەجلیس دا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە دەفەرموێ: {مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلَّا أُوتُوا الْجَدَلَ} [٢]

واتە: هیچ کۆمەڵێك دوای ئەوەی خوا ڕێنمایی کردوون، گومڕا نەبوون، مەگەر بەهۆی ئەوەوە کە سەرگەرمی شەڕە قسەو دم بەدمەو، مشت و مڕ بوون لەگەڵ یەکدیدا.

---

١) أخرجه الترمذي: ٢٠١٨، وقال: حسن غريب.

٢ ) رواه الترمذي: ٣٢٥٣ وصححه.

هەڵبەتە گفتو گۆو وتوێژی هێمنانە پێکەوە، ئەوە جیایە، بەڵام شەڕە قسەو دم بە دمەو لێك هەڵبەزینەوە، شتێکی خراپە.

٩) لە سوورەتی (الحجرات)، لە ئایەتەکانی (١١ و ١٢)دا، خوای دادگەر باسی شەش (٦) گوناهی گەورە دەکا، لەو گوناهانەی کە لەبواری قسەکردنو گوێ گرتنو دوان دا دێنە پێشێ، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ ﴾ .

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! با کۆمەڵێك لە پیاوانتان گاڵتە بە کۆمەڵێکی دیکە نەکەن، نزیکە گاڵتە پێکراوەکان لە گاڵتەپێکەرەکان چاکتربن {لەلای خوا}، هەروەها با کۆمەڵێك لە ئافرەتانیش گاڵتە بە کۆمەڵێکی دیکەیان نەکەن، نزیکە گاڵتە پێکراوەکان لەوان چاکتر بن, هەروەها عەیب لەخۆتان مەگرن و، ناو و ناتۆرە لەیەکدی هەڵمەدەن، خراپترین ناو، ناوی فاسقێتییە لەدوای ئەوەی کە خوا (سبحانه وتعالى) کردوونی بە ئیماندار و، هەرکەسێك نەگەڕێتەوە {بۆ لای خوا}، ئەوانەن ستەمکاران.

ئەی بڕوادارینە! خۆتان لەزۆر گومانان بپارێزن، چونکە هەندێك لە گومانـان، گوناهن {ئنجا لەبەر ئەوەی هەندێکی گوناهەو جێـی خـۆی نـاگرێ، خـۆت لـە زۆری بپارێزە، بۆ ئەوەی تووشی هەندەکەی دیکەش نەبی، نەیفەرمووە: خۆت لە هەموو گومانێك بپارێزە، چونکە هەندێك گومانیش دەپێکن}.

هەروەها جاسووسیی‌و سیخووڕیی {لەسەر یەکدی} مەکەن و، با هەندێکتان پاشملە بە خراپە باسی هەنـدێکتان نـەکات، ئایـا یـەکێکتان حـەز دەکـات بـە مردوویی گۆشتی برایەکەی خۆی بخوات! {کاتێـك غـەیبـەتی کەسـێك دەکـەی، وەك بـە مردوویـی گۆشـتی بخـۆی وایـە}. ﴿فَكَرِهْتُمُوهُ﴾، بـە تەئکیـد پێتـان ناخۆشە، ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾، پارێزیش لە خـوا بکـەن، بـەدڵنیایی خوا زۆر تۆبە وەرگرەو، زۆریش میهرەبانە.

بەڕێزان!

ئەم شەش گوناهە:

١) گاڵتە بەیەکدی کردن.

٢) عەیب لە یەکدی گرتن.

٣) ناو و ناتۆرەی ناخۆش لە یەکدی هەڵدان.

٤) گومانی خراپ بە یەکدی بردن.

٥) سیخوڕیی و جاسووسیی لەسەر یەکدی کردن.

٦) پاشملە بەخراپە باسی یەکدی کردن.

هەر شەشیان گوناهی گەورەن، چونكە هەر شەشیان سزای قیامەتیان بۆ باس كراوە، گوناهی گەورەش ئەوەیە: یان سزای دنیایی لەسەر بێ، یان سزاو هەڕەشەی قیامەتیی.

١٠) دەقی دەیەمو كۆتایی كە لەو بارەیەوە دەیهێنین، ئەوەیە كە خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (الزمر)دا دەفەرموێ:

﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ۚ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر:١٨.

واتە: موژدە بدە بە بەندەكانم، ئەوانەی كە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام شوێن باشترینی دەكەون، ئا ئەوانە كەسانێكن كە خوا خستوونیە سەر ڕێی ڕاست و، ئا ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

مرۆڤی عاقڵ ئەو كەسەیە كە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرێ، بەڵام عەقڵی خۆی ناكاتە سەبەتە، هەمووی شتێكی تێبكا، بەڵكو دەیكاتە بێژینگ، قسەكان لە بێژینگ دەدا، هەروەك چۆن بۆ قسەكردنیش بەهەمان شێوە، پێشینانی خۆمان دەڵێن: "قسە دابیبێژە، بیچێژە، ئنجا بیبێژە"، سەرەتا دابیبێژە، هەرچی بێ كەڵكە لێی فڕێدە، ئنجا بیچێژە، تاقی بكەوە بزانە چییەو چۆنە؟ ئنجا بیبێژە، نەك یەكسەر فڕێی بدەی.

هەروەها خاوەن عەقڵان بۆ گوێگرتنیش، گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، نەك هەر لە ڕێ وە، كەسێك كە حەز بە چارەی ناكەن، گوێ لە قسەشی نەگرن،

نا ! گوێی بۆ بگرە، وەك گوتراوە: "انظر إلى ما قيل ولا تنظر إلى من قال"، واتە: تەماشا بكە! چی گوتراوە، تەماشا مەكە، كێ گوتوویەتی.

مرۆڤ دەبێ عەودالّی حەق بێ، لەلایەن هەر كەسێكەوە بێ، هەركەسێك شتێكی باش بڵێ و، شتێكی باشی لەلابێ، پێویستە لێی وەربگرین و، هەرگیز خود و بابەت (ذات وموضوع) تێكەڵ نەكەین.

ئنجا لەو بارەوە مرۆڤەكان دەبنە چوار بەش:

١) هەیە قسەكەری باشە، بەڵام گوێگری خراپە.

٢) هەیە قسەكەری باشیشەو، گوێگری باشیشە، (ئەوە باشترینە).

٣) هەشە قسەكەری خراپە، بەڵام گوێگری باشە.

٤) هەشە هەم قسەكەری خراپە، هەم گوێگری خراپیشە، (ئەوە خراپترینە).

خوا بە لوتفو كەرەمی خۆی لەو كەسانەمان بگێڕێ، كە هەم قسەی باش بكەین و، هەم باشیش گوێ بگرین و، هەم قسەكان پێش ئەوەی بیانكەین، دایانبێژینو بیانچێژین، ئنجا بیانبێژین، ئنجا گوێش هەڵخەین: هەر كەسێ حەقی لەلابوو لێی وەربگرین و، هەر كەسێكیش ناحەقی گوت، با زۆریش لێمان نزیك بێ، با زۆریش خۆشەویستمان بێ، بڵێین:ماڵی قەڵب سەر بە خاوەنیەتی! هەروەها قسەی ناحەق لە كەس وەرنەگرین، هەرچەندە نیزیك بێ لێمان و، قسەی حەقیش بۆ كەس ڕەت نەكەینەوە، هەرچەندە دوور بێ لێمان، حەق لە هەموو كەس وەربگرین، ناحەقیش لە هیچ كەس، وەرنەگرین.

ئاڵقەی هەژدەیەم :

## ئەدەبی خواردن و خواردنەوە

بەڕێزان!

بوارەكانی خواردنو خواردنەوەش، كۆمەڵێك ڕەوشتو ئەدەب، كە شەریعەت بە پەسندی داناون و، لەسەر مسوڵمانان پێویستە، بە وردو درشتەوە، بە نێرو مێوە، ڕەچاویان بكەین، دەیانخەینە ڕوو، كە سەرجەم ژمارەیان دە (١٠) ئەدەب و ڕەوشتە و، لە دە بڕگەدا دەیانخەینە ڕوو:

## بڕگەی یەكەم: بژیوە پاك و چاكەكان هەموویان ڕەوان و، پێویستە بە ئەندازەی پێویست بەهرەیان لێوەربگیرێ و، نابێ هیچكەس لەخۆوە قەدەغەیان بكات:

١) خوا (سبحانه وتعالى)، لە سوورەتی (الأعراف)-٣١-دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١ ﴾.

واتە: ئەی ڕۆڵەكانی ئادەم! ئەی نەوەی ئادەم! لەلای هەر مزگەوتێك ڕازاوەیی خۆتان ڕەچاو بكەن، {خۆتان بڕازێننەوە، خۆتان جوان بكەن، بەرگو پۆشاكی جوان بپۆشن}، هەروەها بخۆنو بخۆنەوە، بەڵام زێدەڕۆیی مەكەن، بێگومان خوا زێدەڕۆییكارانی خۆش ناوێن.

٢) هەر لە سوورەتی (الأعراف) -٣٢-دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِ ﴾ .

خوا بە پێغەمبەری خاتەم (محمد (صلى الله عليه وسلم)) دەفەرموێ: تۆ بفەرموو (بە پرسیاركردنی نكوولێیلێكەرانە)، پرسیار بكە: ئایا كێ ئەو جوانییەی كە خوا بۆ بەندەكانی خستوویەتە ڕوو، وەدەریناوەو، ئەو ڕزقو ڕۆزییە خۆشو بەتامانەی كە هێناونیە دی، كێ قەدەغەی كردوون! واتە: مادام خوا قەدەغەی نەكردبن، هیچ كەس بۆی نیە ئەو شتانەی كە خوا بۆ بەندەكانی دروستی كردوون، بۆی ڕەوا كردوون، لێیان قەدەغە بكا.

٣) لە سوورەتی (المائدة) -٨٧-دا خوا دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَـٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾.

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەو بژیوە خۆش و بەتامانەی خوا بۆی حەلاڵ کردوون، لە خۆتانیان قەدەغە مەکەن و، سنوورشکێنیی مەکەن، بێگومان خوا سنوورشکێنان و تێپەڕێنەرانی خۆش ناوێن.

کەواتە: هەر کەسێك، ئەو شتانەی کە خۆش و بەتامن، قەدەغەیان بکات، لەخۆی یان لە خەڵك، مانای وایە سنوور شکێنیی کردوەو، تێپەڕاندوە.

٤) لە سوورەتی (المؤمنون)-٥١-یشدا، هەر لەو بارەوە خوا دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَٱعْمَلُواْ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾.

خوا (سبحانه وتعالى) پێغەمبەران دەدوێنێ و، دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەرینە! لەو بژیوە خۆش و بەتامانەی، کەهەن بخۆن و، کردەوەی باشیش بکەن، بێگومان من زانام بەوەی کە ئەنجامی دەدەن.

پێشێ پێیان دەفەرموێ: بژیوی بەتام و چاك بخۆن، دوایی دەفەرموێ کردەوەی چاك بکەن، وشەی (طَيِّب) یانی: خۆش و بەتام، بەڵام جاری واش هەیە بەمانا مەعنەوییەکەی دێت، واتە: حەلاڵ، هەردوو واتاکەی هەن، بەڵام زیاتر بەمانای خۆش و بەتام و بەکەڵك دێ.

٥) لە ئایەتی (١١٤)ی سوورەتی (النحل)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَٱشۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ١١٤ ﴾ .

واتە: لەوەی کە خوا پێیداون، وەك بژێو، بخۆن، کە هەم حەڵاڵە {واتە: لە ڕووی شەرعییەوە، حەڵاڵە} و، هەم پاك و چاك(طیب)ە، یانی: لە خودی خۆیدا پاكو چاكو بەکەڵکە، ﴿وَٱشۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ﴾، سوپاسی چاکەی خواش بکەن، ئەگەر ئێوە تەنیا ئەو دەپەرستن، ئەگەر تەنیا ئەو دەپەرستن، سوپاسی چاکەکانی وی بکەن، نیعمەتەکانی بەکاربێننو سوپاسیشی بکەن لەسەری.

ئنجا با چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) بێنین:

**بڕگەی دووەم: ناوی خواهێنان پێش دەستکردن بە خواردن و، خواردنەوەو بەدەستی ڕاست خواردن و لەپێش خۆوە خواردن:**

١) پێغەمبەری خوا لەوبارەوە دەفەرموێ: {إِذَا أَكَلَ أَحَدكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّه، فَإِنْ نَسِيَ فِي أَوَّله فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّهِ عَلَى أَوَّله وَآخِره}[1].

واتە: ئەگەر یەكێكتان خواردنێكی خوارد، با لەسەرەتاكەیەوە بڵێ (بِسْمِ اللَّه)، ئنجا ئەگەر لە سەرەتاوە لە بیری چوو، با هەر كاتێ بیری كەوتەوە بڵێ: (بِسْمِ اللَّه علی أَوَّله وَآخِره)، بەناوی خوا، لەسەرەتاو لە كۆتاییەكەی.

ئنجا ئایا حكمەتی ئەو (بِسْمِ اللَّه)ی كردنە چییە؟ لەم فەرمایشتەدا ڕوونی دەكاتەوە:

٢) دەفەرموێ: {إِنَّ الشَّيْطَانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ أَنْ لَا يُذْكَرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ}[2].

واتە: شەیتان ئەو خواردنەی، ئەو خۆراكەی كە ناوی خوای لەسەر ناهێنرێ، بۆ خۆی ڕەوای دەكات، زەفەری پێ دەبات، بەشێوەیەك لە شێوەكان لێی بەهرەمەند دەبێ.

مەرج نیە لە ڕووی قەبارەی بەرچاو و بەرهەستەوە، كە ئێمە دەیبینین، لێی كەم بێتەوە، بەڵام بە تەئكید لە ڕووی مەعنەوییەوە، شەیتان لێی بەهرەمەند

١ أخرجه أبو داود: ٣٧٦٧، والترمذي: ١٨٥٨، وقال: حسن صحيح.

٢) أخرجه أبو داود ٣٧٦٨، والنسائي في الكبرى ١٠١١٣.

دەبێ بەشێوەیەك لە شێوەكان، دیارە خاوەنەكەشی لێی دەچێتە خەسار و زەرەری لێ دەكا، با بۆ ئێمە پەنهانیش بێ.

**٣)** هەر لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە، كە پێشتریش هێنامان، لەبارەی (عومەری كوڕی ئەبی سەلەمە)وە، كە منداڵێك بووە لە كۆش و لە ژێر سەرپەرشتیاریی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، واتە لەژێر چاودێریی ئەودا پەروەردە كراوە، دەڵێ: من دەستم لە قاپەكەدا دەگێڕا، لەكاتی نان خواردندا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: {يَا غلام! سمِّ اللهَ، وكُلْ بيمينك، وَكُلْ مِمّا يليك} [1]

واتە: ئەی كوڕیژگە، ئەی ڕۆڵە! ناوی خوا بێنەو، بەدەستی ڕاستت بخۆ و، لەپێش خۆشتەوە بخۆ، {دەست بۆ ئەولاو ئەولا درێژ مەكە}.



١) أخرجه البخاري: ٥٠٦١، ومسلم: ٢٠٢٢.

## بڕگەی سێیەم: ڕەخنە لەخواردن و خواردنەوە نەگرتن:

ئەدەبێکی دیکەی خواردنو خواردنەوە ئەوەیە، کە مرۆڤ ڕەخنە لە خواردن نەگرێ و، عەیبی لێ نەدۆزێتەوەو، بە لۆمەو لەقەم نەبێ، کە پێغەمبەری سەروەردمان عادەتی وابووەو، هەرگیز ڕەخنەی لە خواردن نەگرتوە، وەك لەم فەرموودەیەوە دیارە:

{عَن أبي هريرة رضي الله عنه قال: مَا عَابَ رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) طَعَاماً قَطُّ، إِنْ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ} [(١)]

(أبو هريرة) (خوا لێی ڕازی بێ)، {کە یەکێکە لە هاوەڵە زۆر نزیکەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و، زۆرترین دەقی سوننەت لەڕێی ویەوە بە ئێمە گەیشتوون}، دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز ڕەخنەی لە خواردن نەگرتوە، ئەگەر حەزی لێ بووبێ خواردوویەتی و، ئەگەر حەزی لێ نەبووبێ، وازی لێ هێناوە.

بەڵام نەچووە زەم و سەرزەنشتی بکات و بەخراپە باسی بکا، بەتایبەت ئەوە ئەدەبێکی گرنگە، کە کەسێك لە ماڵێك، لە شوێنێك نان دەخوات، دوایی با خواردنەکەشی بەدڵ نەبێ، یاخود لێیان هەڵەبووبێ، یان چاکیان لێ نەزانیبێ، ...هتد.، پێچەوانەی ئەدەبو ڕەوشتی مسوڵمانانەیە کە کۆڕو مەجلیس بە زەمو باسکردنی خواردنی ئەو ماڵە گەرم بکات، کە بێگومان دوایی پێیان بگاتەوە، پێیان ناخۆش دەبێ، هەڵبەتە کەسێك، کەسێك دەعوەت دەکا، بانگهێشتی دەکا، وا باشە وردەکاریی بکا لە خواردنەکەیدا، خواردنەکە باش

---

١) أخرجه البخاري: ٥٤٠٩، ومسلم: ٢٠٦٤.

ئامادە بکا، زیاتر لەوەی کە بۆخۆیو بۆ ماڵو منداڵەکەی خەم دەخوا، بۆ میوانەکەی خەم بخوا، بەڵام جاری واش هەیە، بەهۆی کەمتەرخەمییەوە بێ، یان بەهۆی لێ تێکچوونەوە بێ، یان بەهۆی کەم تواناییەوە بێ، خوادنەکە بە دڵی بابای میوان نابێ، نابێ ئەوە بکاتە پاساوی زەمو زەمکارییو باسکردنی پاشملە.

## بڕگەی چوارەم: زێدەڕۆیی نەکردن لەخواردن و خواردنەوەدا:

ئەدەبێکی دیکەی خواردنو خواردنەوە ئەوەیە، کە مرۆڤ زیاد لە ئەندازەی پێویستی خۆی نەخوات، با لەو بارەشەوە ئەم فەرموودەیە بێنین: {مَا مَلأَ ابن آدم وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنه، بِحَسْبِ ابْنِ آدَم أُكُلَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ؛ فَإِنْ كَانَ لَا مَحَالَةَ: فَثُلُث طَعَامٍ، وَثُلُث شَرَابٍ، وَثُلُث لِنَفَسِه} .[1]

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ڕۆڵەی ئادەم، ئادەمیزاد، هیچ تووړەکەیەکی لە ورگی خۆی خراپتری پڕ نەکردوە، {ئەگەر ورگی خۆی پڕ بکات لە خواردن، ئەوە خراپترین تووړەکەیە پڕی کردبێ} . ڕۆڵەی ئادەم ئەوەندە پاروانەی بەسن، کە پشتی ڕابگرن، {یانی: با هەر ئەوەندە کە پێویستیەتی بخوات، نەك ئەوەندەی کەیفی لێیە} ، ئنجا ئەگەر هەر توانای بەسەر خۆیدا نەبوو، با گەدەی بکاتە سێ بەش، سێیەك (٣/١)ی بۆ خواردن، سێیەك (٣/١)ی بۆ خواردنەوە (بۆ ئاو)، با سێیەك(٣/١)یشی بە بۆشیی بهێڵێتەوە بۆ هەناسەدانی.

١) أخرجه أحمد: ١٧٢٢٥، والترمذي: ٢٣٨٠، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٣٣٤٩.

نەك لە جیاتی ئاو و هەناسەش هەر خواردنی تێ بکا، دوایی تەنگە نەفەس ببێ، ئنجا لە ئەنجامی زۆر خواردندا، تووشی کێشی زیاد ببێ، چونکە ئەو خواردنە کە مرۆڤ دەیخوات، ئەو کالۆریی(السّعرات الحرارية)یەکەوزەییەکانی کە جەستە پێویستیی پێیان نیە, هەندێك کەس جەستەی قابیلیەتی پەزمەندەکردنی ئەو وزەیەی هەیەو، کۆی دەکاتەوەو، دەبێتە قەڵەویی و، قەڵەوییش بارێکە لە کۆڵی ئینسان، بەڵام هەندێك کەس زۆریش بخوات، جەستەی قابیلیەتی خەزن کردنی وزەی نیەو، دەبێتە پاشەرۆكو فڕێ دەدرێ، ئەوانە بۆخۆیان سەریان سووکە، بەڵام ئەوانەی کە جەستەیان ئامادەیی قەڵەوبوونی هەیە، دەبێ لە خۆیان وریا بن و، بەپێی ئەو ڕێنماییەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بجووڵێنەوەو، بەچەند پاروویەك کە پشتی ڕابگرن وازبێنێ، بەڵێ مرۆڤ ئەوەندەی کە پێویستییەتی بیخوات، نەك ئەوەندەی کە کەیفی لێیە. لەوبارەوە پەندێکم هەیە، دەڵێ: "ئەوەندە بخۆ هەڵتگرێ، ئەوەندە مەخۆ هەڵیگری"، ئەوەندە بخۆ خواردنەکە تۆ هەڵبگرێ، واتە ببێتە وزەو پێویستیت پێی بێ، ئەوەندە مەخۆ تۆ ببیە حەمباڵو کۆڵ هەڵگری خواردنەکەتو، دوایی کێشی زیاد لەخۆت باربکەی، کە هی وا هەیە بۆ وێنە: باڵای سەد و شەست(١٦٠ سم)ە، بەڵام کێشی سەرووی سەد و بیست(١٢٠) کیلۆ گرامە، کەسانی وا زۆرن، کە ئەمە واتە: ڕێك نەفەرێکی دیکەی لەکۆڵ خۆی ناوە، ئەوەیە کوردەواریی خۆمان دەڵێین: خواردن دەڵێ: ئەگەر نەتکەم بە دووان، دەتکەم بە یەکێکی بەقەدەر دووان، ئنجا کەسێك کێشی (١٢٠ کیلۆ – ١٤٠ کیلۆ) بێ، بەڵام باڵای (١٦٠ سم یان ١٧٠ سم) بێ، بە تەئکید مانای وایە نەفەرێکی دیکەی وەك خۆی لە کۆڵ ناوە.

## بڕگەی پێنجەم: سوپاس و ستایشی خوا کردن پاش خواردن و خواردنەوە:

یەکێکی دیکە لە ئەدەب و ڕەوشتەکانی خواردن ئەوەیە، کاتێك ئینسان لە خواردن و خواردنەوە دەبێتەوە، سوپاس و ستایشی خوا بکات، ئنجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی، ئاوا بگوترێ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِينَ}[1].

واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و، خواردنەوەی پێداین و، گێڕاینی بە مسوڵمان.

هەڵبەتە شێوە دوعای دیکەش هەر هاتوون، بۆ وێنە: ئەگەر کەسێك لەلای کەسێك دەعوەت بێ و نانیان لە ماڵ بخوات، سوننەتە بڵێ: {أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلَائِكَةُ}[2]

واتە: یاخوا ڕۆژووەوانان ڕۆژووتان لەلا بشکێنن و، چاکەکاران خواردنتان بخۆن و، فریشتەکان بۆتان بپاڕێنەوە و دووعاتان بۆ بکەن.



١) رواه أحمد: ١١٩٥٣، وأبو داود: ٣٨٥٠.

٢) أخرجه أبو داود: ٣٨٥٦، وصححه الألباني.

## بڕگەی شەشەم: بەبێ مۆڵەت وەرگرتن نەچوونە ماڵی خەڵك بۆ خواردن و خواردنەوە:

ئەدەبێکی دیکەی خواردنو خواردنەوە ئەوەیە، کە ئینسان بەبێ مۆڵەت نەچێتە ماڵی خەڵکەوە بۆ خواردن و خواردنەوە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأحزاب) -٥٣-دا، دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ ... ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! مەچنە ماڵەکانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، مەگەر مۆڵەتتان بدرێ بۆ خواردنێك، کە نابێ چاوەڕێی کوڵینی بکەن، {با بکوڵێ و ساز بێ، ئنجا بچن}، بەڵام ئەگەر بانگهێشت کران بچنە ژوورەوە.

## بڕگەی حەوتەم: زوو هەڵسان دوای خواردن و، بارگرانیی نەخستە سەر ماڵی خانەخوێ:

ئەدەبێکی دیکە ئەوەیە کاتێك ئینسان لە شوێنێك دەعوەت دەبێ، وا باشە دوای خواردن، زۆر نەیکاتە بارگرانیی لەسەریان و، زوو هەڵسێ، وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِۦ مِنكُمْۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْيِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾، واتە: ئەگەر خواردنتان خوارد بڵاو بن و، مەمێننەوە، کە هەر پێکەوە قسان بکەن و بخافڵێن، چونکە ئەوە پێغەمبەر نارەحەت دەکات و شەرمتان لێ دەکات -پێتان بڵێ: هەڵسن- بەڵام خوا لە گوتنی هەقێ شەرم ناکات...

بەڵێ خاوەن ماڵیش پێویستیی بە ئیسرِاحەت هەیەو، ئافرەتەکان کەوتوونە حاڵەتێکی نائاساییەوە بەهۆی میوانەکانەوە، وا باشە زوو ماڵەکە بەجێبهێڵدرێ، بۆ ئەوەی ئەوانیش ئیسرِاحەت بکەن، مادام ئامانج دەعوەتو نانخواردنەکە بووە، نەك هەر لەوێ دانیشتنو حیکایەت کردن و خۆخافڵاندن!.

## بڕگەی هەشتەم: چۆنیەتی خواردنەوە:

لەو بارەوە کە ئینسان چۆن دەبێ ئاو و خواردنەوە بخواتەوە، ئەم دوو فەرمایشتە دێنین:

١) {عن ابن عباس (رضي الله عنهما) أن النَّبيَّ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى أَن يُتَنَفَّسَ في الإِنَاءِ، أَوْ يُنْفَخَ فِيهِ}[١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی کردوە، کە لەکاتی خواردنەوەدا، ئەو قاپە، یان ئەو دەفرە، {کە شتێکی تێدا دەخورێتەوە} ، هەناسەی تێدا بدرێ، یان فووی لێ بکرێ.

بەڵام ئایا چۆن سوننەت و پەسندە ئاوو شلەمەنیی بخورێتەوە؟ ئەوە فەرموودەی دوایی ڕوونی دەکاتەوە:

٢) {كَانَ رَسُولُ اللهِ يَتَنَفَّسُ فِي الشَّرَابِ ثَلاَثًا، وَيَقُولُ: إِنَّهُ أَرْوَى، وَأَبْرَأُ، وَأَمْرَأُ}[٢].

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عادەتی وابوو لەکاتی خواردنەوەدا {ئاو، دۆ، شەربەت...هتد} ، سێ جاران هەناسەی دەدا.

١) أخرجه البخاري: ١٥٣، ومسلم: ٢٦٧.
٢) رواه أحمد: ٥٦٣١، ومسلم: ٢٠٢٨.

واتە بەسێ بڕگە دەیخواردەوە، تۆزێكی دەخواردەوەو، لە دەمی دەكردەوەو هەناسەیەكی دەدا، ئنجا جاری دووەم هەرواو، جاری سێ یەم هەروا، هەناسەدان لە دەرەوەی دەفرەكە سوننەتە، بەڵام لەنێو دەفرەكەدا، قەدەغە كراوە.

ئنجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: ئەگەر بێت و ئاوا بە سێ جار بخورێتەوە، ئەوە باشتر تێنوایەتیی دەشكێنێ و، دوورتریشە لە نەخۆشیی و، ئاسانتر و خۆشتریش لە گەروو ئەودیو دەبێ.

## بڕگەی نۆیەم: خواردن و خواردنەوە بە ڕۆیشتن و بەپێوە، ڕەوایە:

لەبارەی ئەوەوە كە ئایا دەگونجێ ئینسان بەپێوە و بە ڕۆیشتنەوە خواردن بخوا، یان بە پێوە شت بخواتەوە، ئەم چەند دەقە دێنین:

١) {عن ابن عمر رضيَ اللَّه عنهما قال: كنَّا نَأْكُلُ عَلى عَهدِ النَّبيِّ (صلى الله عليه وسلم) ونحْنُ نَمْشي، ونَشْرَبُ وَنحْنُ قيامٌ}[1].

واتە: عەبدوڵلای كوڕی عومەر (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لەكاتێكدا كە بەڕێ دا دەڕۆیشتین، خواردنمان دەخواردو، كاتێك كە بە پێوەش دەبووین خواردنەوەمان دەخواردەوە.

كەواتە خواردن و خواردنەوە بەپێوەو بەڕێوە ڕەوایە، بەڵام لەو بارەوە ئەمەش هەیە:

١) رواه أحمد: ٥٨٧٤، والترمذي: ١٨٨١ وصحّحه).

٢) {عن أبي سعيد ﷺ أَنَّ النَّبيّ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنِ الشّرب قَائِماً}[١].

واتە: (أبو سعيد الخدري) (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێگریی کردوە لەوە کە بە پێوە ئاو (یان شلەمەنیی) بخورێتەوە.

بەڵام دیسان دەقێکی دیکەش هەیە:

٣) {عن ابن عباس (رضي الله عنهما) شَرِبَ النَّبيُّ (صلى الله عليه وسلم) قَائِماً مِنَ مَاء زمزم}[٢].

واتە: پێغەمبەری خوا بە پێوە لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە وا پەسەندە بە دانیشتنەوە ئاو یان شلەمەنیی بخورێتەوە، بەڵام دروستە لەکاتی پێویستیدا بە پێوەش بخورێتەوە.



١) رواه أحمد: ١٢٨٩٤، ومسلم: ٢٠٢٤.
٢) رواه البخاري: ٥٢٩٤، ومسلم: ٢٠٢٧.

## بڕگەی دەیەم: پەنجەكانی خۆلێستنەوەو هەڵگرتنەوەی پارووی كەوتووەخوار:

كۆتایی ئەدەبی خواردنو خواردنەوە بەو فەرمایشتە دێنین:
{عن أنس رضي الله عنه أَنَّ رسولَ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا أَكَلَ طَعَامًا لَعِقَ أَصابِعَه الثلاثَ، وقال: إِذَا سَقطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ، فَلْيُمِطْ عَنْها الأَذى، ولْيَأْكُلْها، وَلا يَدَعْها للشَّيْطَانِ، وكان يأمرنا بلعق القَصعة}[1].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر خواردنێكی دەخوراد، سێ پەنجەكانی خۆی، كە خواردنی پێ خواردوون، دەیلێستنەوەو، دەشیفەرموو: ئەگەر یەكێكتان پاروویەكی لێ كەوتە خوار، با ئەگەر شتێكی پێوە نووسا بوو لێی بكاتەوەو بیخوات و، بۆ شەیتانی لێ نەگەڕێ، (هەڵبەتە ئەگەر وا نەبێ شوێنەكەی پیس بێ)، هەروەها فەرمانی پێ دەكردین كە ئەو قاپەی خواردنی تێدا دەخۆین، بە پاروویەك بیسڕینەوە، {واتە هیچی پێوە نەهێڵین}.

كەسی وا هەیە ئەو قاپەی كە تێیدا دەخوات، نیوەی خواردنەكەی تێدا دەمێنێ، ئەوە هەم ناشوكریی دەگەیەنێ، هەم خواردنەكە خەسار دەبێ، هەم بۆ پاكو خاوێنیی كابانەكەش، بەزەحمەتترە.

١) أخرجه أحمد: ١١٩٨٢، ومسلم: ٢٠٣٤، وأبو داود: ٣٨٤٥.

ئاڵقەی نۆزدەیەم:

# ئەدەبی بەرگ و پۆشاك

بەڕێزان!
ئیسلام بۆ هەموو هەڵسوكەوتەكانی مرۆڤ، كۆمەڵێك ڕەوشتو ئەدەبو ڕێساو یاسای داناون، كە ئەگەر مسوڵمانان ئەو ئەدەبو ڕەوشتو یاساو ڕێسایانە ڕەچاو بكەن، بێگومان مسوڵمانەتییەكەیان و دینداریيەكەیان، پاكو پوختتر و، ڕێك و پێكتر و، تێرو تەواوتر دەبێ، یەكێك لەو بوارانەش, بواری بەرگو پۆشاكە، ئنجا ئێمە لەم ئاڵقەیەدا لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەتێك و، چەند دەقێكی سوننەتدا، كە دە(١٠) دەقن، باسی ئەدەبو ڕەوشتەكانی بەرگو پۆشاك دەكەین:

١) یەکەمین دەق لەوبارەوە کە دەیهێنین، ئایەتی (٢٦)ی سوورەتی (الأعراف)ە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ٢٦ ﴾ الأعراف: ٢٦.

واتە: ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم! ئەی وەچەی ئادەم، {بە نێرو مێوە، بە پیاوانو ئافرەتانەوە}، ئێمە پۆشاکمان بۆتان دابەزاندوە، کە عەیبو عارتان، کەمو کوڕییەکانتان دادەپۆشێ، هەروەها شتێك کە خۆتانی پێ دەڕازێننەوە، بۆتانمان دابەزاندوە، پۆشاکێکیشمان بۆ داناون، کە بریتیە لە پۆشاکی پارێزکاریی، ئەوە باشترە لە هەموو جۆرەکانی دیکەی پۆشاك.

هەندێك لەزانایان گوتوویانە: ﴿وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ﴾، لێرەدا یانی: پۆشاکێك کە لە تیرو شیر، یاخود لە زەبری دوژمن دەتانپارێزێ، واتە: لە جەنگدا بەکاری دێنن.

بەڵام ئەوە کە وشەی (لباس التقوى) بەمانای: پارێزکردنی مەعنەویی و قەڵغانی گێڕەرەوەی تیری گوناهان بێ، نیزیکترە.

کەواتە: لێرەدا خوا (سبحانه وتعالى) وەك چاکەیەکی خۆی لەسەر مرۆڤایەتیی، باسی بەرگو پۆشاك دەکا، کە عەیبو عارو کەمو کوڕییەکان و، عەورەتیان دادەپۆشێ، هەروەها وێڕای عەیبو عارو عەورەت داپۆشین، خۆشیانی پێ دەڕازێننەوەو پێ جوان دەکەن.

٢) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی بەرگو پۆشاکەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ وێنە دەفەرموێ: {إِلْبَسُوا الْبَيَاضَ، فَإِنَّهَا أَطْهَر وَأَطيَب، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ}[١].

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: پۆشاکی سپی لەبەر بکەن {بیپۆشن}، چونکە پاکتریشەو خۆشتریشە، هەروەها مردووەکانتانیشی تێدا کفن بکەن، {واتە بیکەنە پۆشاکی مردووەکانیشتان}.

هەڵبەتە کفن ئەگەر ڕەنگێکی دیکەشی هەبێ، هەر دروستە، بەڵام واباشترە سپی بێ، لەبەر ئەوەی پۆشاکی سپی ئەگەر خاڵێکی پێوە بێ، چڵکێکی پێوە بێ، زیاتر لێی دیارە و، بەناچاریی پاكو خاوێن ڕادەگیرێ.

ئایا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چ جۆرە پۆشاکێکی پۆشیوە؟ دوو فەرمایشت لەو بارەوە دێنین:

٣) {كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) مَربوعًا، وَقَدْ رَأَيْتُهُ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ، مَا رَأَيْتُ شَيْئاً قَطُّ أَحْسَن منه}[٢].

یەکێك لە هاوەڵان (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پیاوێکی میانگیربوو لە بەژنو باڵادا، پیاوێکی چوار شانە بوو، {نە زۆر درێژ بوو، نە کورت بوو}، ڕۆژێك بینیم لە پۆشاکێکی سووردا، هەرگیز شتی وا جوانم نەبینیبوو.

کەواتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پۆشاکی سووریشی پۆشیوە.

فەرمایشتێکی دیکە لەو بارەوە:

---

١) أخرجه الترمذي: ٢٨١٠، والنسائي في الكبرى: ٩٦٤٢ ، والحاكم: ٣٥٥.

٢) أخرجه البخاري: ٥٨٤٨، ومسلم: ٢٣٣٧.

٤) {عن أبي رِمْثة رفاعَةَ التَّميْمِيِّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ وَعَلَيْهِ ثَوبَانِ أَخْضَرانِ}[1].

واتە: (أبي رمثة رفاعة التميمي) دەڵێ: پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بینی دوو پۆشاکی سەوزی لەبەر بوون، {دوو پۆشاك، واتە: یەکێکیان سەرەوەی جەستەی پێ داپۆشیبوو، یەکێکیشیان لە پشتێن بەرەژێری جەستەی}.

کەواتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پۆشاکی سەوزیشی پۆشیوە، بێگومان لە فەرمایشتی دیکەشدا هاتوە، کە سپیشی پۆشیوە، بەڵکو ڕەنگە بەزۆریی ڕەنگی سپی لەبەر کردبێ، هەروەك ڕەنگی ڕەشیشی پۆشیوەو، ڕەنگەکانی دیکەشی پۆشیون.

هەڵبەتە ڕەنگی پۆشاکی پیاوانو ئافرەتان، زیاتر پەیوەستە بە عورفو باو و نەریتی کۆمەڵگاوە، ئەگەرنا لەڕووی شەرعییەوە، ڕەنگێك دیاریی نەکراوە، جگە لە ڕەنگی سپی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ئەوە پاکترەو، خۆشترە لە جەستە، ئەگەرنا ڕەنگەکانی دیکە هەموویان یەکسانن.

لەوبارەوە، کە مرۆڤ نابێ فیزو کەشخە بە پۆشاکەوە بکا، واتە پۆشاك کە لەبەر دەکا بیکاتە مایەی فیزو کەشخەو خۆ بادان بەسەر خەڵکدا، چەند فەرمایشتێك دێنین:



---

١) أخرجه أبوداود: ٤٠٦٥، والترمذي: ٢٨١٢، وقال: صحيح.

٥) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لاَ يَنْظُرُ اللّٰهُ يَـوْمَ القِيَامَـةِ إِلَى مَنْ جَرَّ إِزَارَهُ بَطَراً}.[١]

واتە: لەڕۆژی قیامەتدا خوا تەماشای کەسێك ناکات، کە بـە فیـزو کەشـخە پۆشاکەکەی بەدوای خۆیدا ڕاکێشاوە.

وەك پێشتریش باسم کرد: عەرەب یەکێك لە عادەتـە خراپـەکانیان ئـەوەبوو، بەتایبەتی ئەوانەیان کە پـارەدارو سـامانداربوون، پۆشـاکیان بـەدوای خۆیانـدا ڕادەکێشا، هی وا هەبوو مەترێك، کراسەکەی بەدوای خۆیـدا دەکێشـا، هـی وا هەبوو چەند بستێك، بەڵکو هـی وا هـەبوو پیـاوی تایبـەتیی هـەبوو، زیـادەی پۆشاکەکەی بۆ هەڵـدەگرت، دامێنەکـەی بـۆ هەڵـدەگرت! ئنجـا ئەوەیـە، کـە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەبەسـتی بـووە، دەبـێ چـاك لـە فەرمایشـتەکەی پێغەمبەری خوا تێ بگەین، نەك یەکێك بێ لەو کوردستانەی خۆمـان، پێی وابێ کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسـی دەلینگـی شـەڕواڵی کـردوە، یـان باسـی دەلینگـی پـانتۆڵی کـردوە، نـا، بـەڵکو باسـی ئـەو پۆشـاکانەی کـردوە، کـە بەسەرخۆدا دەدرێـن، چـونکە ئـەوە دەگـونجێ ڕابکێشـرێ، ئەگـەرنا دەلینگـی پانتۆڵو شەڕواڵ ناگونجێ لەدوای خۆ ڕابکێشرێ.



١) البخاري (٥/٢١٨٢، رقم ٥٤٥١)، ومسلم (٣/١٦٥٣، رقم ٢٠٨٧).

٦) فەرمایشتێكی دیكە لەو بارەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خيلاء لَمْ يَنْظُرْ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَة، فقال أبو بكر رضي الله عنه: يا رَسُول اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إن إزاري يسترخي إلاّ أن أتعاهده! فقال رَسُول اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): أنْتَ لَسْتَ مِمَّن يفعله خيلاء}[١].

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: هەر كەسێك پۆشاكەكەی بە فیزو كەشخە بە دوای خۆیدا ڕاكێشێ، لەڕۆژی قیامەتدا خوا تەماشای ناكات، {بەچاوی لوتفو مەرحەمەت تەماشای ناكا}، (أبوبكر) (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) پۆشاكەكەم هەر شۆڕ دەبێتەوە، مەگەر ئاگام لێی بێ‌و لێی وریا بم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: تۆ لەوانە نی كە بەفیزو كەشخە وا دەكەن.

كەواتە ئەگەر كەسێك پۆشاكەكەی لە زەوییش بخشێ، مادام بە فیزو كەشخە نەبێ، وەبەر هەڕەشەكە ناكەوێ، چ جای كە پۆشاكەكەی لەدواشی نەخشێ، هەر لەبەر ئەوەی لە خوار گوێزینگیەوەیەتی! چونكە ئەوەش كە دەفەرموێ: (ما أسفل من الكعبين في النار) دیارە هەر مەبەست پێی ئەو پۆشاكانەیە، كە وەك گوتم بەسەرخۆدا دەدرێن و، دەگونجێ لە زەوی بخشێن. بەڵام دەلینگە پانتۆڵ یان شەرواڵ، لەبەر پێ‌و لەبەر پێڵاو، بواری نیە كە لە زەوی بخشێ! ئنجا بە تەئكید پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەپێی عورفو باوی ڕۆژگاری خۆی قسەی كردوەو، مەبەستی پێی ئەو بەرگ‌و پۆشاكە بووە، كە ئەو خەڵك‌و قەومە كە لە نێویاندا بووە، پۆشیویانە، نەك ئەوەی كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێویاندا نەبووە، ئنجا ئەوكاتە ئەوانیش (سروال)یان هەبووە، وەك شەرواڵی كوردیی

[١]) البخاري:٣٦٦٥، ومسلم:٢٠٨٥.

ئێمە، ئەوان پێیان گوتوە: (سَرْوال)، بەڵام لە هیچ کام لـە فەرمایشـتەکاندا بـۆ لەدوای خۆڕاکێشان، باسـی (سـروال) نـەکراوە، بـەڵکو تـەنیا باسـی (ثـوب) و (رداء) و (إزار) کراوە، کە بە تەئکید، هەر جۆرە پۆشاکێکی دیکـەش لـەدوای خۆ بخشێندرێ، هەر دەیگرێتەوە، بەڵام وەك گوتم: دەلینگی شـەڕواڵ‌و دەلینگـی پانتۆڵ، بەوجۆرە نیە کە بگونجێ لە دوای خۆ بخشێندرێ.

هەڵبەتە ئەو فەرمایشتەش ئەوە دەگەیـەنێ، کـە هـەر شـتێ بـەدوای خـۆدا بخشێندرێ، هەر حەرامـە، وەك دەفـەرموێ: {الإسبالُ في الإزارِ والقَميصِ والعِمامةِ}[١] .

واتە: پۆشاك بەدوای خۆدا ڕاکێشان، (إسبال) لە (إزار)دایە، {(إزار) ئەوەیە کە بەسەرخۆدا دەدرێ}و، لە کراس دایە، {(قمیص) ئەوەیە کە لەبەر دەکـرێ} و، لەمێزەر دایە، {(عمامة)ش مێزەرە، کە لەسەر دەنرێ}.

هەروەها ئەدەبێکی دیکە لەبواری پۆشاکدا بریتیە، لە خۆدوورگرتنی پیـاوان لە پۆشینی ئاوریشم و، بەکارهێنانی زێـڕ، وەك پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) دەفـەرموێ: {حُـرِّمَ لِبَـاسُ الحَرِيـرِ وَالـذَّهَبِ عَـلَى ذُكُـورِ أُمَّتِـي، وَأُحِـلَّ لإنَاثِهِمْ}[٢].

واتە: پۆشینی ئاوریشم و، زێڕ، لەسەر نێرینەکانی ئوممەتم قەدەغەیە، بەڵام بۆ مێینەکانیان حەڵاڵە.

ئافرەتان دروستە هەم ئاوریشم بەکاربێنن، هەم زێـڕ، بـەڵام هـیچ شـتێکیش دەبێ زێدەڕۆیی تێدا نەکرێ و، بۆ فیزو کەشخەو خۆبادان بەسەر خەڵکی هـەژارو نەدار دا بەکار نەهێندرێ.

---

١ ) أخرجه أبو داود: ٤٠٩٤ والنسائي:٥٣٤٩.

٢) أخرجه الترمذي: ١٧٢٠، وقال حسن صحيح.

٨) لەکاتێکدا کە ئینسان بەرگ‌و پۆشاکێکی نوێ دەپۆشێ، ئەویش ئـەدەب‌و ڕەوشتی تایبەتی خۆی هەیە، وەك لەم فەرمایشتەوە دیارە:

{عن أبي سعيد الخدري ﵁ قال: كَانَ رَسُـولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْبًا، سَمَّاهُ بِاسْمِه - إِمَّا قَمِيصًا أَوْ عِمَامَةً - ثُمَّ يَقُولُ: أَللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ كَسَوْتَنِيه، أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْـرِهِ وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَـهُ، وَأَعُـوذُ بِـكَ مِـنْ شَـرِهِ وَشَرِّ مَا صُنِع لَهُ}[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر پۆشاکێکی نوێی بۆ پەیدا دەبوو، ناوی لێ دەنـا، ئنجـا مێـزەر بایە، کراس بایە، هەرچی بایە، ناوی لێ دەنا {دەیفەرموو: ئـەوە پۆشـاکەکەم، ئەوە مێزەرەکەم}، دوایی دەیفەرموو: ئەی خوایـە! سـتایش بۆتـۆ، تـۆ ئـەوەت کردوەتـە پۆشـاکی مـن، سـوودی ئـەو پۆشـاکەو، سـوودی ئـەوەی کـە بـۆی دروستکراوە، لە تۆی داوا دەکەم و، پەنا دەگرم بە تۆ لـە خراپـەو زیـانی و، لـە خراپەو زیانی ئەوەی، کە بۆی دروستکراوە.

٩) دەربارەی ئافرەتان بە تایبەت، خوا (سبحانه وتعالى) لـە سـوورەتی (النـور)، ئایەتی (٣١)دا دەفەرموێ:

﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴾ النور: ٣١

واتە: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: لە نیگای چاویان بگرنەوە، {با پڕ بە چـاویان تەماشای پیاوان نەکەن، یان با چاویان لا بدەن، هەروەها پیاوانیش دەبێ هەر وا

---

١) أخرجه أبو داود: ٤٠٢، والترمذي: ١٧٦٧، وقال: حديث حسن.

بکەن، وەك لە ئایەتی پێشوودا هاتوە} ، هەروەها با داوێنی خۆیـان بپـارێزن و، با جوانیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەی دەردەکەوێ، ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، (القرطبـي) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (أي ما ظهر عادةً وعبـادة)، واتـە: ئەوەی بە عادەت دەردەکەوێ و، لە حاڵەتی عیبادەتدا، لە حاڵـەتی عیبادەتـدا ئافرەت فەرزە دەم و چاو و هـەردوو دەسـتی دیـاربن، کەواتـە: بـە عـادەتیش، دروستە دەم و چاو و هەردوو دەستی دیـار بـن، چـونکە پێویسـتیی پێیـە، بـۆ هەڵسـوکەوت لەگـەڵ کۆمـەڵگاو ئـیش‌و کـار، دەبـێ دەسـتی دیـار بـێ و، دەموچاویشی دیار بێ.

﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾، هـەروەها بـا سەرپۆشـەکانیان بەسـەر سینگ‌و بەرۆکیان دا بدەن، واتە: سەرپۆشـیان لەسـەرە، ئـەوە هـیچ، بـەڵام بـا سینگ بەرۆکی خۆشیانی پێ داپپۆشن.

ئنجا هەندێك لەوانەی کە لە بیانوون بۆ ئەوەی ئافرەت زیاتر ڕووت بکەنەوە، گوتوویانـە: خـوا باسـی ئـەوەی نـەکردوە ئافرەتـان سـەریان داپپۆشـن، هـەر دەفـەرموێ: سـینگ‌و بـەرۆکیان داپۆشـن! نـەیانزانیوە کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ﴾، {(خُمرٌ) کـۆی (خِمـار)ە، (خمـار)یش یـانی: سـەرپۆش، کەواتە: سەرپۆشەکە لەسەر سەریانە، بۆیە پێـی دەگـوترێ (خمـار)، سەرپۆشـەو سەری داپۆشیون} ، بەڵام بـا بـەو زیـادەی سەرپۆشـەکە، سـینگ‌و بـەرۆکییان داپۆشن و، یەخەیان دیار نەبێ.

دوایی دەفەرموێ: با جوانیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر بۆ مێردیـان، یـاخود بابیان، تا کۆتایی.

١٠) کۆتا فەرموودە، کە لەو بارەوە دەیهێنین، ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێك (ئەسماء)ی کچی ئەبووبەکری سیددیقیی بینی (**خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ**)، کراسێکی لەبەردابوو، (دەبێ تەنك بووبێ)، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:

{يَا أَسْمَاءُ! إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتْ الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ لَهَا أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلا هَذَا وَهَذَا، وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ}[1].

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەی ئەسماء![2] ئافرەت کە بالّغ بوو، ناگونجێ لێی دیار بێ، مەگەر ئێرەی‌و ئێرەی، ئنجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئاماژەی کرد بۆ دەم‌و چاوی و دەستی.

یانی: دەم و چاوی و دەستی دەگونجێ دیار بن، ئەگەرنا پێویستە ئەوی دیکەی داپۆشێ، بە پۆشاکێك کە تەنك نەبێ گۆشتەکەی لەبنڕا دیار بێ، هەروەها تەسکیش نەبێ، کە ئەندامەکانی وێنا بکات و، بەرجەستەیان بکات.



١) أخرجه أبو داود: ٤٠٢، والترمذي: ١٧٦٧، وقال: حديث حسن.

٢) کە ئەسماء ژن خوشکی بووە، خێزانی (زُبیر بن عوّام) بووە، خوشکی عائیشەی خێزانی پێغەمبەرە، ئەسماء و عائیشە هەردووکیان کچی ئەبوو بەکری صیددیقن (**خوا لێیان ڕازی بێ**).

ئاڵقەی بیستەم:

# ئەدەبی فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند

بەڕێزان!

ئەم بابەتە، بابەتی فەرمان بە پەسند و ڕێگریی لە ناپەسند (الأمر بالمعروف والنّهي عن المنكر)، بابەتێكی زۆر فراوانە، لقو پۆی زۆری هەن و، زۆرێك لە زانایان، زانایانی پێشیو هی هاوچەرخ، كتێبی تایبەتییان لەسەر داناوەو، بەندەش لە چەند كتێبو بەرهەمێكی خۆمدا لەو بارەوە قسەم كردەوە،[1] بەڵام لێرەدا زۆر بە كورتییو پوختیی لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەتێكی قورئانی بەرزو بەپێز و، چەند دەقێكی سوننەتی پێغەمبەری بەڕێزدا (صلی الله علیه وسلم)، لە پێنج(٥) بڕگەدا: حوكم و پێناسەی و، ئەدەبو ڕەوشتەكانی و، چۆنیەتی ئەنجامدانی دەخەینەڕوو.

---

١) بڕوانە: موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله، الكتاب العاشر، ط٢٠١٩/٢م.
هەروەها كتێبی: {هەڵوەشاندنەوەی پەڕگیریی} چاپی دووەم: ٢٠١٩ز.

## بڕگەی یەكەم: پێناسەو گرنگیی و حوكمی، فەرمان بە پەسند و ڕێگریی لە ناپەسند:

١) لە سووڕەتی (آل عمران)-١٠٤-دا، خـوا (سبحانه وتعالى) دەفـەرموێ: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾﴾.

دیـارە دوێنـدراوان ئۆممـەتی پێغەمبـەرن (صلى الله عليه وسلم)، ئیمانـدارانن، دەفەرموێ: ئەی ئیماندارینە! با لە ئێوەدا كۆمەڵێك هـەبن، بانگـەوازی خـەڵك بكەن بۆ لای چاكەو، فەرمانیان بە هەرچی پەسندە پێ بكـەن و، ڕێگرییـان لـە هەرچی ناپەسندە لێ بكەن و، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

ئەم ئایەتە پێناسەو حوكم و پێگەو گرنگیی فەرمان بە پەسندو ڕێگریـی لـە ناپەسندمان بۆ دەردەخات.

شایانی گوتنە: ئەم ئایەتی (١٠٤)ی سووڕەتی (آل عمـران) دوو لێكدانـەوەی بۆكراون، بەپێی ئەوە، كـە ئایـا (مِـنْ)ی سـەر (مـنكم) ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ﴾، بـۆ هەندێك(تبعيض)ە، یاخود بۆ ڕوون كرنەوە(بيان)یە، ئەگـەر بـۆ هەنـدێك بێـت، واتە: با لەنێو ئێوەدا كۆمەڵێكی وا هەبن، ئەی مسوڵمانینە! بـەڵام ئەگـەر بـۆ ڕوونكردنەوە(بيان) بێ، واتە: ئێوەی ئەی مسوڵمانینە! كۆمەڵێكی بەو شـێوەیە بن.

ئنجـا ئەگــەر ئایەتەكـەی سـووڕەتی (آل عمـران)، ئــەو دوو لێكدانەوەیـە هەڵدەگرێ، ئایـەتی (٧١)ی سـووڕەتی (التوبـة) مانایەكـەی زۆر ڕۆشـنە، كـە

هەموو بڕواداران بە پیاو و ئافرەتەوەو، بە وردو درشتەوە، پابەند کراون بەوەوە کە دەبێ فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند بکەن:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾.

واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بە هەرچی پەسندە دەکەن و، ڕێگریی لەهەرچی ناپەسندە دەکەن و، نوێژ بەرپا دەکەن و، زەکات دەدەن و، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) دەکەن و، ئا ئەوانە خوا بەزەیی پێیاندا دێ، بێگومان خوا زاڵی کارزانە.

کەواتە: هەموو بڕواداران پابەند کراون، بە پیاو و ئافرەتەوە، کە: دۆست و پشتیوانی یەکدی بن و، هەموشیان لەبەرامبەر دینو ژینی کۆمەڵگای خۆیاندا هەست بە بەرپرسیاریەتیی بکەن و، هەوڵبدەن هەرچی شتی پەسندو باشە، بیچەسپێنن، لە کۆمەڵگاو دەوروبەریاندا و، هەرچی ناپەسندو خراپە، ڕیشەکێشی بکەنو کۆمەڵگاکەیانی لێ بژار بکەن.

شایانی باسە: کە زانایانی شارەزای زمانی عەرەبیی و، تەفسیر، دەڵێن: وشەی (المعروف و المنکر) کە (ألـ)ی ناساندن(تعریف)یان لەسەرە، ئەو (ألـ)ە لێرەدا، مەبەست پێی جینسە، واتە کۆی تاکەکانی پەسند دەبێ بچەسپێنن و، کۆی تاکەکانی ناپەسند، دەبێ ڕیشەکێش بکەنو لابەرن.

ئنجا ئەو پەسندانە، چ پەیوەندییان بە بواری بوونناسییەوە هەبێ، یان بواری ئیمان و عەقیدە، یان بواری پەرستشەکان، یان بواری باری کەسێتیی، یان بواری

هەڵسوكەوتە گشتییەكان و، ئەدەبە كۆمەڵایەتییەكان، یاخود بواری حوكم و سیاسەت، یان جەنگ‌و ئاشتیی، یان پەیوەندییەكان.

هەروەها ناپەسندەكانیش، پەیوەست بن بە هەر بوارێكەوە، مسوڵمانان لەسەریان فەرزە كۆمەڵگای خۆیان بڕازێننەوە بە پەسندەكان و، بژاری بكەن لە ناپەسندەكان.

٣) پێغەمبەری خواش دەفەرموێ: {إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوا الْمُنْكَرِ فَلَمْ يُغَيِّرُوهُ يُوشِكُ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابٍ}.[1]

واتە: هەر كاتێك خەڵك شتی ناپەسندو خراپیان بینی، {شتی ناشەرعییان بینی} و، نەیانگۆڕی، نزیكە خوا تێكڕا سزایەكیان بەسەردا بگشتێنێ.

واتە: سزایەكی گشتییان بۆ بنێرێ، پاك‌و پیسییان پێكەوە سزا بدات.

لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەش هەیە، كە وێڕای باسی فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند، كۆمەڵێك ڕاستیی دیكەشی گرتوونە خۆی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك یەكێك لە هاوەڵانی دوواند، بەناوی (أبو ثعلبة)، فەرمووی:

٢) {يا أَبَا ثَعْلَبَةَ! مُر بِالْمَعْرُوف وانْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ، فَإِذَا رَأَيْتَ شُحًّا مُطَاعًا، وَهَوًى مُتَّبَعًا، ودُنياً مُؤثَرةً، وَإِعْجَابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِهِ، فَعَلَيْكَ بِنَفْسِكَ وَدَعْ عَنْكَ الْعَوَامَّ، إِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ فتناً كقطع الليل المظلم، للمتمسِّك

١) أخرجه أحمد: ١٦، وابن أبي شيبة: ٣٧٥٨٣.

فيها بمثل الذي أنتم عليه، أجرُ خَمْسِين مِنْكُم، قِيلَ: بَلْ مِنهم يا رَسول الله؟ قَالَ: لا بَل مِنْكَم، لأنكم تجدون على الخير أعواناً}[1].

واتە: ئەی (أبو ثعلبة) فەرمان بە پەسند بکە و، ڕێگرییش لە ناپەسند بکە، (واتە: لە بەرامبەر کۆمەڵگای خۆتدا، بەرپرسیار بە، بەرپرسیاریەتیی خۆت ئەنجام بدەو، هەوڵبدە چاکەکانی تێدا بچەسپێنی و، خراپەکانی تێدا لابەری).

بەڵام کاتێك ئەو چوار دیاردەیەت بینین لە کۆمەڵگایەکەدات:

١- (فإِذَا رَأَيْتَ شُحًّا مُطَاعًا)، (شُحّ) واتە: ڕژدیی‌و چرووکیی، هەرکات سیفەتی ڕژدیی‌و چرووکییت بینی، خەڵك بە قسەی دەکرد، یانی: خەڵك ئەو سیفەتەی چرووکیی بەجۆرێك هەڵگرتبوو، کە ئەو سیفەتە فەرمانی پێ دەکردن.

٢- (وَهَوًى مُتَّبَعًا) هەروەها کاتێك بینیت کە ئارەزوو پەیڕەویی لێ دەکرا، لەجیاتی ئەوەی خەڵك بەدوای (هُدی) بکەوێ، بەدوای (هوی) دەکەوتن.

٣- (ودُنياً مُؤْثَرةً) هەروەها کاتێك بینیت، کە دنیا هەڵدەبژێررا بەسەر دواڕۆژدا، لەجیاتی ئەوەی خەڵك دواڕۆژ هەڵبژێرن، دنیایان هەڵدەبژارد بەسەر دواڕۆژدا.

٤- (وَإِعْجَابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِه)، هەروەها کاتێك کە بینیت هەر خاوەن بۆچوونێك بە بۆچوونەکەی خۆی سەرسام بوو، لەجیاتی ئەوەی هەر

---

١) {يَا أَبَا ثَعْلَبَةَ! ائْتَمِرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَتَنَاهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ، حَتَّى إِذَا رَأَيْتَ شُحًّا مُطَاعاً، وَهَوًى مُتَّبَعًا، وَدُنْيَا مُؤْثَرَةً، وَإِعْجَابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِهِ، وَرَأَيْتَ أَمْرًا لا بُدَّ لَكَ مِنْهُ، فَعَلَيْكَ نَفْسَكَ، وَدَعْ أَمْرَ الْعَوَامِّ، فَإِنَّ وَرَاءَكُمْ أَيَّامَ الصَّبْرِ، فَمَنْ صَبَرَ فِيهِنَّ، قَبَضَ عَلَى الْجَمْرِ، لِلْعَامِلِ فِيهِنَّ مِثْلُ أَجْرِ خَمْسِينَ رَجُلا يَعْمَلُونَ مِثْلَ عَمَلِهِ، وَزَادَنِي غَيْرُهُ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَجْرُ خَمْسِينَ مِنْهُمْ؟ قَالَ: أَجْرُ خَمْسِينَ مِنْكُمْ}

أخرجه الحاكم: ٧٩١٢، وقال : صحيح الإسناد، والترمذي: ٣٠٥٨، وابن حبان: ٣٨٥.

كامێكیان بڵێ: ئەوە بۆچوونی منە، دەگونجێ ڕاست بێ و، دەگونجێ هەڵە بێ، ڕێزیش لە بۆچوونەكانی بەرامبەرەكانی بگرێ، لەجیاتی ئەوە هەر كامێكیان بە بۆچوونی خۆی سەرسام بوو و، بۆچوونی ئەوانی دیكەی نادیدە دەگرت و، دەمارگیریی هەبوو بۆ ڕاو بۆچوونی خۆی.

كاتێك ئەو چوار حاڵەتەت بینین: (فَعَلَيْكَ بِنَفْسِكَ وَدَعْ عَنْكَ الْعَوَامَّ)، هەر لەگەڵ خۆت خەریك بەو واز لە خەڵك بێنە، بۆچی؟! چونكە كۆمەڵگایەك ئاوای لێ هاتبێ، خۆ لەگەڵ ماندوو كردنی بێ سوودە، كاتێك كۆمەڵگایەك زۆربەی تاكەكانی ئەو چوار سیفەتە خراپە هەڵبگرن و تەبەننیی بكەن: چرووكیی، شوێنكەوتنی ئارەزوو، هەڵبژاردنی دنیا، سەرسام بوون بە بۆچوونی خۆ و، گوێ نەدانو نادیدەگرتنی بۆچوونی ئەوانی دیكە، ئەوە كۆمەڵگای ئاوا، لێی دوور بی باشترە، یاخود ناتوانی كاری تێبكەی.

منیش لێرەدا دەڵێم: دەبێ ئەو هاوەڵە (خوا لێی ڕازی بێ) لەو جۆرە بووبێ، كە بۆی دروست بووبێ، ئاوا بكا، یاخود پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ وی وای بە سەلامەتتر زانیبێ، ئەگەرنا پێغەمبەران (صەلاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ) كە هاتوون، كۆمەڵگاكانیان، تاكەكانیان پڕبوون لە سیفەتە بەدەكان (رذائل)، وەك: كوفرو شیركو نیفاقو خۆبەزلگریی و ستەم و ڕژدیی و حەسەد و، زۆر زیاتریش، بەڵام پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) قۆڵیان هەڵماڵیوە لە پاكسازییو چاكسازیی كردن لە كۆمەڵگاكەی خۆیاندا، دەبێ ئاوا لە فەرمایشتەكەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تێبگەین، بەڵام وادیارە ئەو هاوەڵە، توانایەكەی هەر ئەوەندە بووەو، ئەگەر لەگەڵ كەسانێكی ئاوادا ڕووبەڕوو ببووایەوە، لێیان تووشی زەرەر دەبوو، بۆیە فەرموویەتی: هەر لەگەڵ خۆتدا خەریك بەو واز لە خەڵك بێنە.

لەدرێژەی فەرمایشتەکەدا دەفەرموێ: (إِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ فتناً كقطع الليل المظلم)[١] واتە: لە پشتتانەوە، یانی: بەرەو ڕووتان دێ و لە داهاتوودا، ئاشووب و بەڵای وا دێن، وەك پارچەکانی شەوی تاریك، یانی بەڵا لەسەر بەڵا دێن، گرفتاریی لەسەر گرفتاریی دێن.

(للمتمسِّك فيها بمثل الذي أنتم عليه أجر خَمْسِين مِنْكُم)[٢]، بۆ هەر کەسێك کە لەو کاتی ئەو فیتنەو بەڵایانەدا، دەست بگرێ بەوەوە کە ئێستا ئێوەی لەسەرن، یانی: ئەو ڕێبازەی کە پێغەمبەرو هاوەڵانی لەسەرن، دەست بەو ڕێبازەوە بگرێ، پاداشتی پەنجا(٥٠) لە ئێوەی هەیە، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) پەنجا لە خۆیان، فەرمووی: نەخێر، بەڵکو پەنجا لە ئێوە، ئەی هاوەڵان! ئنجا دوایی بۆی ڕوونکردنەوە بۆچی وایە؟، فەرمووی: (لأنكم تجدون على الخير أعواناً)، بۆیە ئەوان، یەکێکیان بەقەدەر پەنجا لە هاوەڵان پاداشتی هەیە، چونکە ئێوە لەسەر چاکە، هاوکاران زۆر دەبینن، بەڵام ئەوان هەر کامێکیان بەتەنێ لێی دەقەومێ لە کۆمەڵگایەکداو، کەس نابێ وەك پێویست هاوکاری بێ، لەبەر ئەوە کە زەحمەتی زیاترەو، قورسایی زیاتر دەکەوێتە سەرشان، پاداشتیشی زیاترە، بەڵام ئێوە هاوکاریی یەکدی دەکەن و لە ژینگەیەك دان، کە هەمووتان هاوکاری یەکدین لەسەر کاری خێرو چاکە.

---

١) أخرجه أحمد: (٣/٤٨٩، رقم ١٦٠٤٠).

٢) أخرجه الطبراني في الكبير (١٧/١١٧، رقم ٢٨٩)

## بڕگەی دووەم: قۆناغەکانی فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند:

یەکەم/ ناساندن:

پێویستە ئەو چاکەیە، یان ئەو خراپەیە بناسێندرێ، کە ڕەنگە هەر بە ناساندن و باسکردنەکەی، خەڵك چاکەکە بکات و واز لە خراپەکە بهێنێ، ئنجا ئەگەر ئەوە سوودی نەبوو، دەگوازرێتەوە بۆ قۆناغی دووەم.

دووەم/ ئامۆژگاریی کردن:

ئامۆژگاریی ئەوەیە کە بەشێوەیەك ئەو مرۆڤە بدوێنی، دڵی بجوڵێنی و، هانی بدەی، هەستو سۆزی بجووڵێنی، ئنجا ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو، دەگوازرێتەوە بۆ قۆناغی سێیەم.

قۆناغی سێیەم/ قسەی زبر و، سەرزەنشت کردن، لێ تووڕەبوون و، گلەیی لێ کردن، ئنجا ئەگەر ئەوەش هەر سوودی نەبوو و، تواناش هەبوو، دەگوازرێتەوە بۆ قۆناغی چوارەم.

قۆناغی چوارەم/ کە بەدەست و بەهێز ئەو خراپەیە بگۆڕرێ، یان ئەو چاکەیە بچەسپێنرێ.

## بڕگەی سێیەم: ئەدەبەكانی بابای فەرمان بە پەسندكارو ڕێگرییكار لە ناپەسند:

ئەو كەسە، سێ ئەدەبی سەرەكیی و گرنگی هەن، بێگومان ئەدەبی زۆرن، بەڵام ئەو سێیە لە هەموویان بنەڕەتییترن:

١- دەبێ زانیاریی هەبێ بەو شتە، كە دەیەوێ بیچەسپێنێ لە پەسند، یان بەو شتە كە دەیەوێ لایبەرێ لە ناپەسند، دەبێ پێی شارەزا بێ.

٢- دەبێ بۆخۆی پارێزكار بێ و، خۆی لەو خراپەیە پاراستبێ و، ئەو چاكەیەشی كردبێ.

٣- دەبێ ڕەوشتێكی بەرزو جوانی هەبێ، خۆڕاگر بێ، هێمن بێ، ئارام بێ، قسە شیرین بێ، ڕووخۆش بێ.

لەوبارەوە گوتراوە: (ءُأْمر بالمعروف بالمعروف، وانْهَ عن المنكر لا بالمنكر)، واتە: بەشێوەیەكی چاك فەرمان بە پەسند بكەو، ڕێگریی لە ناپەسند بكە، بەڵام بەشێوەیەكی ناپەسند نا.

## بڕگەی چوارەم: مەرجەکانی فەرمانکردن بە پەسندو ڕێگریی کردن لە ناپەسند:

مەرجەکانی فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسندیش، چوارن:

١- دەبێ ئەو خراپەیە، فیعلەن خراپەیەکی ناشەرعیی بێ و، پەسندەکەش بەڵگەی لەسەر بێ.

٢- دەبێ لەو کاتەدا ئەو خراپەیە هەبێ، کە دەویسترێ لابرێ و، پەسندەکەش پێویست بێ بچەسپێ.

٣- دەبێ ئەو خراپەیە دیارو زانراو بێ، نەك بەهۆی جاسووسیی کردنەوە دەرکەوێ، هەروەها پەسندەکەش پشتگوێ خرانی دیاربێ.

٤- دەبێ خراپەکە، یان چاکەکە، یەکدەنگیی زانایانی لەسەر بێ، یاخود زۆرینەی زانایان، نەك شتێك بێ کە ڕاجیایی هەڵبگرێ، چونکە لەو شتانەدا کە ڕاجیاییان لەسەرە، فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند ناکرێ، چونکە دەڵێ: بۆچی وا دەکەی؟ دەڵێ: بە فلان مەزهەبە وا دەکەم و، تۆش لەسەر مەزهەبێکی دیکەی!

## بڕگەی پێنجەم: فەرمان بە پەسند و ڕێگریی لە ناپەسند، لە سزا شەرعییەکان جیان:

بەڵێ فەرمان بەپەسندو ڕێگریی لە ناپەسند جیایە، لە سزاو سنوورە شەرعییەکان، کە هەندێ کەس تێکەڵیان دەکا! یانی: کەسێك، کەسێك دەبینێ شەراب دەخواتەوە، بۆی نیە بچێ بڵێ: دەبێ هەشتا(٨٠) قامچی لێ بدەم، با دەسەڵاتیشی هەبێ، هەر دەتوانێ ئامۆژگاریی بکات و نەهێڵێ بخواتەوە، ئەمما سزادانەکەی، ئەوە لەلایەن دەسەڵاتی شەرعییەوە دەچەسپێندرێ، نەك هەر کەسێك ڕاستبۆوەو خەڵك سزا بدات، لەسەر ئەوەی کە شتێکی ناشەرعیی کردوە، چونکە ئەوە پێویستیی بە بەڵگەو ئیسپات هەیەو، دەبێ لایەنی پەیوەندییداریش، کە دەسەڵاتی شەرعییە، بەو کارە هەڵسێ.

بەڕێزان!

وەك گوتم، بابەتی فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند، بابەتێکی فراونە، بەڵام ئێمە بەم کورتە باسە لەبارەی هەندێ لە ئەدەبەکانیەوە، ئیکتیفا دەکەین.

بەڕێزان!

ئەم ژینگەیە، کە خوا (سبحانه وتعالى) ئێمەی تێدا داناوە: بەرگە هـەوا، بەرگـە ئاویی، ئنجا ئەم سەر زەوییە، ئەم هەموو نازو نیعمەتانە، خوا ئێمەی لـە نـازو نیعمەتو چاکەکانی خۆیدا نوقم کردوەو، پێویستە ئێمەش مامەڵەیەکی بـاشو تەندروست لەگەڵ ژینگەو، نیعمەتەکانی خواو، دەوروبەرماندا بکەین.

با تەماشا بکەین داخۆ خوای بەخشەر و، پێغەمبـەری سـەروەر(صلى الله عليه وسلم) چۆن فەرمانیان کردوە، کە لەگەڵ ژینگەدا مامەڵە بکەین:

١) لە سووڕەتی (الأعراف) ئایەتەکانی (٥٦ و ٨٥)دا، لە هەردووکیاندا ئـەم ڕستەیە دووبـارە بۆتـەوە، خـوا دەفـەرمویّ: ﴿ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا ﴾.

واتە: دوای ئەوەی زەوی چاك دروستكراوەو، چاکسازیی تێـدا کـراوەو، بـاش کراوە، تێکدانو خراپەکاریی تێدا مەکەن.

واتە: خوا ئەم سەر زەوییەی باش خوڵقاندوەو، پڕی کردوە لە نازو نیعمەت و، زۆر ڕێكو پێکە، ئێوەش بەهۆی تەماعو، بەهۆی دەستدرێژیی کردنە سەر مافی ئەوانی دیکەو، بەهۆی قۆرخکارییەوە، خراپەکاریو تێکدان لە زەوییدا مەکـەن و، ژینگە تێك مەدەن.

٢) لە ئایەتی (٤١)ی سوورەتی (الروم)دا، خوا دەفەرمویّ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾.

واتە: خراپەو ئاشووب لە وشکانییو دەریادا دەرکەوت، بەهۆی کردەوەی خەڵکەوە، تاکو بەشێك لەوەی کە دەیکەن، {سزای بەشێك لە خراپەکانیان} پیّ بچێژێ، بەڵکو بگەڕێنەوە.

ئەم ئایەتە موبارەکە، هەروەك ئێستا دابەزیبیّ، وایە: ئێستا زانایانو شارەزایانی گەردووونناسو ژینگەناس دەڵێن: گەورەترین کێشەمان ئەوەیە، کە ئێستا بەشەر لە ئەنجامی بەرەو پێشچوونی تەکنۆلۆژیادا، بەتایبەتی تەکنۆلۆژیای سەربازیی و، بەهۆی ئەو دووکەڵەوە کە کارگەکانی دروستکردنی چەك فڕێی دەدەنە نێو هەوا، گەورەترین کێشەی ئەم ڕۆژگارە پیسبوونی ژینگەیە بەگشتی و، پیسبوونی هەوایە بەتایبەت، کە لە ئەنجامی ئەوەدا ڕێژەی دووەم ئۆکسیدی کاربوون و مادەە زیان بەخشەکان زیاد دەبیّ، چینی ئۆزۆن، کە ڕێگا دەدا بە ئەندازەیەك لە تیشکی ژێر سوورو تیشکی سەرووی وەنەوشەیی بێتە نێو مەودای زەوییەوە، ئەو شوێنەی کە مرۆڤ لەسەری دەژی، بەڵام لە ئەنجامی کونبوونی چینی ئۆزۆندا، زیاد لە ئەندازەی پێویست لە تیشکی ژێر سوورو سەرووی وەنەوشەیی دێت و، لە ئەنجامی ئەوەشدا: ژینگە تێك دەچیّ، ئەوەتا بەستەڵەکەکانی باکووری زەوی دەتوێنەوەو، دەبێتە لافاو و لێزماو و، هاوسەنگیی ژینگەیی (التوازن البيئي) تێك دەچیّ، ئنجا وەك زانایان و شارەزایان دەڵێن: هۆکاری سەرەکیی ئەوەش ئەو دووکەڵو گازانەی ژینگە

تێکدەدەن، بەتایبەت بەرگە هەوا، هی ئەو کارگانەیە کە چەکی قورس دروست دەکەن.

دەوڵەتەکانی دنیا کاتی خۆی ڕێککەوتننامەیەکیان کرد لە یابان لە شاری (کیۆتۆ)، بەناوی (ڕێککەوتننامەی کیۆتۆ)، هەموویان پێیەوە پابەند بوون، جگە لە ئەمریکا، ئەمریکا ئامادەنەبوو پێیەوە پابەند بێ و، لە دروستکردنی چەکی قورس کەم بکاتەوە، بۆ ئەوەی ژینگە زیاتر تێك نەچێ و، بەرگە هەوا کەمتر کون ببێ، ئەمریکا لەبەر تەماعی خۆی، ئامادەنەبوو، بەو ڕێککەوتننامەیەوە پابەند بێ! بۆیەش خوا دەفەرمویٚ: خراپەکاریی و تێکدان، وشکانیی‌و دەریای گرتۆتەوە، بەهۆی کردەی دەستی خەڵکەوە، تاکو بەشێك لە سزای خراپەکانیان پێ بچێژێ، بەڵکو بگەڕێنەوە.

ئنجا بە تەماشای چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەین:

٣) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ، وَلَيْسَ لِعِرْقِ ظَالِمٍ حَقٌّ }.[1]

واتە: هەر کەسێك زەوییەکی بەیار زیندوو بکاتەوە، {زەوی مردوو زیندوو بکاتەوە} هی خۆیەتی، بەڵام کەسێك کە بەزۆر دەستی بەسەر شوێنێك داگرتبێ حەقی نیە.

(عِرق) یانی: دەمار، یانی کەسێك کە بابی شوێنێکی داگیر کردوە، ئنجا بۆ کوڕەکەی بە میرات بەجێماوە، بەوە کە بەمیرات بۆی بەجێماوە، مادام لە ئەسڵدا بە زوڵم داگیر کرابێ، بۆی ڕەوا نیە، وەك هەموو ئەوانەی کە لە وڵاتی ئێمەدا، زەوی کشتوکاڵ داگیر دەکەن و، ڤێللای لەسەر دروست دەکەن و، بۆ

١) أخرجه أبو داود: ٣٠٧٥، وصححه الألباني.

بەرژەوەندیی شەخسیی بەکاری دێـنن، لـە حاڵێکـدا کـە هـی خەڵکـە، بـا بـە میراتیش بگیرێ، نابێتە حەق.

٤) فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلی اللـه علیـه وسـلم) دەفەرموێ: {إِنْ قَامَت السَّاعَةُ وَبِيَدِ أَحَدِكُمْ فَسِيلَةٌ، فَإِنْ اسْتَطَاعَ أَنْ لاَ يَقُومَ حَتَّى يَغْرِسَهَا فَلْيَفْعَلْ}[1]، واتە: ئەگـەر قیامـەت هەڵسـا، (قیامـەت ڕابـوو)، یەکێکیشتان نەمامێکی لە دەستدا بوو، ئەگەر توانی نەهێڵێ دنیا تێـك بچـێ، پێش ئەوەی بینێژێ، با نەمامەکە بنێژێ.

یانی: ئەگەر پێش دنیا تێکچوونیش نەمامەکەی ناشت، با بینێژێ، کەواتـە: سەرزەوی ئاوەدان کردنەوە، زۆر کردنـی سـەوزایی لەسـەر زەوی، یەکێکـە لـە ئامانجە شەرعییەکان.

٥) فەرمایشتێکی دیکە لەو بارەوە:

{عَنْ سَوَادَةَ بْنَ الرَّبِيعِ قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صلى اللـه عليـه وسـلم) فَسَـأَلْتُهُ فَـأَمَرَ لِي بِذَوْد ثُمَّ قَالَ لِي إِذَا رَجَعْتَ إِلَى بَيْتِكَ فَمُرْهُمْ فَلْيُحْسِنُوا غِذَاءَ رِبَاعِهِمْ وَمُرْهُمْ فَلْيُقَلِّمُوا أَظْفَارَهُمْ وَلاَ يَعْبِطُوا بِهَا ضُرُوعَ مَوَاشِيهِمْ إِذَا حَلَبُوا}[2].

واتە: سەوادەی کوڕی ڕەبیع دەڵێ: چوومـە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیـه وسـلم) پرسیارم لێکرد، فەرمانی بە سێ شت پێکردم، پاشـان فـەرمووی: ئەگـەر چـوویەوە بـۆ مـاڵێ، پێیـان بڵـێ، (واتـە: بـە ماڵـەوەتان): ............، فەرمانیشیان پێ بکـە، بـا نینۆکـەکانیان بکـەن، تـاکو لـە کاتێکـدا، گـوانی ئاژەڵەکانیان دەدۆشن، بە نینۆك بریندایان نەکەن.

---

١) أخرجه أحمد: ١٣٠٠٤، وعبد بن حميد: ١٢١٦، والبخاري في الأدب المفرد: ٤٧٩، وصححه الألباني.
٢) أخرجه أحمد: ١٦٠٠٣، والبغوي: ١١٧٩، والطبراني: ٦٤٨٢، والبيهقي: ١٥٥٩٨.

سەرنج بدەن!

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چەند بە وردیی ئامۆژگاریی خەڵکی کردوە، با نینۆکیان درێژ نەبێ، چونکە ئەگەر نینۆکیان دڕ و درێژ بێ، کە دەستیان لە گوانی ئاژەڵەکانەوە گرت، تاکو بیدۆشن، بە نینۆکیان گوانەکانیان بریندار دەکەن!

٦) فەرمایشتێکی دیکە لەو بارەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِيَّاكُمْ أَنْ تَتَّخِذُوا ظُهُورَ دَوَابِّكُمْ مَنَابِرَ}[1].

واتە: خۆتان بپارێزن، لەوەی کە پشتی وڵاخەکانتان بکەنە دوانگە {بیکەنە کورسیی قسە لەسەرکردن}.

واتە: بە سواری پشتی وڵاخەکانتان پێکەوە ڕامەوەستن‌و پێکەوە قسان بکەن!

بەڵکو ئەگەر قسەی دەکەی دابەزەو، ئەگەر دەڕۆی بڕۆ، بەڵام کاتێك کە قسەی دەکەی، یان وتار دەدەی، با لەسەر پشتی وڵاخەکەت نەبی.

٧) لەبارەی پاك ڕاگرتنی دەوروبەرەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە: دەفەرموێ: {لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ، ولا يَغْتَسِلُ مِنْهُ مِنْ جَنَابَةٍ}[2].

واتە: با یەکێکتان لە ئاوێکدا کە وەستاوە، میز نەکات و، با بۆ لەشپیسیی لەخۆی دەکردنیش، خۆی تێدا نەشوات.

هەڵبەتە ئاوێك، کەسێك میزی تێ بکات و، دواتر خۆشیی تێدا بشوات، ئەوە بە تەئکید دروست نیە، چونکە ئاوەکە پیس دەبێ، مادام ئاوەکە کەم و

---

١) الطحاوي في شرح مشكل الآثار، ج١، ص٣٠.

٢) أخرجه البخاري: ٢٣٦، ومسلم: ٢٨٢، وأبو داود: ٦٩، واللفظ له.

وەستاو بێ، هەڵبەتە ئەگەر بەحرێك بێ، یـان ئـاوێكی زۆر بـێ، ئـەوە جیایـە، لێرەدا مەبەست پێی ئاوێكی سنووردارە.

٨) هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە:

{نَهَى (صلى الله عليه وسلم) عَن البول فِي المَـاءِ الرَّاكِـدِ} [١]. واتـە: پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی كردوە لە ئاوێكی وەستاودا میزی تێدا بكرێ.

كە وەك گوتمان: مەبەست ئاوێكی وەستاوی سنووردارە.

٩) هەروەها لەو بارەوە ئەم فەرمایشتەش هەیە:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {اتَّقُوا الْمَلاَعِنَ الثَّلاَثَ: الْـبَرَازَ فِي الْمَوَارِدِ، وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ، وَالظِّلِّ} [٢] خۆتان لە سێ شـوێنەكان بپـارێزن، كـە بەهۆیانەوە نەفرینتان لێ دەكرێ و، قسەتان پێ دەگوترێ.

١- پیسایی كردن، لە ئاو و ڕووبارو سەرچاوە دا.

٢- تارەت گرتن لەسەر ڕێگا، بەتایبەتی پیسایی كردن لەسەر قەراغی ڕێگا.

٣- لەژێر سێبەری درەختدا، كە خەڵك پشووی لێ دەدا.

بەتایبەت بۆ ئەو خەڵكانەی كە گەشتە بەهارە دەكەنو، دەچنە دەرو دەشـت، زۆر پێویستە وریای ئەوانە بن، جـاری وا هەیـە كۆمـەڵێك دەچـن ئـەوێ پـیس دەكەن، دوایی خەڵكێكی دیكـە بـۆ سـبەینێ كـە دەچـن، شـوێنێك نیـە لێـی دابنیشن!

---

١) أخرجه مسلم: ج٣، ص١٤٤، والنسائي: ١٤.

٢) أخرجه أبو داود: ٢٦، وابن ماجه: ٣٢٨، والحاكم: ٥٩٤، وقال: صحيح الإسناد، ووافقه الذهبي.

١٠) لەوبارەوەش کە پێویستە لەگەڵ پەڕەندەکاندا، مامەڵەی جوان بکەین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ قَتَلَ عُصْفُورًا عَبَثًا، عَجَّ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قَالَ: يَا رَبِّ إِنَّ فُلانًا قَتَلَنِي عَبَثًا وَلَمْ يَقْتُلْنِي لِمَنْفَعَةٍ}[1].

واتە: هەرکەسێك چۆلەکەیەك، باڵندەیەك بکوژێ بە گاڵتە، {واتە: بەبێ ئەوەی کە پێویستیی بە گۆشتەکەی بێ، هەر لەخۆڕا، بۆ کەیفە بیکوژێ}، لەڕۆژیی دواییدا دەنگ بەرزدەکاتەوەو پەنا بۆ خوا دەبا، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! فلانکەس منی کوشت، هەر بە هەوەنتەو بە گاڵتەو، بۆیە نەیکوشتم کە سوودم لێ ببینێو لێم بەهرەمەند بێو، {پێویستیی بە گۆشتەکەم بێ}، واتە سکاڵای خۆی لەلای خوای دادگەر دەکات.

١١) فەرمایشتێکی دیکە هەر لەو بارەوە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێنماییمان دەکات بۆ چۆنیەتی سەربڕینی ئاژەڵێك کە سەری دەبڕین، یاخود کوشتنی نێچیرێك کە دەیکوژین، یان سەری دەبڕین، دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذبحة، وليُحِدَّ أحدُكم شَفرته وليُرِح ذبيحته}[2]

واتە: خوا (سبحانه وتعالى) پێویستی کردوە لەسەر هەموو شتێك، کە بەشێوەیەکی باش و، ڕێكو پێك ئەنجام بدرێ، بۆیە ئەگەر یەکێك لە ئێوە، نێچیرێکی کوشت، با بە جوانیی بیکوژێ، {وای لێ نەکات لەتو پەتی بکات}، هەروەها ئەگەر یەکێك لەئێوە ئاژەڵێکی سەربڕی، با جوانی سەربڕێ و، با چەقۆیەکەی چاك تیژ بکات و، زوو سەربڕاوەکەی ئاسوودە بکا، نەك

---

١) أخرجه أحمد: ١٩٤٨٨، والنسائي: ٤٤٤٦، وابن حبان: ٥٨٩٤.

٢) أخرجه مسلم: ١٩٥٥، وأبو داود: ٢٨١٥، والترمذي: ١٤٠٩، وقال: حسن صحيح.

بەچەقۆیەکی کول، خێشەخێش، خۆشی ماندوو بکات و، ئەو ئاژەڵەش ئەزیەت بدا.

خوشكو برایانی بەڕێز!

مامەڵە کردن لەگەڵ ژینگەداو، لەگەڵ پێکهاتەکانی ژینگەدا، لە ئیسلامدا زۆر گرنگیی پێدراوەو، لە ڕاستییدا ئایەتەکەی کە هێنامانەوە، ئەو ڕستە قورئانییەی کە وەك گوتمان هەم لە ئایەتی (٥٦) و هەم لە ئایەتی (٨٥)ی سووڕەتی (الأعراف)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ﴾، سەرزەوی تێك مەدەن، وێرانکاریی تێدا مەکەن، دوای ئەوەی کە چاککراوە، واتە: چاك دروست کراوەو، پڕکراوە لە نازو نیعمەت، تێکی مەدەن و، خراپی مەکەن، بەهۆی دەستکاریی و خراپەوە، بەهۆی تەماعو چاوبرسێتییتانەوە، بەهۆی پەلەکردنتان لە زیاتر سەروەتو سامان وەسەریەکنان، ئەمە هەموو شتەکانی دیکە دەگرێتەوە نێو خۆی، چونکە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ﴾، لەسەر زەمیندا تێکدانو خراپە مەکەن، دوای ئەوەی خوا چاکی دروستکردوە، سەرزەمین چ گڵەکەی و چەو و لم و بەردەکەی، چ ئاوەکەی، چ بەرگە هەوایەکەی، چ دارودرەختەکەی، چ ژیاندارەکانی و، زیندەوەرەکانی و، پەلەوەرەکانی، چ کانزایەکانی: ئەوەی کە لەژێر زەویی دایەو، ئەوەی لەسەر زەوییە، هەمووی دەگرێتەوە.

مرۆڤەکان فەرمانیان پێکراوە، کە مامەڵەی چاك لەگەڵ ژینگەو، پێکهاتەکانی و، لەگەڵ نازو نیعمەتەکانی خوادا بکەن، بۆ ئەوەی شتێك نەکەن،

پێچەوانەی شوکری نیعمەتی خوا بێ و، شتێك نەکەن، پێچەوانەی بەرژەوەندیی کۆی مرۆڤەکان بێ، ئنجا با خەڵکێك یان دەوڵەتێك، یان چەند کەسێك، لەوە بەهرەمەند ببێ، لەو شێوە مامەڵەیە، بەهرەیەکی تایبەتیی لێ وەربگرێ، بەڵام دوایی زیانێکی گشتی دەبێ، وەك باسمان کرد: ئێستا لە ئەنجامی ئەو کارگانەی دروستکردنی چەکدا، چینی ئۆزۆن کون بووەو، بەرگە هەوا پیس بووەو، ژینگە پیس بووەو، زۆر لە پەلەوەرەکان و ژیاندارانی دەریا و وشکانیی دەمرن.[1]



١) لەم ڕۆژانەش دا ئاگرێکی بێڕەزا بەربۆتە دارستان و لێڕەوارەکانی ئوسترالیا، کە ماوەیەکی زۆرە بەردەوامەو نەیانتوانیوە خامۆشی بکەن!

ئاڵقەی بیست و دووەم :

# ئەدەب لە بواری خوێندن و فێربوون دا

بەڕێزان!

ئەم بوارەش چەند ئەدەبو ڕەوشتێكی تێدا بە مەرج گیراون، ئنجا ئێمە هەوڵدەدەین، ئەوانەیان كە پێویستترن، یان ئەوانەیان كە سەرەكییترن، یان ئەوانەیان كە زیاتر جەختیان لەسەر كراوەتەوە، ئاماژەیەكیان پێ بكەین.

خوا پشتیوان بێ ئەم بابەتە بەكورتیی و گوشراویی لە چوار (٤) بڕگەدا دەخەینەڕوو:

**بڕگەی یەکەم: پێگەی زانستو زانایان:**

بێگومان ئایـەتو فەرمایشـت زۆرن لـەبارەی مـەدحو ستایشـی زانایـانو، مەدحو ستایشی زانست و، ئێمە ئاماژەیەکی کورت بە هەندێکیان دەکەین.

١) لە سووڕەتی (المجادلـة) ئایـەتی (١١)دا، خـوا دەفـەرموێ: ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ﴾.

واتە: خوا ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوە، بەرزیان دەکاتەوە، بەڵام ئەوانەتان کە زانیارییان پێدراوە، بە چەندان پلە، {واتـە: چـەندان پلـە زیـاتر لـە بڕوادارانـی گشتی، بەرزیان دەکاتەوە}.

٢) لە سووڕەتی (فاطر)، ئایـەتی (٢٨)دا، خـوا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُا۟﴾.

واتە: بەدڵنیایی تەنیا بەندە زاناکان (وەك شایستەیە) سامو هەیبەتی خوایـان هەیە.

زانایان (العلماء) لێرەدا بەپێی سیاقی ئایەتەکە دەردەکـەوێ، کـە مەبەسـت پێی زانایانی گەردووناسو سروشتناسـە، چـونکە خـوای زانـا لـەپێش ئـەوەدا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾

وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مُخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَۗ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر: ٢٧-٢٨.

کەواتە: بە تەئکید مەبەست پێی ئەو زانایانە، کە بە سروشتو گەردوونو، بە یاساکانی خوا لە گەردووندا، شارەزان، چونکە ئایەتەکان باسی ئەوە دەکەن: ئایا سەرنج نادەی! خوا چۆن ئاوی لەسەرێوە ناردۆتە خوار، چەندان میوەو دارودرەختی ڕەنگاو ڕەنگو، ڕەنگ جیاوازی پێ هێناونە دەرێ، هەروەها لە چیاکان، خەت و هێڵە سپی و سوورە ڕەنگ جۆراوجۆرەکان و ڕەشی تۆخ، پاشان لە خەڵك و لە ژیانداران و لە ئاژەڵان، هەموویان ڕەنگیان جیا جیایە، {دوایی دەفەرموێ:} بە تەئکید تەنیا بەندە زانایەکان سامو هەیبەتیان بەرامبەر بە خوا هەیە.

٣) هەروەها لەبارەی گرنگیی زانستو، بەرزی پێگەی زانایانەوە، بەتایبەت ئەوانەی کە لە وەحییو شەریعەتی خوادا شارەزان، ئەم فەرمایشتەش هەیە: {مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ}[1] .

واتە: هەرکەسێك خوا چاکەی بۆی بوێ، لە ئاییندا باش و ورد شارەزای دەکات.

ورد شارەزای دەکا، چونکە (فقە) بریتیە لە ورد تێگەیشتن و شارەزایی ورد و قووڵ.

١) أخرجه البخاري: ٧١، ومسلم: ١٠٣٧.

٤) فەرموودەیەکی دیکە ئەوەیە کە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ مَلْعُونٌ مَا فِيهَا إِلَّا ذِكْرُ اللَّهِ وَمَا وَالاَهُ أَوْ عَالِمٌ أَوْ مُتَعَلِّمٌ}[1].

واتە: دنیا نەفرینی لێکراوەو، هەر شتێکی تێشیدایە نەفرینی لێکراوە، جگە لە یادی خوای بەرز و، هەر شتێك پەیوەندیی بە یادی خواوە هەیەو، جگە لە زانایەك، یاخود فێرخوازێك.

واتە: ئەم ژیانە دنیاییە لەلای خوا هیچ نیەو، پووچە، مەگەر شتێك پەیوەندیی بە یادی خواوە هەبێ، یادی خواو ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە یادی خواوە هەیە، یان زانایەك، یاخود فێرخوازێك کە دەیەوێ شارەزا بێ لە ئایینو بەرنامەی خوای پەروەردگاردا.

بەڵێ ئینسان بەبێ ئیمان، لەسەر بوونەکەی خۆی قەرزدار دەبێتەوە، خوا مرۆڤی لەم سەر زەوییە داناوە، ئەگەر خاوەنی خۆی نەناسێ و، ئەرکی خۆی نەزانێ و، نەزانێ بۆچی هاتوەو، کێ هێناویەتی و، بۆ کوێ دەچێ و، دەبێ چی بکات و، چۆن بکات؟!! لەسەر بوونەکەی قەرزدار دەبێتەوە.



1) أخرجه الترمذي: ٢٣٢٢، وقال حديث حسن.

## بڕگەی دووەم: حوكمی فێربوونو فێركردنی زانست

بێگومان هەم فێربوونی زانست فەڕزەو، هەم فێركردنی زانستیش بە خەڵك هەر فەڕزە.

أ- بۆ ئیسپاتی ئەوە كە فێربوونی زانست فەڕزە، دەتوانین زۆر بەڵگان بێنینەوە، یەكێك لەوانە:

١- لە سوورەتی (طـه)-١١٤-دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾ ، خوا بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: بڵێ: پەروەردگارم! زانیاریم بۆ زیاد بكە.

ئنجا ئەوە كە خوا بە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فەرمووە، لە سوورەتی (طه)داو، سوورەتی (طه)ش سوورەتێكی مەككەییە، بێگومانیش خوا چی پێ فەرمووە، جێ بەجێی كردوە، كەواتە: كە خوا فەرموویەتی: بڵێ: پەروەردگارم! زانیاریم بۆ زیاد بكە، بەدڵنیایی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وایفەرمووەو، ئەو پاڕانەوەیەی كردوە.

ئنجا ئەم ئایەتەش ئایەتێكی مەككەییە، كەواتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەرەتای پێغەمبەرایەتییەوە تا كۆتایی تەمەنی، هەمیشە لە پەروەردگاری پاڕاوەتەوە: زانیاریی بۆ زیاد بكات.

٢- لە سووڕەتی (التوبة)-١٢٢-دا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴾ .

ئەم (لولا)یە بۆ هاندان(تحضيض)ە، واتە: دەبووایە لەهەر کۆمەڵێکی زۆری مسوڵمانان، کۆمەڵێکی کەمیان دەربچن، ﴿لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ ﴾، بۆ ئەوەی لە ئاییندا شارەزا بن و، زانیاریی شەرعیی وەدەست بێنن، {ئەوەی کە لە شارەکەی خۆیان، لە وڵاتەکەی خۆیاندا نیە، با بچن لە شوێنانی دیکە وەدەستی بێنن}.

ئنجا ئایا ئامانجی وەدەستهێنانی زانست چییە؟!

﴿وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ﴾، تاکو دوایی خەڵکەکەی خۆیان هۆشیار بکەنەوە، کە گەڕانەوە بۆ لایان، وریایان بکەنەوەو، هۆشیار و بێداریان بکەنەوە، ﴿لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴾ بەڵکو ئەوانیش وریایی خۆیان وەربگرن‌و، تووشی گوناهو تاوان‌و لادان نەبن.

کەواتە لەسەر مسوڵمانان بەگشتی فەرزەو، لە هەر کۆمەڵە خەڵکێکیش: کەمێکیان سەرگەرمی وەدەستهێنانی زانست بن، چ جۆرە زانستێك؟ لە ڕاستییدا هەموو جۆرەکانی زانست، هەرچەندە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ ﴾، بەڵام دینیش بەرنامەی هەموو ژیانەو، تۆش کاتێك دەتوانی دینداریییەکی ڕاست‌و دروست بکەی، کە لە هەموو بوارەکانی دین‌و ژیاندا شارەزا بی، چونکە دین(ئیسلام) پەیوەندیی بە لایەنی حوکم‌و سیاسەتەوە و، بەلایەنی ئابوورییەوە و، بە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە هەیە، هەروەك چۆن

پەیوەندیی بە لایەنەکانی بوونناسییو فیکرو، ئیمانو عەقیدەو، پەرستشەکان و، ڕەوشتو، باری کەسێتییەوە هەیەو، پەیوەندیی بە بوارەکانی دیکەی ژیانیشەوە هەیە.

٣) بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ئەوە، کە پێویستە مرۆڤ زانست داوا بکات، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێ: {طَلَبُ العِلْمِ فَرِيْضَةٌ عَلَىْ كُلِّ مُسْلِمٍ}[1] واتە: وەدەستهێنانی زانست، بەدوای زانستدا گەڕان، لەسەر هەموو مسوڵمانێك فەرزە.

هەموو مسوڵمانێك، واتە: نێر بێ یان مێ بێ، ورد بێ یان درشت بێ.

٤) هەروەها خوا (سبحانه وتعالى) یەك ڕستەی هەم لە سوورەتی (النحل)و، هەم لە سوورەتی (الأنبياء)دا دووبارە کردۆتەوە، لە سوورەتی (النحل)دا، ئایەتی: (٤٣) و، لە (الأنبياء)دا، ئایەتی (٧)، دەفەرموێ: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ ، واتە: ئەگەر نازانن، لە زانایان بپرسن، لە شارەزایان بپرسن.

کەواتە فەرزە ئینسان زانست پەیدا بکات، ئنجا زانایان دەڵێن: ئەو زانستە فەرزە پەیدای بکەی، کە بۆ جێ بەجێ کردنی فەرزەکان پێویستتەو، ئەو زانستە پەسندە پەیدای بکەی، کە بۆ جێ بەجێ کردنی پەسندەکان پێویستەو، ئەو زانستە کە ڕەوایە پەیدای بکەی، بۆ ئەو شتانەیە کە ڕەوان.

بەڵام هەر شتێك فەرزێك پەکی لەسەر کەوتبێ، ئەویش فەرز دەبێ، (ما لا يتم الواجب إلاّ به فهو واجب)، ئنجا ئەو شتانەی کە فەرزن، چ فەرزی تایبەتیی

[1]) أخرجه ابن ماجه: ٢٢٤، والبيهقي في شعب الإيمان: ١٦٦٥، وصححه الألباني.

(فرض العين) بن، چ فەرزی گشتی (فرض الكفاية)، تۆ بەبێ زانیاریی، ناتوانی ئەو ئەركە جێ بەجێ بكەی، كەواتە وەدەستهێنانی ئەو زانیارییەی كە ئەو فەرزەی پێ جێ بەجێ دەكەی، لەسەرت فەرزە.

ئنجا ئێستا تاك تاكی مسوڵمانان لەسەریان فەرزە، ئەو زانیارییە پەیدا بكەن كە واجبە تایبەتییەكانیان (الفروض العينية)ی پێ جێ بەجێ بكەن، وەك بوونناسی و، ئیمانو عەقیدەو، پاشان پەرستشەكانو، ڕەوشتو ئاكارو ...هتد، بەهەمان شێوە لەسەر (كۆ)شیان فەرزە، لەسەر هەموویان فەرزە: ئەو زانستانە پەیدا بكەن، كە بەڕێوەچوونی ژیانیان پێویستیی پێیانە، لە ڕووی سیاسیی و، ئابووریی و، كۆمەڵایەتیی و، جەنگو ئاشتیی و، ...هتدەوە، وەدەستهێنانی ئەو زانستانەشیان لەسەر فەرزە.

ب- بەڵگەش لەسەر ئەوە، كە فەرزە مرۆڤ غەیری خۆی فێری زانست بكات، زۆرن، یەكێك لەوانە ئەم ئایەتەیە:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ ﴾.

واتە: یاد بكەوە كاتێك خوا پەیمانی پتەوی، لەوانەی كتێبیان پێدراوە، وەرگرت، كە دەبێ بۆ خەڵكی ڕوون بكەنەوەو نەیشارنەوە.

دەبێ ئەو زانستەی پێتان دراوە، بۆ خەڵكی ڕوون بكەنەوە، چونكە ئەوە ئەمانەتێكی خوایەو، دەبێ بە خەڵكی ڕابگەیەنن و، نەیشارنەوە، بە خەڵكی ڕابگەیەنن: هەم بە زمانی وتار، هەم بە زمانی كردار، لە خۆتاندا جێ بەجێی بكەن.

## بڕگەی سێ یەم: سیفەتە بنەڕەتییەکانی فێرخوازان:

ئەوانەی کە دەیانەوێ زانست پەیدا بکەن، کۆمەڵێك سیفەتی بنەڕەتیی هەن، دەبێ لە خۆیانیاندا بێننە دی:

١) نیەت ساغ بوونەوە، ئەو فێرخوازە مەبەستی تەنیا پێ ڕەزامەندیی خوا بێ.

وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ تَعَلَّمَ عِلْماً مِمَّا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللَّهِ عزوجل لاَ يَتَعَلَّمُهُ إِلاَّ لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضاً مِنَ الدُّنْيَا، لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الجَنَّةِ يَوْمَ القِيَامَةِ}. [1]

واتە: هەرکەسێك زانیارییەك پەیدا بکا، لەو جۆرەی کە ڕەزامەندیی و ڕووی خوای زاڵی پایەداری پێ داوا دەکرێ، بەڵام ئەو تەنیا بۆ ئەوە فێری بێ، کە بەرژەوەندییەکی دنیایی پێ بێنێتەدی، بۆنی بەهەشت ناکا، لە ڕۆژی دواییدا.

٢) دەبێ داواکارانی زانست و فێرخوازان لە گرنگترەوە بۆ گرنگ بچن، وەك لە فەرموودەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا هاتوە، کە بە مەعازی فەرموو: {فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ عِبَادَةُ اللَّهِ} [2]، واتە: با یەکەم شت کە تۆ ئەوانەی بۆ بانگ دەکەی، بەندایەتیی کردنیان بێ بۆ خوا.

---

١ ) أخرجه أحمد: ٨٤٣٨، وأبو داود: ٣٦٦٤، وابن ماجه: ٢٥٢.

٢ ) أخرجه البخاري: ١٣٨٩، ومسلم: ١٣٢.

٣) دەبێ ئەو کەسە کار بە زانستەکەی خۆی بکا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴾الصف:٢، واتە: بۆچی شتێك دەڵێن کە کاری پێ ناکەن؟!

٤) پێویستە ڕێز لەو کەسە بگرێ، کە زانستەکەی لێ وەرگرتوە، وەك مووسا (علیه الصلاة والسلام)، بە بەندە صالحەکە، کە (خضر)ی پێ دەڵێن، پێی فەرموو: ﴿ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرًا ﴿٦٩﴾ ﴾ الكهف: ٦٩، واتە: ئەگەر خوا بیەوێ بە خۆڕاگر دەمبینی و، هیچ فەرمانێکی تۆ ناشکێنم.

## بڕگەی چوارەم: سیفە بنەڕەتییەکانی مامۆستایان.

مامۆستایان، ئەو کەسانەی کە خەڵك فێری زانست دەکەن، کۆمەڵێك ئەدەبو ڕەوشتی گرنگ هەن، پێویستە ڕەچاویان بکەن:

١) بەزەیی‌و سۆز بەرامبەر بە قوتابییان، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هاوەڵانی فەرمووە: {إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ مِثْلُ الْوَالِدِ لِوَلَدِهِ}. [1]

واتە: بێگومان من بۆ ئێوە وەك باب بۆ ڕۆڵەکەی وام.

ئنجا مامۆستاو زاناش لەگەڵ ئەو کەسەدا کە فێری دەکا، دەبێ بەو شێوەیە بێ بۆی.

٢) ڕوونکردنەوەو تێگەیاندن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ النحل: ٤٤.

واتە: تاکو ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە، بۆیان ڕوونبکەیەوە.

مامۆستاو زانا دەبێ بەچاکیی شتەکان بۆ خەڵك ڕوون بکاتەوەو، نوقتەیان بۆ بخاتە سەر پیت، نەك بە منجە منج، یان لەژێر لێوەوە، یان بە قۆرتو پێچ، بەڵکو ڕێك ئەوەی کە بە حەق‌و ڕاستی دەزانێ، بەڕوون و ڕاشکاویی بیڵێ.

---

١) أخرجه أبن ماجه: ٣١٣، وأبوداود: ٨، والنسائي: ٢٠١٣, وأحمد: ٧٣٦٨.

٣) پەروەردەكردنو پێگەیاندنیان، وەك خوا لە وەسفی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ﴿ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾الجمعة:٢، واتە: چاكیان دەكات و، پاكیان دەكات و، گەشەیان پێ دەدا.[١]

٤) بوونە سەرمەشقیان، مامۆستاو زانا، دەبێ سەرمەشقی قوتابیی‌و فێرخوازەكانی بێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١.

ئنجا لە ڕاستییدا قوتابییانو فێرخوازان، پێش ئەوەی گوێ لە قسە بگرن، تەماشای كردەوەو ڕەفتاری مامۆستایەكەیان دەكەن.

٥) پێویستە ئاستی قوتابییەكان بزانێ و، پێویستییان بزانێ و، بەپێی پێویستیی ئەوان، زانستیان فێر بكات، نەك بەپێی پێخۆشبوونی خۆی، وەك لەم دەقە هاتوە: {عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، أَنَّهَا قَالَتْ أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم أَنْ نُنَزِّلَ النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ}[٢]

واتە: دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمان دەكردین، كە خەڵك لە پێگەو شوێنی تایبەتیی خۆیاندا دابنێین.

واتە هەر كەسەو وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بكەین، كە ئەوەش (حكمة)ی پێ دەگوترێ.

١ ) المعجم الوسيط: ص٣٩٦، لفظ: زكى.

٢) أخرجه أبو داود: ٤٨٤٢، وذكره مسلم في مقدمة صحيحه.

## ئاڵقەی بیست و سێیەم :

# ڕەوشت و ئەدەبەکانی بواری کارو کاسبیی

بەڕێزان!

كارو كاسبیی كردن و، هەوڵدانی مرۆڤ بۆ پەیداكردنی بـژیو و، دابینكردنی پێداویستییەكانی خۆی و، ئەوانەی كە مەسرەفیان لەسەریەتی، یەكێكە لە ئەركە شەرعییەكان و، بەپێچەوانەوە: كەمتەرخەمیی كردن، لەوەدا كە مرۆڤ بژیو و پێداویستییەكانی خۆی بۆ خۆی دابین بكات، هەروەها ئەوانەی كە نەفەقەو خەرجییان لەسەری پێویستە، كەمتەرخەمیی كردن لەوەدا، گوناهێكی گەورەیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوْتُ} [1]، واتە: مرۆڤ ئەوەندە گوناهەی بەسە كەسێك زایە بكا، كە پێویستە بیژیەنیّو، پێویستە پێداویستییەكانی بۆ دابین بكات.

ئنجا ئێمە لەم ئاڵقەیەدا بە كورتییو پوختیی، باسی ئەو ئەدەبو ڕەوشتانە دەكەین، كە لە بواری كارو كاسبییو پەیداكردنی بژیودا، پێویستە ڕەچاو بكرێن، ئەویش لە چوار(٤) بڕگەدا:

---

١) أخرجه أحمد: ٦٤٩٥، وأبو داود: ١٦٩٢، والحاكم: ١٥١٥.

## بڕگەی یەکەم: گرنگیی و پێگەی کارو کاسبیی کردن لە ئیسلام دا:

سەرەتا با تەماشا بکەین، چۆن تەماشای کارو کاسبیی کراوە لە ئیسلامدا:

١) خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (هود)-٦١-دا، دەفەرمویٚ: ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾، واتە: خوا ئێوەی لە زەوی دا پێگەیاندوەو، ئاوەدانکردنەوەشی عایدی ئێوە کردوە.

واتە ئێمە لەسەرمان پێویست کراوە کە سەر زەوی ئاوەدان بکەینەوە، ئنجا ئایا سەر زەوی بەچی ئاوەدان دەکرێتەوە؟ بە تەئکید بەوە:

١-کە ژیانێکی تەندروستی تێدا بگوزەرێنین.

٢- هەروەها کە لە نازو نیعمەتەکانی خوا لەسەر زەوی بەهرەمەند بین.

٣- بەوە کە تێکدانو وێرانکاریی تێدا نەکەین.

٤- بەوە کە بیناسازیی تێدا بکەین و، باغو باغاتی تێدا بنیات بنێین و، جۆگەو باری تێدا هەڵبەستین و، ... تا کۆتایی.

٢) لە سوورەتی (الملك) -١٥-دا خوا دەفەرمویٚ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ﴾.

﴿ذَلُول﴾، بە وڵاخێك دەگوترێ، کە چەمووش نەبێ و، بە ئاسانیی پشت بخاتە ژێر بار، دەستەمۆ بێ و، لە مرۆڤ عاسێ نەبێ، خوا زەوی تەشبیه کردوە، بە وڵاغێکی دەستەمۆوە، وڵاغێك بە ئاسانیی بێتە ژێر بار.

دەفەرمویٚ: خوا زەوی بۆ ئێوە دەستەمۆ کردوە، ئنجا بە قەدپاڵەکانی دا بڕۆنو، لە بژیوی وی(خوا)ش بخۆن و، بۆ لای خواش دەگەڕێنەوەو، لەلای وی کۆدەکرێنەوە (لەقیامەتدا).

واتە: لەکاتێکدا کە لە دنیادا دەژین، دیداری خوای پەروەردگاریشتان لە یاد بێ، بزانن کە لێرە بەشێوەیەکی کاتیی دانراون، بۆ ئەوەی تێیدا تاقی بکرێنەوە، بەڵام مەنزڵگای کۆتایی، مەنزڵگای دوارۆژە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْآخِرَةَ لَهِيَ ٱلْحَيَوَانُ﴾ العنكبوت: ٦٤، واتە: ژیانی مەنزڵگای دوارۆژ، ژیانی ڕاستەقینەیە، ئەگەر بزانن.

٣) پێشتریش ئەو دوو ئایەتە موبارەکە (٩ و ١٠)ی سوورەتی (الجمعة)مان هێنان، لێرەش دووبارەیان دەکەینەوە، کە زۆر جێی سەرنجن لە بواری گرنگیی دانی ئیسلام بە کارو کاسبیی‌و پەیداکردنی بژیو:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝٩ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۝١٠﴾.

ڕاستە ماناکەیان ئاوایە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کات لە ڕۆژی جومعەدا، بۆ نوێژ بانگدرا، بەخێرایی بەرەو یادی خوا بچن‌و واز لە کڕین‌و فرۆشتن بێنن، ئەوە بۆ ئێوە چاکترە، ئەگەر بزانن. ئنجا هەر کات نوێژ تەواو بوو، بە زەویدا بڵاوبنەوەو، لە بەخششی خوا داوا بکەن و، زۆریش یادی خوا بکەن، بۆ ئەوەی سەرفراز بن.

واتە: لە گەرمەی کارو کاسبییدا خواتان لە یاد بێ، بۆ ئەوەی کە کارو کاسبییەکی سەڕاستتانە بکەن و، تەماع واتان لێ نەکا، قۆڵی خەڵك ببڕن، یاخود درۆ لە کارو کاسبیی دا بکەن و، غەش‌و خیانەت‌و ناپاکیی تێدا بکەن.

٤) هەر دەربارەی گرنگی کاسبیی و، پەیدا کردنی بژیو بەدەستی خۆ و، بە ڕەنجی شان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ، خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ دَاوُدَ كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ} (١).

واتە: هەرگیز هیچ کەس لە بەرهەمێکی باشتر لە بەری ڕەنجی خۆی، لە بەری دەستی خۆی نەخواردوە. {واتە: ئەگەر ئینسان بە کاسبییەك بژیو پەیدا بکاو، ژیانی بگوزەرێنێ، کە بە ئارەقی نێوچەوانی و، بە ڕەنجی شانی خۆی پەیدای دەکا، ئەوە باشترین بژیو و ڕزقە}، داوود پێغەمبەری خواش (صەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە بەرهەمی دەستی خۆی دەیخوارد.

لە سوورەتی (السبأ)دا خوا (سبحانه وتعالى) ئاماژە دەکا، هەروەها لە سوورەتی (الأنبياء)دا، کە داود (عليه السلام) زرێی دروست کردوون و ئاسنگەر بووە.

ئنجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك نموونە داود باس دەکا، کە داود پێغەمبەری خواش بووە، حوکمڕانیش بووە، بەڵام ئەوە وای لێ نەکردوە کە کارو کاسبیی نەکا، بەڵکو زرێی دروست کردوون و، پیشەی ئاسنگەریی هەبووە.

٥) لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ( طَلَبُ الْحَلَالِ جِهَادٌ، إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ العبد الْمُحْتَرِفَ)(٢) واتە: بەدوای بژیوی حەلاڵ دا گەڕان جیهادە، تێکۆشانە لە ڕێی خوادا و، خوا (سبحانه وتعالى) بەندەی خاوەن پیشەی خۆش دەوێت.

(مُحتَرِف) واتە: خاوەن (حرفة)، خاوەن پیشە، ئنجا ئاسنگەرە، بەرگ

---

١ ) أخرجه أحمد: ١٧٢٢٩، والبخاري: ١٩٦٦.

٢ ) أخرجه ابن أبي الدنيا في إصلاح المال: ١٩٣، وضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة (٣/٤٦٦).

دروویە، تەنەکەسازە، دووکاندارە، زێڕنگەرە، بازرگانە، جوتیارە، هەرچی هەیە، پیشەیەکی هەبێ، خوای بەخشەر خۆشیدەوێ، چونکە بەهۆی ئەو پیشەیەوە، هەم خزمەتی خەڵك دەکا، هەم بژیویێکی حەڵاڵ بۆخۆی و، ماڵو منداڵی دابین دەکا.

٦) هەر لەو بارەوە پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ، فَيَحْتَطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْتِيَ رَجُلًا يَسْأَلُهُ: أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ} (١).

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە گوریسەکەی هەڵگرێ و، بچێ لەسەر پشتی خۆی کۆڵەدار هەڵگرێ، بیهێنێ، بیفرۆشێ، لەوە بۆی باشترە، کە بچێ داوا لە پیاوێك بکا، ئنجا بیداتێ یان نەیداتێ.

٧) لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە، {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ «أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ أَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَسْأَلُهُ، فَقَالَ: أَمَا فِي بَيْتِكَ شَيْءٌ؟ قَالَ: بَلَى حِلْسٌ نَلْبَسُ بَعْضَهُ وَنَبْسُطُ بَعْضَهُ، وَقَعْبٌ نَشْرَبُ فِيهِ مِنَ الْمَاءِ. قَالَ: ائْتِنِي بِهِمَا؟ قَالَ: فَأَتَاهُ بِهِمَا.فَأَخَذَهُمَا رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدِهِ وَقَالَ: مَنْ يَشْتَرِي هَذَيْنِ؟ قَالَ رَجُلٌ: أَنَا آخُذُهُمَا بِدِرْهَمٍ. قَالَ: مَنْ يَزِيدُ عَلَى دِرْهَمٍ؟ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا قَالَ: رَجُلٌ أَنَا آخُذُهُمَا بِدِرْهَمَيْنِ. فَأَعْطَاهُمَا إِيَّاهُ وَأَخَذَ الدِّرْهَمَيْنِ وَأَعْطَاهُمَا الْأَنْصَارِيَّ. وَقَالَ: اشْتَرِ بِأَحَدِهِمَا طَعَامًا فَانْبِذْهُ إِلَى أَهْلِكَ وَاشْتَرِ بِالْآخَرِ قَدُومًا فَأْتِنِي بِهِ؟ فَأَتَاهُ بِهِ. فَشَدَّ فِيهِ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) عُودًا بِيَدِهِ ثُمَّ قَالَ لَهُ: اذْهَبْ فَاحْتَطِبْ وَبِعْ وَلَا أَرَيَنَّكَ خَمْسَةَ عَشَرَ

١) أخرجه أحمد: ١٤٢٩، والبخاري: ١٤٠٢، وابن ماجه: ١٨٣٦.

يَوْمًا. فَذَهَبَ الرَّجُلُ يَحْتَطِبُ وَيَبِيعُ، فَجَاءَ وَقَدْ أَصَابَ عَشْرَةَ دَرَاهِمَ فَاشْتَرَى بِبَعْضِهَا ثَوْبًا وَبِبَعْضِهَا طَعَامًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): هَذَا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تَجِيءَ الْمَسْأَلَةُ نُكْتَةً فِي وَجْهِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لَا تَصْلُحُ إِلَّا لِثَلَاثَةٍ: لِذِي فَقْرٍ مُدْقِعٍ، أَوْ لِذِي غُرْمٍ مُفْظِعٍ، أَوْ لِذِي دَمٍ مُوجِعٍ}.

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك گێڕاویەتەوە: كە پیاوێك لە پشتیوانەكان هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای (هاوكاریی) لێكرد، ئەویش فەرمووی: ئایا هیچ شتێك (ی زیاد) لە ماڵەكەتاندا نیە؟

گوتی: با بەڕەیەكمان هەیە هەندێكی بەخۆمان دادەدەین‌و هەندێكیشی ڕادەخەین، دەفرێك (ی گەورە)یش كە ئاوی تێدا دەخۆینەوە.

فەرمووی هەردووكیانم بۆ بێنە. گوتی: بۆی هێنان‌و پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) بە دەستیەوە گرتن‌و فەرمووی: كێ ئەم دووانە دەكڕێ؟

پیاوێك گوتی: من بە درەمێك دەیانبەم.

دووجاران یان سێیان فەرمووی: كێ لە درەمێك زیاتر دەدات؟

پیاوێك گوتی: من بە دوو درەم دەیانبەم، ئیدی پێیدان‌و، دوو درەمەكەی وەرگرتن‌و دانی بە پیاوە پشتیوانییەكەو پێی فەرموو: بە یەكیان خۆراك بكڕەو بۆ خێزانتی دابنێ‌و، بەوی دیكەشیان بیور (تەور) ێك بكڕەو بۆم بێنە.

ئەویش بۆی هێناو، پێغەمبەری خوا بە دەستی خۆی دارێكی تێبڕی (بۆی كردە كلك، دەستك) ئنجا پێی فەرموو: بڕۆ دار بكەو بیفرۆشەو، هەتا پازدە ڕۆژان نەتبینمەوە.

كابراش ڕۆیشت داری هێنان‌و فرۆشتنی، ئنجا هاتەوە دە(١٠) درەمی وەدەست هێنابوون، بە هەندێكیان پۆشاك‌و بە هەندێكیان خۆراكی كڕیبوو.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەمە چاکترە لەوە کە داواکـردن (سواڵکردن) لە ڕۆژی قیامەتدا خاڵێك (ی ڕەش) بێ لە دەم و چاوتدا.

سواڵکردن تەنیا بۆ سێ کەسان دەبێ:

خاوەن هەژارییەکی پەکخەر، یان خاوەن قەرزدارییەکی لە ڕاددە بـەدەر، یـان خاوەن خوێنێکی ئازاردەر.[١]

بەڵێ بەڕێزان!

ئیسلام زۆر هانی مسوڵمانانی داوە، کـە بەدەسـت و مسـتی خۆیـان خۆیـان بژیەنن و، بژیوی خۆیان دابین بکەن و، چاویان لە دەستی خەڵك نەبێ و، لـە زۆر فەرمایشتاندا هاتوە، کە سەرزەنشت و لۆمـەی ئـەو کەسـانە کـراوە کـە سـواڵ دەکەن و، داوا لە خەڵك دەکەن، یەکێ لە فەرمایشتەکان دەفـەرموێ: پیـاوی وا هەیە دێ لە ڕۆژی قیامەتدا، هیچ گۆشت(پێسـت)ی بـە دەم و چـاوەوە نـەماوە، یانی: ئاوی ڕووانی ڕۆیشـتوە، لـە ئـەنجامی ئـەوەدا کـە زۆر داوای لـە خـەڵك کردوە و، سواڵی کردوە.[٢]

٨) فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە، ئەم فەرمایشتەیە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ! وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَا عَمِلَ فِيهِ! وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أَبْلاهُ! }[٣].

واتـە: لـە ڕۆژی قیامەتـدا، لـە ڕۆژی هەڵسـانەوە و زیندووبوونـەوەدا، هـیچ

١) رواه النسائي في سننه الصغرى: ٤٤٧٧، وابن ماجة في سننه: ٢٢٠٧.

٢) (ما يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ النَّاسَ، حتَّى يَأْتِيَ يَومَ القِيَامَةِ ليسَ في وجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ) رواه الترمذي:٢٤٤٠ وقال حديث حسن صحيح، وصححه الألباني: ٧٩٥٧ في صحيح الجامع، والبخاري:١٣٧٧، ومسلم:١٧٢٧.

٣) أخرجه الترمذي: ٢٤١٧، وقال: حسن صحيح، والدارمي: ٥٤٣، وأبو يعلى: ٧٤٣٤، وصححه الألباني.

بەندەیەك دوو پێی بەولاو بەولادا ناڕۆن، {ڕادەگیرێ بۆ دادگایی}، تاکو لەچوار شتان پرسیاری لێ نەکرێ:

١) لە تەمەنەکەی، لە چییدا تەمەنی بەڕێ کردوە؟

٢) لە زانیارییەکەی، لێی دەپرسرێ چەندەی کار پێ کردوە، بەوەی کە زانیویەتی؟

٣) ماڵو سامانەکەی، چۆنی پەیداکردوەو چۆنیشی خەرجکردوە؟

٤) جەستەی، {ئەندامەکانی جەستەی} لە چییدا فەوتاندوون، لەچییدا پیریی کردوون؟

واتە مرۆڤ لێی دەپرسرێتەوە لەسەر ئەو نیعمەتانەی کە خوا پێی داون، یەکێك لەوانە: تەمەنی، ئنجا جەستەی، هەروەها عەقڵو هۆشی و زانیاریی، ئنجا ئەو ماڵو سامانەی کە پەیدا دەکا، چۆنی پەیدا دەکات و، چۆنی خەرج دەکا؟ هەمووی لێپرسینەوەی لەسەرە.

## بڕگەی دووەم: کارکردن بە وردەکاریی و کارامەیی و لێزانیی:

١) ئەمەش فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە: {يُحِبُّ اللهُ العامل إِذَا عَمِلَ أن يُحْسن} [1].

واتە: خوا حەز دەکا کەسێك کە کارێك دەکا، بەچاکیی ڕێك و پێکیی و وردەکاریی بیکات.

٢) لە فەرمایشتی دیکەدا هاتوە: {إِنّ اللَّهَ يُحِبّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً

---

١) أخرجه الطبراني: ٤٤٨، وحسَّنهُ الألباني في صحيح الجامع: ١٨٩١.

أَنْ يُتْقِنَهُ} (١) واتە: خوا حەز دەکات ئەگەر یەکێك لـەئێوە کـارێکی کـرد، بـە کارامەیی‌و لێزانیی‌و وردەکاریی ئەنجامی بدات.

٣) هـــەروەها پێغەمبـــەر (صـــلى اللـــه عليـــه وســـلم) دەفـــەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ} (٢).

واتە: بێگومان خوا چاکئەنجامدانی لەسەر هەموو شتێك نووسیوە.

واتە خوا بڕیاری داوە، نووسیویەتی، داوای کردوە هەموو شتێك بـە چـاکیی ئەنجام بدرێت.

## بڕگەی سێیەم: قەناعەتکردن بە کەمێکی حەڵاڵ و چاو نەبڕینە حەڕامی زۆر و بۆر:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە، کە ئینسان بژیوی خۆی بۆخۆی دابـین بکات و، بە کەمێکی حەڵاڵ قەناعەت بکات و، چاوی لە حەڕامێکی زۆر نەبێ، دەفەرموێ: {قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ، وَرُزِقَ كَفَافًا، وَقَنَّعَهُ اللَّهُ بِمَا آتَاهُ} (٣).

واتە: بەڕاستیی سەرفرازو، بەختەوەرو، بەمراد گەیشتوویە، ئەو کەسـەی کـە مسوڵمان بووەو، بژیوێکی پڕ بەپێستی هەیە، {واتە: بـژیوێك کـە نـە لەبـەری بڕاوەو، نە لەسەری ڕژاوە} و، خواش قەناعەتی پێهێناوە، بەوەی کە پێی داوە.

---

١) أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٥٣١٢، وأبو يعلى: ٤٣٨٦، والطبراني في الأوسط: ٨٩٧، وحسَّنهُ الألباني في (الصحيحة): ١١١٣.

٢) أخرجه مسلم: ١٩٥٥.

٣) رواه مسلم: ١٠٥٤.

لەڕاستییدا ئەسڵ ئەوەیە: قەناعەتت هەبێ بەوەی كە هەتە، ئەگەرنا ئینسان زۆریشی هەبێ، كە قەناعەتی نەبوو، هەر خۆی بە هەژار دەزانێ و، بە پێچەوانەوە: كەمیشی هەبێ، كە قەناعەتی پێی هەبوو، هەر خۆی بە دەوڵەمەند دەزانێ، بۆیە گوتراوە: "الغِنى غِنى القلب وليس الغنى عن كثرة العَرَض " دەوڵەمەندیی، دەوڵەمەندیی دڵە، نەك دەوڵەمەندیی بەهۆی سەروەت‌و سامانی زۆرەوە بێ، هەیە زۆریشی هەیە، بەڵام هەر چاوی لە دەستی خەڵكەو، هەر تەماعی هەیەو، هەر خۆی پێ نەدارە، چونكە خۆی لەگەڵ كەسانێك بەراورد دەكات، كە زۆر لەویان زیاتر هەیە! مانای وایە: خۆی هەر لە حاڵەتی هەژاریی‌و نەداریی‌و ئاتاجیی دا دەبینێ.

## بڕگەی چوارەم: هەوڵدانی مرۆڤ بۆ ئەوە كە دەستی بەخشەر بێ نەك وەرگر و، هاوكارییكار بێ نەك هاوكارییكراو:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفُّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ} [١].

واتە: دەستی بەرز لە دەستی نزم چاكترە، {دەستی بەرز: واتە دەستی بەخشەر، عادەت وایە ئەوەی كە دەبەخشێ دەستی لەسەرەوەیە، دەستی نزم: واتە دەستی وەرگر، عادەت وایە ئەوەی كە وەردەگرێ دەستی لە بنەوە دەبێ}. دەستی بەخشەر لە دەستی وەرگر باشترەو، {ئەگەر شتێكت هەبوو لە

١) أخرجه البخاري: ١٤٢٧، ومسلم: ١٠٣٤.

خەرجكردنی ماڵو سامانەكەت}، لەوانەوە دەست پێ بكە، كە بـژێویان لەسـەر تۆیەو، تۆ مشووریان دەخۆی، {واتە: لە ماڵو منداڵی خۆتەوە دەست پێ بكـە، دوایی لە خزمی هەژارو نەدارت، لەو كەسانەی كە چاویان لەدەستی تۆیەو، بژێو دابینكردنیان لەسەر تۆیە، كوردەواریی خۆشمان گوتوویانە: "خێر بەخوێش نـەك بە دەروێش"، یان دەڵێن: "تاكو ماڵ پێویسـتیی پـێ بـێ، بـە مزگـەوتێ خێـر نیە"}.

(وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ عَـنْ ظَهْـرِ غِنًـى)، باشـترین خێـر كـردن، ئەوەیـە كـە بـە دەوڵەمەندیی بێ.

یانی: تۆ بۆخۆت هەژارو نـەدار بـی و، خێـرێش بكـەی، ئـەوە شـتێكی نـا مەنتیقییە، دەبێ لەخۆت زیاد ببەخشی.

(وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّـهُ اللَّهُ)، هەروەها هەركەسێك چاوی لە خۆپاكڕاگرتن بێ، خوا پاكی دەكا.

(وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِـهِ اللَّهُ)، هـەروەها هەركەسـێك چـاوی لـە بـێ نیـازیی و دەوڵەمەندیی بێ، خوا بێ نیازو دەوڵەمەندی دەكا.

وەك گوتمان: دەوڵەمەندیی دەوڵەمەندیی دڵو دەروونـەو، قەناعـەت هەبوونـە بەوەی كە هەتـە، بۆیـە گـوتراوە: "القناعـة كنـز لا يفنـى". واتـە: قەناعـەت خەزنەیەكە هەرگیز تەواو نابێ و نابڕێ.

## ئالقەی بیست و چوارەم :

# ڕەوشت و ئەدەبەکانی سەفەر

بەڕێزان!

سەفەرو سەردانو هاتوچۆش کۆمەڵێك ڕەوشتو ئەدەبی تێدا داندراون، شەریعەت لەسەر مسولْمانانی پێویست کردوون، کۆمەڵێك ڕەوشتو ئەدەبو ئاکاری جوان، دەبێ لە خۆیاندا بیانپشکوێننەوە،[1] لەکاتێکدا کە دەبنە ڕێبوارو، بە سەفەر دەچن و، سەردان دەکەن.

ئنجا ئێمە لە دە (١٠) بڕگەدا باسی بابەتی (ڕەوشت و ئەدەبەکانی سەفەر) دەکەین:

١) لە خۆیدا بیانپشکوێنێ: بەرجەستەیان بکات و دەریان بخات.

## بڕگەی یەکەم/ حوکمی سەفەر:

سەردانو سەفەر، لە ئەسڵدا شتێکی ڕەوایە، بەڵام دوایی لە وردەکارییەکانیدا پێنج حوکمەکانی بەسەردا دەچەسپن: فەرز، پەسند، ڕەوا، قەدەغە، ناپەسند.

١) سەفەرکردن بۆ ئەنجامدانی واجبێکی شەرعیی، واجبە، بۆ وێنە: سەفەری حەج، یاخود سەفەرێك بۆ جێ بەجێ کردنی پەیوەندیی خزمایەتیی(صلة الرحم)، هەروەها هەر سەفەرێك بۆ ئەنجامدانی واجبێکی شەرعیی، بۆ وێنە: پەیداکردنی بژیو، کە بەبێ سەفەرکردن ئەو بژیوە پەیدا نەبێ، ئەو کاتە ئەو سەفەرە واجب دەبێ، زانایان وەك بنچینەیەکی شەرعیی گوتوویانە: (ما لا یتم الواجب إلاّ به فهو واجب)، هەر شتێك، فەرزێك بەبێ وی جێ بەجێ نەکرێ، ئەو شتەش فەرز دەبێ.

٢) جاری واش هەیە سەفەرەکە بۆ مەبەستێکە، بۆ ئامانجێکە، کە ئامانجەکە بۆخۆی پەسندە، ئەو کاتە سەفەرەکەش پەسند(مندوب) دەبێ.

٣) جاری واش هەیە سەفەرەکە شتێکی ڕەوایەو، ئامانجەکەش کە بۆی دەچێتە ئەو سەفەرە ڕەوایە، وەك: گەشتو گەڕانو سیاحەتو شوێن بینین، ئەو کاتە سەفەرەکەش لە بازنەی ڕەوا(مُباح)دا دەمێنێتەوە.

٤) جاری واش هەیە، سەفەرەکە ئامانجێکی حەڕامو قەدەغەی لە پشتەوەیە، ئەو کاتە دیارە بەهۆی ئەوەوە کە ئامانجێکی حەڕامی لە پشتەوەیە، سەفەرەکەش هەرچەندە لە خودی خۆیدا ڕەوایە، بەڵام مادام کراوەتە ئامراز بۆ هێنانەدی ئامانجێکی حەڕام، سەفەرەکەش حەڕام دەبێ.

٥) جاری واش هەیە ئامانجەکە شتێکی ناپەسندە، ئەو کاتە بە تەئکید ئەو سەفەرەش کە دەکرێتە ئامرازو هۆکار، بۆ وەدەستهێنانی ئەو ئامانجە ناپەسند(مکروە)ە، ئەویش ناپەسند دەبێ.

ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، خوای بەرزی مەزن لە چەند شوێنێکدا فەرمانمان پێ دەکا کە سەفەر بکەین، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (العنکبوت)-٢٠-دا ، خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنْشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ ﴾، خوا بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: بڵێ: بە زەویدا بڕۆن‌و سەرنج بدەن، خوا چۆن دروستکراوەکانی هێناوەنە دی.

ئەمە گەشتێکی سروشتییە، گەشتێکە بۆ دۆزینەوەی یاسا گەردوونییەکانی خوا، بۆ تەماشاکردنی دروستکراوەکانی خوا، ﴿ثُمَّ اللَّهُ يُنْشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ﴾، دوایی خوا پێگەیاندنەوەی دواییش دروست دەکاتەوە، {واتە: ڕۆژی دوایی} . ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، بەدڵنیایی خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

٢- لە سوورەتی (الأنعام)-١١-دا، دەفەرموێ:﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ ثُمَّ انْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ﴾.

واتە: بڵێ بە زەوی دا بڕۆنو سەرنج بدەن! سەرەنجامی بەدرۆدانەران {ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا} چۆن بوو؟ بێگومان سەرئەنجامێکی شوومیان هەبوو، واتە ئێوەش پەندو دەرسیان لێ وەربگرن.

ئەمەش گەڕانێکە بە مێژوو دا، تاکو شوێنەوارەکان ببینن، ئەوی پێشێ گەڕان بوو بە سروشت دا، تاکو دیاردە سروشتییەکان ببین.

ئنجا گەڕان بە مێژوودا، دەگونجێ گەڕانێکی جەستەیی بێ، بچی شوێنەوارەکان ببینی، بۆ وێنە: هەڕەمەکانی میسر، شوێنەواری عادو ثەموودو، شوێنەواری گەلی (لوط): دەریاچەی مردوو، هەروەها شوێنەکانی دیکە، دەشگونجێ گەڕانێکی فیکریی بێ، واتە کتێبەکانی مێژوو بخوێننەوەو، سەرنج بدەن بە عەقڵو هۆش و لە وەزعەکە ڕابمێنن.

## بڕگەی دووەم/ کاتی سەفەر:

١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە پەسندی داناوە کە ئینسان ئەگەر سەفەرێکی بوو، بەیانیان زوو سەفەر بکات، فەرموویەتی: {اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا} [1]، واتە: ئەی خوایە! پیت و پیز بخە بەیانیانی ئۆممەتەکەمەوە.

٢) لە فەرمایشتی دیکەدا هاتوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆرجاران پێنجشەممان سەفەری دەکرد: {...وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يَخْرُجَ يَوْمَ الخَمِيسِ} [2]

بەڵام من پێم وایە: ئەگەر ئینسان بۆی بگونجێ بەیانیان زوو سەفەر بکا، بە تەئکید ئەوە باشترە، ئەو کاتە تۆ بەڕۆژی ڕوون سەفەرەکەت دەکەی، هەروەها ئەگەر بۆت بگونجێ پێنجشەممان سەفەر بکەی، ئەوە پێغەمبەر وای بەباش زانیوە، بەڵام ئەوەش دەکەوێتە سەر حاڵەت و بۆگونجان، جاری وایە تۆ پێنجشەممە بۆت ناگونجێ و شەممە سەفەر دەکەی، یاخود بەیانیان بۆت ناگونجێ و ئێوارە سەفەر دەکەی، یاخود دوای نیوەڕۆ سەفەر دەکەی، بێگومان ئەوە هەمووی هەر ڕەوایە، چونکە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە هەموو ئەو کات و حاڵەتانەدا سەفەری کردوە.

---

١) أخرجه أبو داود: ٢٦٠٦، والترمذي: ١٢١٢ وقال حسن.

٢) أخرجه البخاري: ٢٩٥٠.

## بڕگەی سێیەم/ سەفەرکردن لەگەڵ هاوەڵدا:

وا باشە مرۆڤ بە تەنێ سەفەر نەکا، لەگەڵ هاوەڵان سەفەر بکا، یەك بێ، دوو بن، سێ بن، زیاتر بن.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە دەفەرموێ: {لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي الوَحْدَةِ مَا أَعْلَمُ، مَا سَارَ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ}[١].

واتە: ئەگەر خەڵك ئەوەی من دەیزانم، ئەوان زانیبایان، کە بەتەنیایی ڕۆیشتن، {چەند زیانی تێدایە}، هیچ سوارێك بە شەوێ بەتەنێ نەدەڕۆیشت {بەتەنێ بەتایبەت بە شەو}.

واباشە مرۆڤ ڕەفیقو هاوەڵی هەبێ بۆ سەفەر، شتێکی لێ دەقەومێ، گرفتێکی دێتە ڕێ، ئەگەر بەتەنیا بێ، کەس پێی نازانێ، زۆر کەس وا هەبووە، بە تەنێ ڕۆیشتوە، دوایی مردوە، ئنجا بۆخۆی نەخۆش بووە، دڵی وەستاوە، بەجۆرێك کوژراوە، گرنگ ئەوەیە: سەری بەفەتارەت چووەو، کەس نەیزانیوە.



١) أخرجه البخاري: ٢٩٩٨.

## بڕگەی چوارەم/ دیارییکردنی بەرپرس:

ئەگەر ڕێبوارەکان کۆمەڵێك بوون، واباشە بەرپرسێك بۆخۆیان دابنێن، مشوورخۆرو بڕیاربەدەستێك دابنێن، وەك لەم فەرمایشتەدا هاتوە: {إِذَا خَرَجَ ثَلاثَةٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ} [1] واتە: ئەگەر سێ کەس بەسەفەر چوون با یەکێکیان بکەنە فەرماندەیان، یەکێکیان بکەنە بەرپرس‌و مشوورخۆریان.

## بڕگەی پێنجەم/ هاوکاریی یەکدی کردن:

ئەدەب‌و ڕەوشتێکی دیکەی بەرز لە سەفەردا، ئەوەیە، کە ئەوانەی سەفەردەکەن، ڕێبواران پێکەوە هاوکار بن و ئاگایان لە یەکدی بێ، پێداویستییەکانی یەکدی جێ بەجێ بکەن.

بە تەماشا ئەم دەقە بکەین: {عَنْ أَبي سعيد الخُدريِّ رضي الله عنه قَالَ: بينَما نَحْنُ في سَفَرٍ إذ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى رَاحِلَةٍ لَهُ، فَجَعَلَ يَصْرِفُ بَصَرَهُ يمينًا وَشِمَالاً، فَقَالَ رسولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهرٍ فَلْيَعُدْ به عَلى مَنْ لا ظَهْرَ لَهُ، وَمَن كانَ لَهُ فَضْلٌ مِن زَادٍ، فَلْيَعُدْ به عَلَى مَنْ لا زَادَ لَهُ، فَذَكَرَ مِن أَصْنَافِ المَالِ مَا ذَكَرَ، حَتَّى رَأَيْنَا أَنَّهُ لا حَقَّ لأحدٍ مِنَّا في فَضْلٍ} [2].

ئەبو سەعیدی خودریی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەکاتێکدا ئێمە لە سەفەرێك بووین، پیاوێك هات، سواری حوشترێك بوو، هەر تەماشای لای ڕاست‌و لای

---

١) أخرجه أبو داود: ٢٦٠٨ بإسنادٍ حسن.

٢) أخرجه مسلم: ١٧٢٨.

چەپی دەکرد. {وا پێ دەچێ: موحتاج بووبێ، برسیی بووبێ، یان پێویستیی بە هاوکاریی بووبێ}. پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: هەرکەسێك پشتی زیادی پێیە، بابیدات بە کەسێك کە پشتی نیە. {پشت: واتە ولاغ، ئامرازی سواریی} و، هەرکەسێك توێشوو و خۆراکی زیادی پێیە، با بیدات بە کەسێك، کە توێشووی پێ نیە، بەم شێوەیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە جۆرەکانی ماڵو سامانی باس کرد، {یانی: باسی بەرگو پۆشاکی کرد، باسی کەلو پەلی دیکەی کرد}, هەتا ئێمە یەقینمان پەیدا بوو، دڵنیابووین: کە هیچ کام لە ئێمە بۆی نیە شتێکی زیادی لەلابێو خەڵکی دیکەش پێویستیی پێ بێ.

ئەو یەکسانییە ڕاستەقینەیە، ئیسلام بە کردەوە بەرجەستەی کردوە، لە دنیای واقیع دا، نەك بە خەونو خەیاڵ، وەك لە یوتوبیای فیکری کۆمۆنیزمو سۆسیالیزم دا هەیە.

بەڵام نەك بە ئیجبارکردن، بەڵکو بە پەروەردەکردنی خەڵكو تێگەیاندنیانو قەناعەت پێهێنانیان، کە بۆت نیە شتی زیاد لەلای تۆ هەبێو، خەڵکی دیکەش پێویستی پێی هەبێ.

**برگەی شەشەم/ زیکری سواربوونی ئامڕازی سەفەر:**

کاتێك کە مرۆڤ سواری ئەو ئامڕازە دەبێت، کە سەفەری پێ دەکا، کە کاتی خۆی: حوشتر بووە، هێستر بووە، ئەسپ بووە، کەر بووە، هەرچی بووە، ئێستا ئەوانەش هەر هەن لە لادێو شوێنە دوورەدەستەکان، بەڵام ئامڕازی دیکەش پەیدا بوون، کە: سەیارەیە، کەشتییە، فڕۆکەیە، شەمەندەفەرە، ...هتد.

خوای باڵادەست لە سوورەتی (الزخرف) -١٢و١٣و١٤-دا، دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا۟ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا۟ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾.

خوا (سبحانه وتعالى) لە سیاقی باسی چاکەو نیعمەتەکانی خۆیدا، دەفەرموێ: خوا (سبحانه وتعالى) لە کەشتیو لە ئاژەڵان هۆکاری بۆ ڕەخساندوون، کە سواری بن، بۆ سەفەرو بارو سوارو هاتوچۆ، تاکو کە چوونە سەر پشتی، چاکەی پەروەردگارتان بێتەوە بیر و، بڵێن: پاکیی بۆ ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆ دەستەمۆو ملکەچ کردووین و، ئێمە توانامان بەسەردا نەبووەو، دوایش تەنیا بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە.

واتە: بەم سەفەرە، سەفەری ژیانی خۆت بێتەوە بیر.

٢) هەروەها لە سـووڕەتی (هـود)-٤١-دا، نـووح (علیـه الصـلاة والسـلام)، بـەو خەڵكەی كە بڕوایـان پـێ هێنـاوە، كاتێـك تۆفـان دێ، پێیـان دەڵـێ: ﴿وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡر۪ىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ٤١﴾.

واتە: (نووح) فەرمووی: سواری بن، بچـنەتێی، بـەناوی خوایـە، ڕۆیشـتنیو لەنگەرگرتنی، بەدڵنیایی پەروەردگارم لێبوردەی میهرەبانە.

كەواتە: سوننەتە كە سواری كەشتیی دەبی ئاوا بڵێی، من پێم وایە بە قیـاس لەسەر كەشتیی، بۆ سواربوونی فڕۆكەش بەهـەمان شـێوە، بـەڵام ئەگـەر ئـەوی دیكـەش بگـوترێ، ئـەو زیكـرەی دیكـە: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ١٤﴾ الزخرف، ئـەویش بەهـەمان شێوە، هەر پڕ بەپێستەو جێی خۆی دەگرێ.

## بڕگەی حەوتەم/ زیکری سەفەرکردن:

کاتێك کە ئینسان سەفەر دەکات، واباشە بڵێ چیی؟

{عن ٱبن عمر (رضي الله عنها)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجًا إِلَى سَفَرٍ كَبَّرَ ثلاثا ثم قال: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾﴾، ثم يقول: (أَللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ في سَفَرِنَا هذا البرَّ والتَّقوى، ومِنَ العَمَلِ ما تَرْضى، أَللَّهُمَّ هَوِّنْ علَيْنا سفرَنَا هذا وَٱطْوِ عنَّا بُعْدَهُ، اللَّهُمَّ أَنتَ الصَّاحِبُ في السَّفَرِ، وَالخَلِيفَةُ في الأَهْلِ، اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ وعْثَاءِ السَّفَرِ، وكآبةِ المنظَرِ، وَسُوءِ المُنْقَلَبِ في الأهلِ والمالِ وَالوَلدِ»، وإِذا رجَعَ قَالَهُنَّ وزاد فيهِنَّ: «آيبونَ تائبونَ عَابِدُون لِرَبِّنَا حَامِدُونَ»} [1].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کاتێك کە بە سەفەر دەچوو، دەچووە سەر پشتی حوشترەکەی: سێ جاران (ألله أكبر)ی دەکرد: (ألله أكبر، ألله أكبر، ألله أكبر)، دوایی دەیفەرموو: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾﴾الزخرف، پاکیی بۆ ئەو زاتەی کە ئەمەی بۆ دەستەمۆکردینو، ئێمە توانامان بەسەری دا نەدەشکاو، ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە.

---

١) أخرجه مسلم: ١٣٤٢.

دوایـــی دەیفـــەرموو: ئـــەی خوایـــە! ئێمـــە لـــەم ســـەفەرەماندا چـــاكەكارییو پارێزكارییت لێ داوا دەكەین و، كردەوەیەك كە تۆ لێی ڕازی بی، ئـەی خوایـە! ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بكە، دوورییەكەیمان بـۆ بپێچـەوە، ئـەی خوایـە! تـۆ هاوەڵمانی لەسەفەرداو، جێنشینمانی لـە مـاڵو خێزانمانـدا، ئـەی خوایـە! مـن پەنات پێ دەبەم لە چلكنییو قرژنیی سـەفەر و، لـە دیمـەن تێكچـوون بـەهۆی ماندووبوونو نارەحەتیی سەفەرەوەو، لە خراپ {گەڕانەوە لە سەفەر} بۆ لـەنێو ماڵو سامانو خزمو كەسو منداڵ.

هەروەها كاتێـك كـە دەگەڕایـەوە، ئـەم دووعایانـەی دووبـارە دەكـردەوەو، ئەوەشی لێ زیاد دەكردو دەیفەرموو: (آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ)، گەڕاینەوە، پەشێمانین، پەرستارین بۆخواو، ستایشكارین بۆ پەروەردگارمان.

## بڕگەی هەشتەم/ زیکری بەرزیی‌و نزمیی ڕێگا:

ئەدەبێكی دیكەی سەفەر ئەوەیە كە لەكاتی بەرزبوونەواندا لە ڕێگاو، سەركەوتن بۆ شوێنێكی بڵند (ألله أكبر) بكرێ و، لە كاتی نزم بوونەوەو شۆڕبوونەواندا (سبحان الله) بكرێ، وەك لەم دەقەدا هاتوە:

{عن ابن عمر (رضي الله عنهما) قال كان النبيُّ (صلى الله عليه وسلم) وجيُوشُهُ إذا علَوُا الثَّنَايَا، كَبَّرُوا، وَإذا هَبَطُوا، سَبَّحوا} [١] .

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خوا لەخۆی و باوكی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و سوپایەكەی كاتێك كە سەردەكەوتن بۆ بەرزاییان (ألله أكبر)یان دەكردو، كاتێك كە شۆڕ دەبوونەوە بۆ لێژاییی‌و نزماییان (سبحان الله)یان دەكرد.

## بڕگەی نۆیەم/ بەڕێكردن و خواحافیزیی

كاتێك ئینسان، كەسێك بەڕێ دەكا بەرەو سەفەر، یان كاتێك خەڵكێك بەڕێ دەكات، واباشە بڵێ: {أَسْتَودِعُ اللهَ دِينَكَ، وَأَمَانَتَكَ، وَخَوَاتِيم عملك} [٢] .

واتە: ئایینەكەت‌و سپاردەكانت‌و، سەرئەنجامی كردەوەكانت بەخوا دەسپێرم.

بەڵام كاتێك كە مرۆڤ بەسەفەر دەچێ‌و خەڵك بەجێ دێڵێ، سوننەتە بڵێ: {أَسْتَوْدِعُكَ اللَّهَ الَّذِي لا تَضِيعُ وَدَائِعُهُ}، واتە: بەو خوایەتان دەسپێرم، كە سپاردەكانی زایە ناكات.[٣]

---

١) أخرجه أبو داود: ٢٥٩٩ بإسناد صحيح.

٢ ) أخرجه أبو داود: ٢٦٠٠، والترمذي: ٣٤٤٣، وقال: حسن صحيح غريب، وصححه الألباني.

٣ ) أخرجه أحمد: ٩٢١٩، وابن ماجه: ٢٨٢٥، وابن السني: ٥٠٦، والنسائي في الكبرى: ١٠٣٤٢.

## بڕگەی دەیەم/ گەڕانەوە:

لەکاتی گەڕانەوە لەسەفەردا، وا باشە مرۆڤ یەکسەر بچێتە مزگەوت و دوو ڕکات نوێژ بکا، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە:

{عن كعب بن مالك رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم كَانَ إِذَا قَدِمَ مِن سَفَرٍ، بَدَأَ بالمَسْجِدِ فَرَكَعَ فِيه رَكْعَتَيْنِ}.[١]

کەعبی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە لە سەفەرێك دەگەڕایەوە، سەرەتا دەچووە مزگەوت، دوو ڕکات نوێژی تێدا دەکرد، (ئنجا دوایی دەچووەوە ماڵ، یان دەچووە لای هاوەڵانی).

٢) هەروەها وا باشە کە ئینسان زۆری پێ چوو لە سەفەر، بە شەو و بەبێ ئاگایی بەسەر ماڵو منداڵدا نەدا، وەك لەم فەرمایشتەدا هاتوە: {إِذَا أَطَالَ أَحَدُكُمُ الغَيْبَةَ فَلاَ يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلً}[٢]

واتە: یەکێکتان کە زۆری پێ چوو لە سەفەرێ، با لە نەغافڵ بەشەوێ بەسەر ماڵو منداڵیدا نەدات، بەڵکو ئاگاداریان بکاتەوە، یاخود لە نیوە شەودا با نەچێتەوە کە بترسێن، بەڵکو با لێیان گەڕێ، بۆخۆی لە شوێنێك ئیسراحەت بکات تاکو بەیانی.

١) أخرجه البخاري: ٣٠٨٨، ومسلم: ٢٧٦٨.
٢) البخاري: ٥٢٤٤، ومسلم: ١٩٢٨.

بەڕێزان!

مرۆڤ وەك چۆن لەکاتێکدا کە بێدارە، کۆمەڵێك ئەدەبو ڕەوشت هەن، لەسەری پێویستە ڕەچاویان بکا، لە هەڵسوکەوتی دا، بۆ وێنە: لەکاتی خواردنو خواردنەوەدا، لەکاتی بەرگو پۆشاك پۆشین دا، لە بەرو مەجلیس دا، لە بەڕێگادا ڕۆیشتن دا، لە چاكو چۆنیی دا، بەهەمان شێوەش بۆ کاتی خەوتنو، چۆنیەتی خەوتن و، دوایی لە کاتی لەخەو هەڵسان و، بێداربوونەوەشدا، دیسان هەندێك ڕەوشتو ئەدەب هەن، پێویستە ڕەچاویان بکا.

خوا پشتیوان بێ لە شەش (٦) بڕگەدا باسی چۆنیەتی خەوتن و زیکرەکانی کاتی خەوتن و کاتی بێداربوونەوەو، خەون دیتن -خەونی باش یان خراپ- دەکەین:

## بڕگەی یەكەم: خەوتن (نوم) نیعمەتێكی گەورەی خوایە:

خەوتن نیعمەتێكی زۆر گەورەی خوای پەروەردگارە لە ژیانی بەشەردا، لە چەند شوێنێك دا خوای بەخشەر و كارزان لە قورئاندا ئاماژەی پێداوە، بۆ وێنە:

لە سوورەتی (النبأ) -٩-دا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾﴾، واتە: خەوتنی ئێوەمان گێڕاوە بە مایەی پشوودان.

(سبت) بە مانای (قطع) دێ، (سُبات) واتە: سرەوتن و پشوودان، ئیسڕاحەتكردن و حەسانەوە،[1] لە حاڵەتی خەوتن دا جەستە زۆر ئیسڕاحەت دەكا، خانەكان تازە دەبنەوە، هەروەها ڕووح ئیسڕاحەت دەكا، دیسان ڕووح دەرفەتێكی باشی بۆ دەڕەخسێ، كە بەشێوەیەك لە شێوەكان لە جەستە دووربكەوێتەوە، نەك لێی بچڕێ، هەر بۆیە لە كاتی خەوتن دا، مرۆڤ خەون دەبینێ و، دەگونجێ كۆمەڵێك ڕاستی بۆ دەربكەون كە لە حاڵەتی بێداریی دا نایانزانێ.



---

[1] ) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٣٩٣.

## بڕگەی دووەم: چۆنیەتی خەوتن و زیکرەکانی:

با تەماشای چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەین، بزانین چۆن بۆمان باسی چۆنیەتی خەوتن‌و زیکرەکانی دەکات:

١) (عنِ البراءِ بنِ عازب ﷺ قَالَ: كانَ رَسولُ اللَّه صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ إذا أوَى إلَى فِراشِه نامَ علَى شقِّه الأيْمَن، ثُمَّ قالَ: أللَّهُمَّ أسْلَمْتُ نَفسي إلَيْكَ، ووَجَّهْتُ وجْهي إلَيْكَ، وفَوَّضْتُ أمْري إلَيْكَ، وألْجأْتُ ظَهْري إلَيْكَ، رَغْبَةً ورَهْبَةً إلَيْكَ، لا مَلْجأَ ولا مَنْجا مِنْكَ إلَّا إلَيْكَ، آمَنْتُ بكِتابِكَ الذي أنْزَلْتَ، وبنَبيِّكَ الذي أرْسَلْتَ).[1]

واتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە دەچووە سەر جێگاکەی، لەسەر لای ڕاستی دەخەوت، ئنجا دەیفەرموو: ئەی خوایە! خۆم بەتۆ سپارد، ڕووی خۆم لە تۆ کرد، کاری خۆم عایدی تۆ کرد، پشتی خۆم بەتۆ بەست، بە ئارەزوومەندانەو بە سام‌و هەیبەت لێ کردنتەوە، هیچ پەنا نیەو، هیچ شوێنی دەربازبوون نیە لەتۆ، مەگەر بۆ لای تۆ، بڕوام بەو کتێبەت هێناوە کە داتبەزاندوەو، بەو پێغەمبەرەت کە ڕەوانەت کردوە.

٢) فەرموودەیەکی دیکە لەو بارەوە:

{وَعن البراءِ بن عازب، رَضيَ اللَّهُ عنْهما، قَالَ: قَالَ لي رسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) : إذَا أتَيتَ مَضْجَعَكَ فَتَوضَّأْ وضُوءَكَ للصَّلاة، ثُمَّ اضْطَجِعْ علَى شِقِّكَ الأيمَنِ، فقُل: وذكر نحوه وفيه: واجْعَلهُنَّ آخرَ مَا تَقُولُ).[2]

---

١ ) أخرجه البخاري: ٦٣١٥.

٢ ) أخرجه البخاري: ٦٣١١، مسلم:٢٩١٠.

بەڕائی کوڕی عازیب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووم: ئەگەر چوویە شوێنی خەوتن، وەك دەستنوێژێك کە بۆ نوێژ دەیگری، ئاوا دەستنوێژ بگرە، دوایی لەسەر لای ڕاستت پاڵ کەوە، ئنجا ئەو دووعایەی کە لە فەرمایشتی پێشێدا هات، فەرمووی: ئەوە بڵێ، لەو ڕیوایەتەدا ئەوەش زیاد کراوە: (واجْعَلهُنَّ آخِرَ مَا تَقُولُ)، با ئەو وشانە کە دەیانڵێی، دوا وشەت بن، کە دەیانڵێی، واتە: زیکرەکانی دیکە پێشتر بخوێنە، چونکە هەندێك زیکری دیکەش هەن، بۆ وێنە: سێ جاران خوێندنی سوورەتەکانی (الإخلاص و الفلق و الناس) بەدوا یەکدا بخوێندرێن، هەروەها (آیة الكرسي) بخوێندرێ، دیسان سێ ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی (البقرة) بخوێندرێن، بەڵام با دوا قسەت ئەو قسانە بن، کە لەو فەرمایشتەدا هاتوون.

٣) فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە:

{كَانَ النَّبيّ (صلی الله علیه وسلم) إِذَا أَخَذَ مَضْجعَهُ منَ اللَّيْلِ، وَضَعَ يَدهُ تَحْتَ خَدهِ الأيمن، ثمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أُمُوتُ وَأَحْيَا} [١]

واتە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەشەوێ کە دەچووە سەر جێگاکەی بۆ خەوتن، دەستی دەخستە بن ڕوومەتی، لای ڕاستی، دوایی دەیفەرموو: (أللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أُمُوتُ وَأَحْيَا)، واتە: ئەی خوایە! بەناوی تۆوە، دەمرمو دەژیم.

بەڵێ لە ڕاستییدا خەوتنیش جۆرێکە لە مردن، هەروەك بێداربوونەوەش، وەك زیندوو بوونەوەی ڕۆژی دوایی وایە، واتە: خوای باڵادەست هەر لە ژیانی خۆماندا، نموونەیەك لە مردنو زیندوو بوونەوەی پێشان داوین، بەحەقیقەت

١ ) أخرجه البخاري: ٦٣١٤

ئینسان کاتێك کە دەخەوێ، وەك مردوو بێ وایەو، کە بێداریش دەبێتەوە، وەك زیندوو بووبێتەوە وایە، وەك خوا لە سوورەتی لە (الزمر)-٤٢-دا، دەفەرموێ:

﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾.

واتە: خوا ڕووحەکان وەردەگرێ لەکاتی مردنداو، ئەوەی نەمردبێ لەکاتی خەوتندا، {ئەویش هەر جۆرێکە لە وەرگرتنی ڕووح}، ﴿فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ﴾، ئنجا ئەو ڕووحەی کە لەکاتی خەوتندا خوا وەریدەگرێ، کەسێك بڕیاری مردنی بۆ دابێ، نایگێڕێتەوە بۆ نێو جەستەی، {هەیە دەخەوێ، بێدار نابێتەوە، لە قیامەتێ چاو هەڵدێنێ، لە قۆناغی بەرزەخدا}.

دوایی دەفەرموێ: ﴿وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، ئەوەی دیکەش {کە مردنی بۆ بڕیار نەدابێ}، دەینێرێتەوە بۆ نێو جەستەکەی، تا کاتێکی دیارییکراو.

دوایی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ لەوەدا کۆمەڵێك نیشانە هەن، بۆ کەسانێك بیر بکەنەوە، ئەو خوایەی دەتخەوێنێ و، دوایی بێدارت دەکاتەوە، هەر ئەویش دەتمرێنێو زیندووت دەکاتەوە، وەك گوتراوە "النوم أخو الموت"، نووستن برای مردنە.

## بڕگەی سێیەم: لەكاتی لەخەوهەڵسان و بێداربوونەوەدا، چی بگوترێ؟

بۆ كاتی بێداربوونەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاوای فەرمووە:

١) {وَإِذَا اسْتَيْقَظَ، قَالَ: الْحَمْدُ للهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَما أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورِ}. [١]

واتە: ستاییش بۆ ئەو خوایەی كە دوای ئەوەی مراندبووینی، زیندووی كردینەوەو، تەنیا بۆلای ویش دەگەڕێینەوە.

٢) {الحمد لله الَّذي رَدَّ إليّ رُوحِي، وَعَافَانِي في جَسَدِي، وأذِّن لي بذكره}. [٢]

واتە: ستاییش بۆ ئەو خوایەی كە گیانمی بۆ گێڕامەوەو، لە جەستەم دا سەلامەتی كردم و، مۆڵەتی دام یادی بكەم.

٣) {لا إِلَهَ إِلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ حَيٌّ لا يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ}. [٣]

واتە: جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، تاكەو هاوەڵی نیە، حوكمڕانیی و ستایش تەنیا هی ویە، دەژیەنێ و دەمرێنێ و، ئەو زیندوویە نامرێ، خێر و چاكە هەر بەدەست ویەو، ئەو لەسەر هەموو شتێك توانایە.

---

١ ) أخرجه البخاري: ٦٦٤

٢ ) أخرجه ابن السني: ٩، قال الإمام النووي في الأذكار (ص٢١): إسناد صحيح.

٣ ) أخرجه البخاري: ١١٠٣، وأبو داود: ٥٠٦٠، والترمذي: ٣٤١٤، وابن ماجه: ٣٨٧٨.

## بڕگەی چوارەم: شێوازی خەوتنی پەسندو ناپەسند:

لەو فەرمایشتانەوە کە ڕابرد، دەزانین، کە واباشە ئینسان زیاتر لەسەر لای ڕاست بخەوێ، لەم فەرموودەیەشدا کە ئێستا دەیلێین، بۆمان دەردەکەوێ، کە لەسەر سك(ورگ) خەوتن، باش نیە:

{عن يعِيشَ بن طخْفَةَ الغِفَارِيَّ قَالَ: قَالَ أَبي: بينما أَنَا مضْطَجِعٌ في الْمسَجِدِ عَلَى بَطْني، إِذَا رَجُلٌ يُحَرِّكُني برِجْلِهِ، فَقَالَ: إِنَّ هذِهِ ضَجْعَةٌ يُبْغِضُهَا اللَّهُ، قَالَ: فَنَظَرْتُ، فإِذَا رسولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) }[1].

(یەعیشی کوڕی (طخفة)ی غیفاریی) دەڵێ: بابم گوتی: لەکاتێکدا لە مزگەوت لەسەر سك ڕاکشابووم، پیاوێك بە بەپێی جووڵاندمی و، فەرمووی: ئەم جۆرە خەوتنە خوا ڕقی لێ هەڵدەستێ، کە تەماشام کرد پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم).



١) أخرجه الطيالسي: ١٣٣٩، وأحمد: ١٥٥٨٢، وأبو داود: ٥٠٤٠، وابن ماجه: ٣٧٢٣، إلا أنه قال: عن قيس بن طخفة الغفارى عن أبيه، والبيهقي في شعب الإيمان: ٤٧٢١، والضياء: ١٤٦، قال: إسناده صحيح، وأخرجه أيضًا : البخارى فى الأدب المفرد: ١١٨٧.

## بڕگەی پێنجەم: لە یادی خوا بێ ئاگا نەبوون لەکاتی خەوتنیشدا:

وا باشە ئینسان لەکاتی خەوتنیشیدا لەیادی خوا بێ ئاگا نەبێ، تاکو بێدار دەبێتەوەو، ئەو زیکرو دوعایانەی کە باسمان کردن، بیانڵێ، یان هەر جۆرە زیکرێکی دیکە، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە:

{مَنْ قعَدَ مَقْعَدًا لَمْ يَذْكُرِ اللهَ تَعَالَى فِيهِ، كَانَت عَلَيْهِ مِنَ اللهِ تِرَةٌ، وَمَن اضطجَعَ مُضْطَجَعًا لا يَذْكُرُ اللهَ تَعَالَى فِيهِ، كَانَتْ عَلَيْه مِنَ اللهِ تِرَةٌ}. [١]

واتە: هەرکەسێك لە کۆڕو مەجلیسێك دابنیشێ، خوای بەرزی تێدا باس نەکرێ، بۆ وی بە گوناهو کەم و کوڕیی {بە کەمتەرخەمیی} دادەنرێ و، هەرکەسێك ڕابکشێ، بخەوێ، خوای بەرزی تێدا باس نەکا، ئەو خەوتنە لەلایەن خواوە بۆی بە کەم وکوڕیی‌و بە کەمتەرخەمیی دادەنرێ.



١) أبو داود بإسنادٍ حَسَنٍ: ٤٨٥٦.

## بڕگەی شەشەم: چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ خەون دیتندا:

سێ فەرموودان دێنین دەربارەی خەون، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر گرنگیی بە خەون داوە، دیارە خەونیش تەنیا لە حاڵـەتی نووسـتن و خـەوتن دایە:

١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفـەرموێ: {الرُّؤْيَـا الحَسَـنَةُ مـنَ اللهِ، والحُلُم مِنَ الشَّيْطَان، فَمَن رَأى شَـيْئًا يكرَهُـهُ، فَلْيَنْفُـثْ عَـن شِـماله ثَلاثًـا، ولْيَتَعَوَّذْ مِنَ الشْيْطان، فَإِنَّها لا تَضُرهُ} [١]

واتە: خەونی باش لە خواوەیەو، زڕە خـەون {(حُلُـم) واتـە: زڕە خـەون، یـان خەونی ناخۆش، خەونی تێکەڵ و پێکەڵ}، لە شەیتانەوەیە، ئنجا هەرکەسێك لە خەونی دا شتێکی بینی، پێی ناخۆش بوو، بـا سـێ جـاران تـف لـەلای چـەپی بکات، {مەبەست لە (نفث) تف (بصاق) نیە، بەڵکو جۆرێکـە لـە فـووکردن}، هەروەها با پەنا بەرێتە بەر خوا لە شەیتان، {بڵێ: (أعـوذ بـالله مـن الشـيطان الرجيم)} ئەو کاتە {ئەو خەونە ناخۆشەی بینیویەتی} زیانی پێ ناگەیەنێ.

واش باشە، ئینسان کە خـەونی ناخۆشـی بینـی، نەیگێڕێتـەوە، وەك دوایـی باسی دەکەین.

---

١) أخرجه البخاري: ٦٩٩٥، ومسلم: ٢٢٦١.

٢) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّة إلاَّ المُبَشِّراتُ، قَالُوا: وَمَا المُبشِّراتُ؟ قَالَ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ} (١)

واتە: لە پێغەمبەرایەتیی، {یانی: وەحیی و پەیوەندیی لەگەڵ خواداو، پەیامی تایبەتیی خوا بۆ هاتن}، تەنیا دڵخۆشكەرەكان ماون، گوتیان دڵخۆشكەرەكان چین؟ فەرمووی: خەونی باش.

خەونی باش جۆرێكە لە وەحیی، بەڵام دیارە پابەندكەر(مُلْزِم) نیە بۆ كەس، بەڵام بەرچاوڕوونییە بۆ خاوەنەكەی، بەتایبەت ئەگەر ئەو خەونە، پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) تێدا بێت، چونكە لە فەرمایشتی دیكەدا هاتوە، دەفەرموێ: شەیتان نایەتە سەر شێوەی من: {مَنْ رآني في المَنامِ فسَيَرَاني في اليَقَظَةِ ولا يَتمَثَّلُ الشيطانُ بي}(٢)، واتە: هەر كەسێك لە خەودا منی بینی، ئەوە لەحاڵەتی بێدارییدا دەمبینێ، {یانی: لە بەهەشت دەمبینێ}.

لە ڕیوایەتەكەی دیكەدا: {مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي إِنَّهُ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّلُ بِي} (٣) واتە: هەركەسێك لە خەوندا منی بینی، ئەوە بەدڵنیایی منی بینیوە، چونكە شەیتان نایەتە سەر شێوەی من.

٣) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِذَا رَأى أَحدُكُم رُؤْيَا يُحبُّهَا، فَإنَّما هِيَ مِنَ اللهِ تَعالَى، فَليَحْمَدِ اللهَ عَلَيهَا وَلْيُحُدِّثْ بِها [وفي رواية: "فَلا

١ ) أخرجه البخاري: ٦٦٩٠.

٢ ) أخرجه أحمد: ٢٢٦٥٩، ومسلم: ٢٢٦٦، وأبو داود: ٥٠٢٣، وأخرجه أيضًا البخاري: ٦٥٩٢.

٣ ) أخرجه مسلم: ٦٠٥٦.

يُحَدِّثْ بَها: إِلاَّ مَنْ يُحِبُّ}، وَإِذا رَأَى غَيرَ ذَلك مـِمَّا يَكرَهُ، فإنَّمـا هِـيَ مِـنَ الشَّيْطانِ، فَلْيَسْتَعِذْ منْ شَرِّهَا، وَلا يَذكُرها لأَحَدٍ، فَإِنَّهَا لا تَضُره} [١]

واتە: هەرکامێکتان خەونێکی بینی حەزی لێی بوو، پێی خۆش بوو، ئەوە لە خوای بەرزەوەیە، با ستایشی خوای لەسەر بکات و، با بۆ کەسێکی بگێڕێتەوە کە خۆشی دەوێ، (لە ڕیوایەتێکدا: با تەنیا بۆ کەسێکی بگێڕێتەوە، کە خۆشی دەوێ)، {نەك بۆ کەسێکی دڵنەخۆش، کە حەسوودیی پێ دەبات و ڕقی لێیەتی}، بەڵام ئەگەر جیا لەوەی بینی، {شتێکی بینی کە پێی ناخۆش بوو، حەزی پێ نەدەکرد}، ئەوە لە شەیتانەوەیە، با پەنا بەخوا بگرێ لە شەڕو خراپەی ئەو خەونەو، با بۆ کەسیشی نەگێڕێتەوە، زیانی پێ ناگەیەنێ.

واتە: با دڵی خۆی لەسەر ئەوە بچەسپێنێ، کە قازانجو زیان هەمووی بەدەست خوای پەروەردگارەو، با دڵی خۆی پێوە مشەوەش نەکاو، خۆی پێوە نارەحەت نەکا، ئەگەرنا ئامانجەکەی شەیتان دێتە دی، شەیتان بۆیە لە خەون دا شتی ناخۆشت پێشان دەدا، بۆ ئەوەی سەرقاڵت بکات و، دڵت نارەحەت بکات و، پڕی بکات لە خوتخوتەو خەیاڵی خراپ، ئنجا کە تۆ لە دڵی خۆتدا زۆرت هێناو بردو، حیسابت بۆ کرد، ئەوە مانای وایە ئامانجی شەیتان هاتۆتە دی.



١) أخرجه البخاري: ٦٩٩٥، ومسلم: ٢١٦٩.

## ئاڵقەی بیست و شەشەم:

# ڕەوشت و ئەدەبەكانی مامەڵە لەگەڵ حاڵەتی سەرەمەرگ و مردووان دا

بەڕێزان!

ئەم بابەتە، وەك هەموو بابەتەكانی دیكە گرنگ و هەستیارەو، هەستیارییەكی تایبەتیشی هەیە، ئێمەش هەوڵدەدەین بە كورتییو پوختیی، ئەو ئەدەبو ڕەوشتانەی كە پێویستە ڕەچاو بكرێن، بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ حاڵەتی سەرەمەرگدا، چ ئینسان خۆی بێ، چ غەیری خۆی. لە حاڵەتی سەرەمەرگدا ببینێ، هەروەها كەسانێك كە لەسەر مردنن یاخود مردوون، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بكات؟ لەوبارەوە چەند ئەدەبو ڕەوشتێك باس دەكەین، ئەویش لە شەش (٦) بڕگەدا:

## بڕگەی یەکەم: لەکاتی سەرەمەرگدا چی بگوترێ؟

١) پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (إِذَا حَضَرْتُمُ المريضَ، أَوِ المَيِّتَ، فَقُولُوا خيْراً، فَإِنَّ الملائِكَةَ يُؤَمِّنونَ عَلى مَا تقُولُونَ... } [١]

واتە: ئەگەر لەلای نەخۆشێك یان مردوویەك ئامادەبوون، {واتە: لەلای کەسێك کە خەریکی مردنە، لەسەرەمەرگدایە} ، قسەی باش بکەن، چونکە فریشتەکان (ئامین) دەکەن بۆ ئەوەی ئێوە دەیڵێن.

واتە: دوعا بکەن، چونکە ئەگەر لەوکاتەدا داوایەك لە خوای پەروەردگار بکەن، فریشتەکانیش دەڵێن: خوایە قبووڵی بکە، بۆیە قسەی باش بکەن و دوعای خێر بکەن.

٢) فەرمایشتێکی دیکە لەوبارەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لَقِّنُوا موْتَاكُمْ لاَ إِله إِلاَّ اللَّهُ} [٢].

واتە: مردووەکانتان، {ئەوانەی کە لەسەرەمەرگدان، بەرەو مەرگن} ، (لاَ إِله إِلاَّ اللَّهُ)یان فێربکەن، وا بکەن وشەی (لاَ إِله إِلاَّ اللَّهُ) دووبارە بکەنەوە، یانی: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، چونکە وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەفەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: {مَنْ كَانَ آخِرُ كَلَامِهِ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ} [٣]

واتە: هەرکەسێك دوا قسەی کە لە دنیا دەردەچێ، بریتی بێ لە گوتنی: (لاَ

١ ) أخرجه مسلم: ٩٠٩، وأبو داود: ٣١١٥.
٢ ) أخرجه مسلم: ٩١٦.
٣ ) أخرجه أبو داود: ٣١١٦، والحاكم (٣٥١/١)، وقال: صحيح الإسناد.

إِله إِلاَّ اللَّهُ) دەچێتە بەهەشت.

بۆیە واباشە ئەوانەی کە بەدەوری ئەو کەسەوەن، کە لە گیانەڵادایەو، نیشانەکانی مردنی لێ دەرکەوتوون، بە شێنەیی و، بە شێوازێکی جوانو میهرەبانانە، داوای لێ بکەن، کە (لاَ إِله إِلاَّ اللَّهُ) دووبارە بکاتەوە، بۆ ئەوەی وەبەر ئەو موژدەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەوێ.

## بڕگەی دووەم: لەکاتی مردنی کەس و خۆشەویستێك دا, چی بگوترێ و بکرێ؟

کاتێك ئینسان مردووی لێ دەمرێ، خۆشەویستێکی لێ دەمرێ، ئەمیش ئەدەبو ڕەوشتێکی جوانی بۆ دانراوە، وەك لەم دەقەوە دیارە:

١) {عَن أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، أَللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي، وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا، إِلاَّ أَجَرَهُ اللَّهُ فِي مُصِيبَتِهِ، وَأَخْلَفَ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا، قَالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ، قُلْتُ كَمَا أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَأَخْلَفَ اللَّهُ لِي خَيْرًا مِنْهُ: رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم}[١].

واتە: (أم سلمة) (خوا لێی ڕازی بێ) کە یەکێکە لە هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو، دەیفەرموو: هیچ بەندەیەکی خوا، بەڵایەکی بەسەر نایەت، {مردوویەك، خۆشەویستێکی لێ بمرێ}و، بڵێ: ئێمە هی خواین و، بۆلای خواش

١ ) أخرجه مسلم: ٢١٨.

دەگەڕێینەوە، ئەی خوایە! لەو بەڵایەمـدا پاداشـتم بـدەوەو، باشـترم پـێ بـدە، {هەرکەسێك وابڵێ} ، خوا پاداشتی دەداتەوە لە بەرامبەر بەڵایەکەی داو، لـەو نیعمەتەش کە لێی وەرگرتۆتەوە باشتری پێ دەبەخشێ.

(أم سلمة) دەڵێ: کاتێك (أبو سلمة)ی {هاوسەرم} وەفاتی کرد، ئـەوەی کـە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردم، گوتم، خواش (سبحانه وتعالى) چاکتر لە (أبو سـلمة)ی پێ بەخشیم، کە بریتی بوو لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، {پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) داخـوازیی کـردو، هاوسـەرگیریی لەگەڵدا کرد} .

٢) لەوبارەوە کە ئایا ئەگەر ئینسان کەسێك ببینێ، بمرێ، بەتایبەت عـەزیزو خۆشەویستێکی بێ، فرمێسکی بێ، دڵی تەنگ بێ، چۆنەو، دەبێ چۆن مامەڵـە بکات؟ لەو بارەشەوە، با سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدەین:

{عَن أَنس ﷺ أَنَّ رسُولَ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) دَخَلَ عَـلى ابْنـه إِبَـراهِيمَ، وَهُوَ يَجودُ بَنفسه، فَجعلتْ عَيْنا رسول اللَّه (صلى الله عليه وسلم) تَذْرِفَان، فقال لـه عبدُ الرَّحمن بنُ عوف: وأَنت يَا رسـولَ اللَّه؟، فَقَـالَ: يَـا ابْـنَ عـوْف! إِنَّهـا رَحْمةٌ، ثُمَّ أَتْبَعَها بأُخْرَى، فقال (صلى الله عليه وسلم): إِنَّ الْعَـيْنَ تَـدْمَعُ، والقَلْـب يَحْزَنُ، وَلا نَقُولُ إِلا ما يُرضي رَبَّنا، وَإِنَّا بفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ} [1]

ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەکاتێکـدا ئیبراهیمی کوڕی لە گیانەڵادا بوو چوو بۆ لای و، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چاوەکانی فرمێسکیان پێدا هات، (عبدالرحمان)ی کوڕی عەوف، پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا!(صلى الله عليه وسلم) ، تۆش دەگری؟ فەرمووی: ئەی کوڕی عـەوف!

١ ) أخرجه البخاري: ٣٠٣، ومسلم: ٢٣١٥.

ئەوە بەزەییە لەدڵی مۆرقدا، دوایـی فرمێسـکێکی دیکەشـی هـات، {یـاخود هەندێکی دیکەش گریا}و، فەرمووی: چـاو فرمێسـك دەڕێـژێ و، دڵ غـەمبار دەبێ، بەڵام هیچ شتێك ناڵێین، مەگەر ئەوەی کە پەروەردگارمان لێی ڕازی بـێ، ئەی ئیبراهیم! ئێمە بەهۆی جیابوونەوەو کۆچی تۆوە، دڵتەنگ‌و خەمبارین.

## بڕگەی سێیەم: شۆردن و کفن کردن و نوێژ لەسەرکردن و بەخاکسپاردنی مردوو:

ئەدەبێکی دیکەی مامەڵە لەگەڵ مردوودا، ئەوەیە کە مسـوڵمانان پێویسـتە مردوو بشۆن و، کفنی بکەن‌و، نوێژی لەسەر بکەن‌و، بە خاکی بسپێرن.

١) لـە بـارەی شـۆردنەکەیەوە، پێغەمبـەر (صلی اللـه علیـه وسـلم) دەفـەرموێ: {مَنْ غَسَّلَ مَيِّتًا فَكَتَمَ عَلَيْهِ، غُفِرَ لَهُ أَرْبَعِينَ مَرَّةً}[١].

واتە: هەر کەسێك مردوویەك بشوات و، ئەگەر کەم‌و کوڕیی‌و عـەیبێکی لێ بینی {لە جەستەی دا}، پەنهانی بکات و، باسی نەکا، خوا چل کـەڕەتان لێـی دەبووریّ، {یانی: لە چل گوناهی دەبووریّ}.

بەڵێ ئەدەبێکی بەرزە کەسێك کە مردوو دەشوات و، دەبینێ نوقسانییەك لە جەستەی دا هەبووەو، هەموو کەس پێی نەزانیوە، نابێ باسی بکات.

٢/أ) بـە نسـبەت نوێـژ لەسـەرکردنیەوە، کـە وەك چـۆن شـۆردنی فـەرزی کیفایەیەو، هەر کەسێك کە دەمرێ، پێویسـتە مسـوڵمانان بیشـۆن، بەهـەمان شێوە: کفن کردنی‌و نوێژ لەسەر کردنیشی، هەر فەرزی کیفایەن، ئنجا لـەبارەی

---

١ ) أخرجه الحاكم في المستدرك: ١٣٠٧، وقال: هذا حديث صحيح على شرط مسلم و لم يخرجاه.

نوێژ لەسەر كردنیەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ شَهِدَ الْجِنَازَةَ حَتَّى يُصَلَّيَ عَلَيْهَا، فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ، فَلَهُ قِيرَاطَانِ، قِيلَ: وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ} [1].

واتە: هەركەسێ ئامادەی جەنازە {تەرم}ێك بوو، تاكو نوێژی لەسەر دەكرێ، ئەوە بە ئەندازەی قیراتێك پاداشتی هەیە، بەڵام هەركەسێك ئامادەی تەرمێك {جەنازەیەك} ، بوو تاكو بە خاك دەسپێردرێ، بە ئەندازەی دوو قیرات پاداشتی هەیە، گوترا: ئەو دوو قیراتە چین؟ فەرمووی: وەك دوو چیای مەزن وان، {بە ئەندازەی دوو چیای مەزن پاداشتی هەیە} .

٢/ب) هەر لەبارەی نوێژ لەسەر مردوو كردنەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {ما مِن ميِّتٍ فيُصلِّي عليهِ أُمَّةٌ منَ المسلمينَ، يَبلُغونَ مئةً كُلُّهم يَشفَعون لَه، إلَّا شُفِّعوا فيهِ} [2].

واتە: هیچ مردوویەك نیە، كۆمەڵێك لە مسوڵمانان نوێژی لەسەر بكەن، كە ژمارەیان بگاتە سەد(١٠٠) كەس، هەموویان تكای بۆ بكەن، {بەدڵ بۆی بپاڕێنەوە} ، مەگەر خوا دەیانكاتە تكاكاری.

واتە: تكاو شەفاعی ئەوان بۆ ئەو مردووە قبووڵ دەكا.

٢/ج) هەر لەو بارەوە فەرموودەیەكی دیكەش هەیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلًا، لا يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا، إِلَّا شَفَّعَهُمْ اللَّهُ فِيهِ} [3].

---

١ ) أخرجه البخاري: ١٣٢٥، ومسلم: ٩٤٥.

٢ ) أخرجه مسلم: ٩٤٧.

٣ ) أخرجه مسلم: ٩٤٨.

واتە: هیچ پیاوێكی مسوڵمان نیە، {دیارە كوڕەكە هی پیاوان بووە، وەك زۆر جار دەڵێین، ئەگەرنا بۆ ئافرەتیش هەروایە}، كاتێك كە دەمرێ چل (٤٠) پیاو نوێژی لەسەر بكەن، كە هیچ كامیان هاوبەش بۆ خوا دانەنێ، مسۆگەر خوا دەیانكاتە تكاكارو، تكای ئەوان لەبارەی ئەو پیاوەوە قبووڵ دەكات.

٢/د) لەبارەی دوعاكردنەوە بۆ مردوو، لەكاتێكدا كە نوێژی لەسەر دەكرێ، یان دوعای بۆ دەكرێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى الْمَيِّتِ، فَأَخْلِصُوا لَهُ الدُّعَاءَ} [1].

واتە: هەركاتێك نوێژتان لەسەر مردوو كرد، {یان مەبەست لە نوێژ بۆ پاڕانەوەیە}، بەدڵسۆزیی و لە دڵەوە، لە ناخەوە بۆی بپاڕێنەوە.

٣) لەوبارەوە كە پێویستە مردوو زوو بە خاك بسپێردرێ، كە ئەوەش ڕەوشت و ئەدەبێكی بەرزی مامەڵەیە لەگەڵ مردوودا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {أَسْرِعُوا بِالْجِنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا، وَإِنْ يَكُ سِوَى ذَلِكَ، فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ} [2]

واتە: خێرایی بكەن لە بەخاكسپاردنی جەنازەدا، ئنجا ئەگەر چاك بێ {ئەو جەنازەیە}، {واتە خاوەن ئیمانو كردەوەی باش بێ}، ئەوە ئێوە بەرەو چاكە دەیبەن، {زوو بەخاكی دەسپێرنو بەرەو خێرو چاكە دەچێ} و، ئەگەر پێچەوانەی ئەوەش بێ، {واتە: خراپ بێ}، ئەوە شەڕو خراپەیەكە زوو لەسەر ملی خۆتانی لادەبەن.

---

١) أخرجه أبو داود: ٣١٩٩، وحسنه الألباني.

٢) أخرجه البخاري: ١٣١٥، ومسلم ٩٤٤.

**بڕگەی چوارەم: قەرزدانەوە بۆ مردووی قەرزدار:**

ئەدەبو ڕەوشتێکی دیکەی مامەڵە لەگەڵ مردوودا، ئەوەیە، مردوویەك کە دەمرێ، ئەگەر قەرزدار بێ، واباشە نزیکەکانی، یاخود مسوڵمانان خۆبەخشانە، قەرزەکەی بۆ بدەنەوە.

١) چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ}[1].

واتە: ڕووحی مسوڵمان پەیوەستە بە قەرزەکەیەوە، هەتا قەرزەکەی لە جیاتی دەدرێتەوە.

جاری وا هەبووە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەسێك قەرزدار بووبێ نوێژی لەسەر نەکردوە.

٢) جارێك پرسی: ئایا ئەو کەسەی وەفاتی کردوە قەرزدارە؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: نوێژی لەسەر بکەن، یەکێك لە هاوەڵان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) قەرەزەکەی لەسەرمن، بۆی دەدەمەوە، فەرمووی: قەرزەکەی بۆ دەدەیەوە؟ گوتی: بەڵێ، ئنجا بۆ خۆی نوێژی لەسەر کرد.[2]

هەڵبەتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی بووە، تەمبێیان بکات و، مسوڵمانان فێر بکات، هەوڵبدەن قەرزدار نەبن و، بە قەرزداریی نەمرن، خۆیان نەخەنە بن قەرزو قۆڵەوە.

---

١) أخرجه الترمذي ١٠٧٨، وقال: حسن.

٢) أخرجه الطبراني في الكبير: ٧٥٠٨.

## بڕگەی پێنجەم: ڕووحی مردوو یەکسەر دوای کێشرانی لە قۆناغی بەرزەخدا، لە بەهەشت یان دۆزەخ دا دەبێ:

{عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الغَرْقَدِ، فَأَتَانَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ، وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ، نَكَّسَ، فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ، إلَّا وقد كُتِبَ مقعده مِنَ النَّارِ، ومقعده مِنَ الجَنَّةِ، فَقَالوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَفَلاَ نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا؟ فقال: اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ}[1].

واتە: عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوا لێی ڕازی بێ) ئامۆزای پێغەمبەر، دەڵێ: ئێمە لە بەخاکسپاردنی جەنازەیەکدا بووین، لە (بَقِيعِ الغَرْقَدِ)، {قەبرستانی بەقیع مەشهوورە لە مەدینە} ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات بۆلامان‌و دانیشت‌و، ئێمەش لە دەوری دانیشتین، گۆچانێکی پێ بوو، گۆچانەکەی لە زەوییەوە دەژەنی، {خۆی پێ دەخافڵاند}و، سەریشی نەوی کردبوو، دوایی فەرمووی: هیچ کام لە ئێوە نیە، مەگەر شوێنی لە ئاگری دۆزەخ و، شوێنی لە بەهەشتدا، دیاریی کراوە، خەڵکەکەش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) ئایا پشت بەو نووسینە نەبەستین، {مادام نووسرابێ‌و تۆمار کرابێ، لێ گەڕێین لە کردەوە} ؟، فەرمووی، نەخێر کردەوە بکەن، چونکە هەر کامێکتان ئەو جۆرە کردەوەیەی بۆ ئاسان دەکرێ، کە بگونجێ لەگەڵ ئەو شوێنەدا کە بۆی دروستکراوە، واتە: تۆ بەکردەوەکەی خۆت دەزانی: داخۆ کوێت بۆ نووسراوە؟ ئەگەر کردەوەی باش بکەی، دیارە بەهەشتت بۆ نووسراوەو، ئەگەر

---

[1] ) أخرجه البخاري: ٣٦٢، ومسلم: ٢٦٤٧.

کردەوەی خراپ بکەی، دیارە دۆزەخت بۆ نووسراوە، کردەوەکەی خۆت، ئاوێنەی سەرئەنجامەکەی خۆتە، کردەوەو حاڵی تۆ، ئاوێنەی قەدەری خوایە.

## بڕگەی شەشەم: هەرکەس مرد، کردەوەی دەبڕێ، مەگەر لە چەند ڕێیەکەوە:

بەڵگەی ئەوەش ئەو فەرموودەیەیە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ: إِلاَّ مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ} (١).

واتە: مرۆڤ کە مرد، کردەوە چاکەکانی دەبڕێن، دەپچڕێن، مەگەر لە سێ ڕێیانەوە، {لە سێ ڕێیانەوە کردەوەی چاکی هەر بۆ دەنووسرێن و، پاداشتی هەر بۆ دەچێ}.

١- (صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ) خێرێکی بەردەوام: {ڕێیەکی چاککردوە، پردێکی چاککردوە، مزگەوتێك، قوتابخانەیەك، نەخۆشخانەیەکی دروستکردوە، هەتا ئەو شتە بمێنێ، خێرو پاداشتی بۆ دەچێ}.

٢- (عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ) زانیارییەکی بەهرەلێوەرگیراو، {کتێبی نووسیوە، قوتابی پێ گەیاندوون، خەڵکی شارەزا کردوە، تاکو ئەو زانیارییە بمێنێتەوە، ئەویش خێرو پاداشتی بۆ دەچێ}.

---

١) أخرجه مسلم: ١٦٣١.

٣- (وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ) منداڵێکی صاڵح کە بۆی بپاڕێتەوە، {ئنجا ئـەو منداڵە، چ کوڕ، چ کچ، بۆی بپاڕێتەوە، یان هەر طاعەتێك ئەنجام بـدات، ئەو باب‌و دایکە لەخێرو پاداشتی ئەو منداڵەیاندا بەشدارن}.

هەڵبەتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك نموونـە ئـەو سـێیەی هێناونـەوە، ئەگەرنا لە فەرمایشتی دیکەداو، بەعەقڵ‌و سەلیقەش دەزانـرێ، کـە دەگـونجێ شتی دیکەش هەبێ، کە لەدوای مردن، ببێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ خێرو پاداسـتی بەردەوام بۆ بچێت.

ئاڵقەی بیست و حەوتەم:

# ڕەوشت و ئەدەبەکانی تازیەو سەرەخۆشیی

بەڕێزان!

لەم ئاڵقەیەدا ئەو ئەدەبو ڕەوشتانەی کە پێویستن, بۆ دڵدانەوەی کەسێك، کە مردووی لێ دەمرێ، یاخود هەر بەڵایەکی بەسەردێ و، سەرەخۆشیی لێ دەکرێ و، دڵی دەدرێتەوە، دەخەینەڕوو، ئەویش لە سێ بڕگەی پوخت و گوشراودا:

## بڕگەی یەكەم: پێگەو گرنگیی سەرخۆشیی لێكردن و دڵدانەوە:

١) یەكەمین دەق كە لەو بارەوە دەیهێنینەوە، ئەم دەقەی سوننەتە:

{عَنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْد قَالَ: أَرْسَلَت ابْنَةُ النَّبيِّ (صلى الله عليه وسلم): أن ابْني قد احتُضرَ فاشْهَدْنا، فَأَرْسَلَ يُقْرئُ السَّلاَمَ، وَيَقُولُ: إنَّ للّه مَا أَخَذَ، وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلُّ شيئ عنْدهُ بأَجَل مُسَمًّى، فَلْتَصْبر، وَلْتَحْتَسبْ، فَأَرْسَلَتْ إلَيْه تُقسمُ عَلَيْه لَيَأْتيَنَّهَا، فَقَامَ وَمَعَهُ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَمَعَاذُ بْنُ جَبَل، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْب، وَزَيْدُ بْنُ ثَابت وَرجَالٌ (رضي الله عنهم)، فَرُفعَ إلَى رَسُول اللَّه (صلى الله عليه وسلم) الصَّبيُّ فأَقعده في حجره، وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّه، مَا هَذَا؟ فَقَالَ: هَذه رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللَّهُ في قُلُوب عبَاده – وفي رواية: في قلوب من شاء من عباده- وَإنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ منْ عبَاده الرُّحَمَاءَ} [(١)].

واتە: ئوسامەی كوڕی زەید، {كە بە خۆشەویستی كوڕی خۆشەویست، (الْحِبُّ بْنِ الْحِبِّ) ناودارە، چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەم زەیدی كوڕی حاریسەی زۆر خۆشویستوە، كە كاتی خۆی لەسەردەمی پێش پێغەمبەرایەتییدا كردوویەتی بە كوڕی خۆی، كە كۆیلە بووەو، دوایی ئازادی كردوە، هەم ئوسامەی كوڕیشی زۆر خۆشویستوە} ، (**خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ**) دەڵێ: كچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) {ڕوونی نەكردۆتەوە كامیانە؟ بەڵام بەدڵنیایی (فاطمة) نەبووە، یان (زینب) بووە، یان (أم كلثوم)بووە، یان (رُقيّة) بووە، (**خوا**

---

١ ) أخرجه البخاري: ١٢٨٤، ومسلم: ٩٢٣.

لێیان ڕازی بێ)} ، ناردی بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كە: كوڕەكەم لە گیانەڵادایە، تۆش ئامادەبە لەلامان، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وەڵامی بۆ ناردەوە، كە سەلامت لێ بێ و، پێشی فەرموو: كە خوا ئەوەی وەریبگرێ، هی خۆیەتی و، ئەوەش كە دەیبەخشێ، هەر هی خۆیەتی و، هەموو شتێك لەلای خوا كاتێكی دیاریكراوی هەیە، با خۆڕاگر بێو، پاداشتی ئەو بەڵاو موسیبەتەی لە خوا بوێ.

بەڵام دووبارە كچەكەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) ناردیەوە {نوێنەری ناردەوە}و، سوێندی خواردبوو، كە دەبێ، هەر بێت {ئامادەی بێتو تەشریفی بێ} ، ئیدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەڵساو، سەعدی كوڕی عوبادەو، موعاذی كوڕی جەبەلو، ئوبەی كوڕی كەعبو، زەیدی كوڕی ثابیت و، پیاوانێكی دیكەش لە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) لە خزمەتی دا چوون، كەچوون منداڵەكە بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەرزكرایەوە، {واتە خستیانە باوەش و كۆشی} ، ئەویش لە كۆشی خۆیدا داینیشتاند، لەو حاڵەتەدا گیانی دەدا ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) چاوەكانی فرمێسكیان پێداهات، سەعدی كوڕی عوبادە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) ئەمە چییە؟ فەرمووی: ئەمە بەزەییەكە خوا لەدڵی بەندەكانی دا دایدەنێ. {لە ڕیوایەتێكدا فەرمووی: ئەمە بەزەییەكە خوا لەدڵی هەركەس لە بەندەكانی دا كە بیەوێ دایدەنێ} و، بەدڵنیایی خوا بەزەیی بەو بەندانەی دا دێتەوە، كە ئەوانیش بە بەزەیین لەگەڵ غەیری خۆیاندا.

كەواتە مرۆڤ دەبێ كەسێك بەڵایەكی بەسەردێ، یان عەزیزو خۆشەویستێكی دەمرێ، بەپێی توانا بچێت دڵی بداتەوەو، ورەی وەبەرنێ و، ئاگای لێ بێ.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یەکەمجار نەچووە، بەڵام دوایی کە کچەکە زۆر وەڵامی ناردوەو سوێندی خواردوەو، داکۆکیی کردوە، ئنجا تەشریفی چووەو، منداڵەکەی خستۆتە کۆش و باوەشیو، لە کۆش و باوەشی ویدا گیانی داوە.

٢) دەقێکی دیکە لەوبارەوە:

{لما قتل جعفر بن أَبي طَالب، قَالَ رَسُول اللّٰه (صلی الله علیه وسلم): اصْنَعُوا لآلِ جَعْفَرٍ طَعَامًا فَإِنَّهُ قَدْ أَتَاهُمْ أَمْرٌ شَغَلَهُمْ} [١].

جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب (خوا لێی ڕازی بێ) دوای (زید بن حارثة) فەرماندەی سوپای مسوڵمانان بوو، لە جەنگی (مؤتة)دا، ئێستاش گۆڕەکەی لەوێیە، هی (زەید) و هی (جەعفەر)یش و هی (عبداللّٰه)ی کوڕی (رواحة)ش، هەرسێکیان یەك لەدوای یەك لەوێ شەهید بوون و، دوایی خالیدی کوڕی وەلید (خوا لێی ڕازی بێ)، تاکتیکی جەنگی گۆڕی و، بەشێوەیەکی زیرەکانە ئەو سێ هەزار(٣,٠٠٠) کەسەی دەرباز کرد، لە ئابلۆوقەی ڕۆمەکانو عەرەبە بەکرێگیراوەکان(المرتزقة)، کە لەگەڵ ڕۆمەکان دا بوون، کە لە هەندێك ڕیوایەتاندا هاتوە: ڕۆمەکان ژمارەیان سەد هەزار(١٠٠,٠٠٠) کەس بووەو، عەرەبە مورتەزیقەکانیش، کە لەگەڵ ڕۆمەکاندا بوون، ئەوانیش ژمارەیان سەد هەزار(١٠٠,٠٠٠) کەس بووە، واتە دوو سەد هەزار(٢٠٠,٠٠٠) کەس لەبەرامبەر سێ هەزار(٣٠٠٠) کەسدا، بەڵام ئەوە بوو کە خالیدی کوڕی وەلید (خوا لێی ڕازی بێ) دوای ئەوەی سێ فەرماندەکانی مسوڵمانان شەهید دەبن، ئەو سوپا ئابلۆوقە دراوەو گرفتارە، دەرباز دەکا.

---

١) أخرجه أبو داود: ٣١٣٢، والترمذي: ٩٩٨ وصححه الألباني في صحيح الجامع: ١٠١٥.

ئنجا کاتێك کە جەعفەری کوڕی ئەبی طالێب کوژرا، {کە ئـامۆزای بـوو}، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: خواردن بۆ ماڵی جەعفەر ئامادە بکـەن، چونکە بەڵایەکیان بەسەرهاتوە، وەزعێکیان بەسەر هاتوە سەرقاڵی کردوون، کـە نەیانپەرژێتە سەر خواردن ئامادەکردن.

٣) فەرمایشتێکی دیکـە لـەو بـارەوە، کـە بۆمـان باسـی خێـرو پاداشـتی دڵدانەوەی خاوەن موسیبەت دەکا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَـا مِنْ مؤمنٍ يُعَزِّي أَخَاهُ بمصيبةٍ، إلاَّ كَساهُ اللهُ مِنْ حُلَلِ الكَرَامَةِ يَوْمَ القِيامة} (١)

واتە: هیچ بڕوادارێك دڵی برایەکەی خـۆی ناداتـەوە، کـە بەڵایـەکی بەسـەر هاتوە، مەگەر خوا لە پۆشاکی ڕێز لێگرتنی دەکاتە بەر (پێدەپۆشـێ)، لـەڕۆژی قیامەتدا، واتە: پۆشاکی ڕێزو حورمەت بە هەرکەسێك دەپۆشێ، بەهۆی ئەوەوە کە دڵی برایـەکی مسـوڵمانی داوەتـەوە، {یـان دڵـی خوشـکێکی مسـوڵمانی داوەتەوە}، وەك زۆرجار گوتوومانە: دیارە کوڕەکە کـوڕی پیـاوان بـووە، بۆیـە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وایفەرمووەو، جاری واش هەیە کە باسی ئافرەتانیش دەکات، هەروەها جاری وایە باسی مـرۆڤ دەکـات بـە گشـتی، چ پیـاو بـێ، چ ئافرەت.

١ ) أخرجه إبن ماجة: ١٦٠١، وحسَّنه الألباني في سنن ابن ماجة: ١٣٠١.

## بڕگەی دووەم: ئامۆژگاریی كردنی تازیەداران كە خۆیان لە نەریتی نەفامانە بپارێزن:

ئەدەبێكی دیكەی مامەڵە لەگەڵ قەزیەی تازیەو سەرەخۆشیی و دڵدانەوەدا، ئەوەیە كە وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی پێ دەكا، كە دەبێ خۆ بپارێزرێ لە چەند ڕەوشت و ڕەفتارێكی نەفامیی، دەفەرموێ:

{لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ،وَدَعا بِدَعْوى الْجاهِلِيَّةِ} (١)

واتە: هەركەسێك لە ڕوومەتی خۆی بدات {ڕوومەتی خۆی بڕنێتەوە}و، یەخەی خۆی دابدڕێ و، وەك سەردەمی نەفامیی بە مردوو هەڵابڵێ، لە ئێمە نیە.

لە ئێمە نیە: واتە لەو ئاكارو ڕەفتارانەدا لە ئێمە نیە، چونكە مسوڵمانان لەبەرامبەر تاقیكردنەوەی خوادا، لەبەرامبەر بەڵاو موسیبەتەكانی خوادا، خۆڕاگرن، پشوو درێژن، ناشوكریی ناكەن و، ڕەوشت و ئەدەبە بەرزەكانی مسوڵمانەتیی ڕەچاو دەكەن، نەك عادەت و نەریتی نەفامیی، كە بەداخەوە ئێستا لە زۆر شوێنی عالەمی ئیسلامیی دا، نەفەر بەكرێ دەگیرێ بۆ پێهەڵاگوتنی مردوو، بۆ شین گێڕان، كە بێگومان ئەوە شتێكی نەفامانەیە.

ئنجا كەسێك كە بەشداری تازیەو سەرەخۆشیی دەبێ، دەبێ بۆ ئەوە بەشدار بێ، كە دڵیان بداتەوەو، ئامۆژگارییان بكات، بەرچاویان ڕۆشن بكاتەوەو، ورەیان وەبەرنێ، ئەوە شتێكی پەسندەو ئەوەش دڵدانەوەیە، نەك بە پارە

---

١ ) أخرجه البخاري: ١٢٩٧، ومسلم: ١٠٣.

شینییان بۆ بگێڕیٚو، زیاتر دڵیان بریندار بكات و، بە مردووەكە هەڵابڵیٚو ئەوانیش زیاتر بوروژێنیٚ و، زیاتر بگریەنو نارەحەتیی دەربڕن!

## بڕگەی سێیەم: وێڕای كوژراوی ڕێی خوا، چەند جۆرە مردوویەكی دیكەی بڕواداریش شەهیدن:

بەڵگەی ئەوەش كە گوتمان، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) كە دەفەرمویٚ: {الشُّهَدَاءُ سَبْعَةٌ سِوَى الْقَتْلِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ: الْمَطْعُونُ شَهِيدٌ، وَالْغَرِقُ شَهِيدٌ، وَصَاحِبُ ذَاتِ الْجَنْبِ شَهِيدٌ، وَالْمَبْطُونُ شَهِيدٌ، وَالْحَرِقُ شَهِيدٌ، وَالَّذِي يَمُوتُ تَحْتَ الْهَدْمِ شَهِيدٌ، وَالْمَرْأَةُ تَمُوتُ بِجُمْعٍ شَهِيدٌ}[1].

واتە: جگە لەكوشتنی ڕێی خوا، {كەسێك كە لە مەیدانی جەنگدا دەكوژریٚ}، شەهیدەكان حەوتن:

١) ئەو كەسەی بە كولێرا (طاعون) دەمریٚ.

٢) ئەو كەسەی لە ئاودا دەخنكیٚ.

٣) ئەو كەسەی كە بە دەردی كەلەكە (ذَاتِ الْجَنْبِ)، وا پیٚ دەچیٚ ڕیخۆڵە كوێرە بووبیٚ.

٤) ئەو كەسەی كە بە زگ ئێشە دەمریٚ.

٥) ئەو كەسەی كە بە سووتان دەمریٚ.

٦) ئەو كەسەی كە لەژێر خانوودا، یان چیادا، یان گردێكی بەسەردا دەڕووخیٚ، خەندەقێكی بەسەردا دەڕووخیٚ، یان بیرێك.

---

١) أخرجه مالك: ٥٥٢، والنسائي: ١٨٤٦، وأبو داود: ٣١١١، وصحّحه الألباني.

٧) ئافرەتیش كە لەسەر منداڵ دەمرێ.

لێرەوەش ڕایدەگەیەنم: كە بە تەئكید پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەمانەی وەك نموونەی ڕۆژگاری خۆی هێناون، ئەگەرنا ئێستا كەمتر وایە خەڵك بە ڕیخۆڵە كوێرە بمرێ، چونكە چارەسەر دەكرێ، كەمتر وایە خەڵك، بۆ وێنە: بە بن خانوو بكەوێ، یان بەبن بیر بكەوێ، بەڵام ئێستا بەڕووداوی سەیارە دەمرێ، بەڕووداوی تەیارە دەمرێ، بەو ڕووداوانەی دیكە دەمرێ، بۆ وێنە: كرێكار لە شوێنی بەرز بەردەبێتەوە، بۆیە بە تەئكید، ئەوانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناونی، ئەو حەوتە، حەوت جۆرە مردنن لە ڕۆژگاری ئەودا، كە ئەگەر تەماشایان بكەین، هەموویان مردنی كتوپڕن.

ئنجا لە فەرمایشتێكی دیكەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، {مَوْتُ الْفَجْأَةِ رَاحَةٌ لِلْمُؤْمِنِ، وَأَخْذَةُ أَسَفٍ لِلْفَاجِرِ} [١]، واتە: مردنی كتو پڕ بۆ بڕوادار ئاسوودەییە، بۆ تاوانبار پەشێمانییە، چونكە: فریای هیچ ناكەوێ.

بۆیە من پێم وایە، ئەوانەش كە بە ڕووداوی سەیارەو، بە ڕووداو و كارەساتەكانی دیكەش دەڕۆن، ئەوانەش بە تەئكید، ئەگەر ئەهلی ئیمان بن - كە شەهیدیی تەنیا بۆ ئەهلی ئیمانەو، ئەوەی ئیمانی نەبێ، حیسابی جیایە- بەشەهید دادەنرێن، واتە: شەهیدی قیامەتیی، چونكە لەڕووی پاداشتی قیامەتییەوە، ئەو نازناوەیان وەرگرتوە، ئەگەرنا لە ڕووی مامەڵەی دیكەوە هەروەك مردووانی دیكە مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێ، واتە: دەشۆرێن و كفن دەكرێن و نوێژیان لەسەر دەكرێ.

---

١) أخرجه أحمد: ٢٥٠٨٦، والبيهقي: ٦٣٦٤، عن عائشة رضي الله عنها، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده واه عبيد الله بن الوليد الوصافي متروك وعبد الله بن عبيد الله بن عمير لم يسمع من عائشة.

بەڕێزان!

ئایا مسوڵمانان دەبێ چۆن مامەڵە بکەن لەگەڵ حوکمڕانانو بەرپرساندا، کەسانێك، کە مشووری کاروباریان بۆ دەخۆن و، کاروباری وڵات هەڵدەسووڕێنن؟ هەڵبەتە ئەم بابەتە بابەتێکی یەکجار گرنگ و هەستیارەو زۆر بە لقو پۆپەو، وردەکاریی زۆری تێدا هەیە، لە مەوسووعەی: (ئیسلامو دەوڵەتداریی[1])دا بەدرێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە، لەمیانی باسی تێڕوانینی ئیسلام بۆ دەوڵەتداریيو حوکمڕانیی دا، هەروەها لە کتێبی یازدەیەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا،[2] بەڵام لێرە پوختەو گوشراو و خوڵاسەیەکی ئەو ئەدەبو ڕەوشتانە کە مسوڵمانان دەبێ ڕەچاویان بکەن، لە مامەڵەیان لەگەڵ حوکمڕانو بەرپرسان دا، لە پێنج(٥) بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

---

١) ئەو مەوسووعەیە چواربەرگەو لەلایەن نووسینگەی تەفسیرەوە چاپ کراوە، بڕوانە: بەرگی دووەم: {بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لە ئیسلام دا}.

٢) بڕوانە: الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة، أو معالم الدولة في الإسلام، ط٢/ ٢٠٢٠م، دار الحكمة- لندن.

**بڕگەی یەکەم: بناغەی حوکمڕانیی ڕاوێژە:**

مسوڵمانان بزانن کە بناغەی کاروبار بەڕێوەبردنیان، بناغەی حوکمڕانیی و ئیدارەدانی وڵات، بریتیە لە ڕاوێژ(الشوری)، خوا (سبحانه وتعالی) لە سوورەتی (شوری)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: بڕواداران ئەوانەن کە بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە چوون و، نوێژیان بەرپا کردوەو، کاروباریان بەڕاوێژەو، لەوەی پێمان داون دەبەخشن.

وەك دەبینین: خوا (سبحانه وتعالی) کاروباری بە ڕاوێژبەڕێوەبردنی مسوڵمانانی، خستۆتە نێوان بەرپاکردنی نوێژو، ماڵو سامان بەخشینەوە، کە زۆرجار نوێژو زەکات لە قورئاندا پێکەوە هاتوون، چونکە نوێژ حەقی خوایەو، زەکاتیش حەقی خەڵکە، یان نوێژ پایەی مەعنەوییەو، زەکات پایەی ماددییە، ئنجا ڕاوێژیش پایەی سیاسییو کۆمەڵایەتییە.

کەواتە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، هەر حوکمڕانییەك، لەسەر بناغەی ڕاوێژ نەبێ، واتە لەسەر بناغەی گەڕانەوەی بۆ ڕای خەڵك نەبێ ، ڕەوایەتیی نیە.

لە ئایەتی (١٢٤)ی سوورەتی (البقرة)دا، خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ ﴾.

واتە: یادبکەوە کاتێك پەروەردگاری ئیبڕاهیم، بە چەند وشەیەك ئەوی تاقیکردەوە، {واتە چەند ئەرکێکی پێ سپاردن}، ئەویش تەواوی کردن.

خوا فەرمووی: من دەتگێڕم بە پێشەوا بۆ خەڵك، {مادام لە تاقیكردنەوەكان دەرچووی} ، ئیبراهیم گوتی: ئەدی لە وەچەكەم، {لەوانیش پێشەواو حوكمڕانان دادەنێی؟} خوا فەرمووی: ستەمكاران پەیمانی من نایانگرێتەوە، {واتە: ستەمكاران بێ بەشن لەوەی كە بەپێی شەرعو دینی من ڕەوایەتیی حوكمڕانییان هەبێت} .

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە، كە ئەمە خوا زۆر بەڕوونیی و ڕاشكاویی دەیفەرموێ، كە ستەمكارانی خۆسەپێن بەپێی شەریعەتی خوا ڕەوایەتییان نیە، چونكە كاروباری مسوڵمانان دەبێ بە ڕاوێژ بێ!

شایانی باسیشە ئەم ئایەتی (٣٨)ی سوورەتی (الشورى) لە مەككە هاتۆتە خوارێ، چونكە: سوورەتی (الشورى) سوورەتێكی مەككەییە، واتە: خوا هەر لە مەككەوە مسوڵمانانی ڕاهێناوەو تێگەیاندوەو حاڵیی كردوون، كە دەبێ كاروباریان بە ڕاوێژ بێ: چ كاروباری كۆمەڵێك، چ كۆمەڵگایەك، چ دەوڵەتێك، ئەگەرنا كارێك بەبێ ڕاوێژ، بەبێ پرسو ڕای مسوڵمانان ئەنجام بدرێ، ڕەوایەتیی نابێ.

هەروەها لە ئایەتی (١٢٤)ی سوورەتی (البقرة)دا، خۆ زۆر بە ڕوونو ڕاشكاویی دەفەرموێ: ستەمكاران پەیمانی من نایانگرێتەوە، بەڵكو لە ئایەتی (١٨)ی سوورەتی (هود)دا خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئاگاداربن! نەفرینی خوا لە ستەمكاران، دیسان لە سوورەتی (الأعراف)یشدا دەفەرموێ: ﴿ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: بانگكەرێك لەنێوانیاندا ڕایگەیاند، كە: نەفرینی خوا لە ستەمكاران.

ستەمکاران، واتە: ئەوانەی کە دەسەڵات قۆرخ دەکەن، سەروەتو سامان قۆرخ دەکەن، خۆیان بەسەر خەڵکدا دەسەپێنن، ئەوانە خوا نەفرینی لێ کردوون و، دووری خستوونەتەوە لە ڕەحمەتی خۆی و، دەفەرموێ: پەیمانی من نایانگرێتەوە، کەواتە: چۆن دەبێ بگوترێ: ئەوانە ئەگەر خۆیان سەپاند، ڕەوایەتییان هەیە؟ وەك دوایی باسی دەکەین.

## بڕگەی دووەم: بناغەی ڕەوایەتیی حوکمڕانان پابەندییانە بە بەرنامەی خواوە:

ئایا ڕەوایەتیی حوکمڕانان لە کوێوە دێ؟ با سەرنجی ئەم چوار فەرموودەیە بدەین:

١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لو استعمل عَلَيْكُمْ عَبْدٌ يَقُودُكُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ، فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا} [١]

واتە: ئەگەر کۆیلەیەك بەسەرتانەوە کرا بە حوکمڕان، مادام بە کتێبی خوا، {بەپێی بەرنامەو شەریعەتی خوا} سەرکردایەتیی ئێوەی دەکرد، سەرپەرشتیی ئێوەی دەکرد، گوێی بۆ بگرنو فەرمانبەریی بۆ بکەن.

٢) لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ وُلاتِكُمْ شَيْئًا تَكْرَهُونَهُ، فَاكْرَهُوا عَمَلَهُ، ولا تَنْزِعُوا يَدًا مِن طَاعَةٍ} [٢]

---

١ ) أخرجه مسلم: ١٨٣٨.

٢ ) أخرجه مسلم: ١٨٥٥.

واتە: ئەگەر لە سەرپەرشتیارانتان، لە بەرپرسانتان شتێکتان بینی، پێتان ناخۆش بوو، ڕقتان لە کردەوەکەی بێ، بەڵام دەستبەرداری فەرمانبەریی بۆکردنی مەبن.

واتە: نابێ هەر شتێکت لە بەرپرسەکەت بەدڵ نەبوو، لێی هەڵگەڕێیەوە، مەبەست پێی ئەوەیە، ئەگەرنا بە تەئکید وەك لە فەرمایشتەکانی دیکەدا دەفەرموێ: لە سەرپێچییدا بە قسەی کەس ناکرێ، وەك لەم فەرمایشتەدا دیارە:

٣) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى المَرْءِ المُسْلِم، فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ}[١]

واتە: گوێ بۆ گرتن‌و بە قسە کردن، لەسەر مرۆڤی مسوڵمان فەرزە، لە شتێکدا کە حەزی پێ دەکاو، لە شتێکیشدا کە حەزی پێ ناکات، بە مەرجێك فەرمانی بە سەرپێچیی‌و بە ناشەرعیی پێ نەکرابێ، بەڵام ئەگەر فەرمانی پێکرا بە سەرپێچیی {خواو پێغەمبەری خوا}، ئەوە نە گوێ دەگرێ‌و، نە فەرمانبەرییش دەکات.

٤) هەروەها لە (صحيح البخاري) و (صحيح مسلم)دا هاتوە: {إنَّما الطَّاعَةُ في المَعروفِ}[٢]، واتە: فەرمانبەریی کردن تەنیا لە پەسندو چاکدایە.

کە ئەویش بەسەرهاتێکی هەیە، پوختەکەی ئەمەیە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشێك لە سوپایەك(سريّة) دەنێرێ، بەرپرسەکەیان لێیان تووڕە دەبێ، ناوی

١ ) أخرجه أحمد: ٦٢٧٨، والبخاري: ٦٧٢٥، ومسلم: ١٨٣٩.
٢ ) أخرجه أحمد: ٦٢٢، والبخاري: ٦٧٢٦، ومسلم: ١٨٤٠.

(عبدالله) دەبێ، پێیان دەڵێ: ئاگرێك بکەنەوە، ئەوانیش ئاگرێك دەکەنەوە، دوایی دەڵێ: ئایا من بەرپرس و ئەمیرتان نیم؟ دەڵێن: با، دەڵێ: بچنە نێو ئاگرەکە، ئەوانیش دڵ لەدڵ دەدەن بچن، نەچن! یەکێکیان دەڵێ: با نەچینە نێو ئەو ئاگرەوە، چونکە ئێمە لە ترسی ئاگر بەدوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم کەوتووین، چۆن بۆخۆمان بچینە نێوی؟! دوایی کە دەچنەوەو بۆ پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕنەوە، دەفەرموێ: (لَوْ دَخَلُوهَا مَا خَرَجُوا مِنْهَا أَبَدًا)، ئەگەر چووبانە نێو ئاگرەکە، هەرگیز لێی نەدەهاتنە دەرێ، واتە: چۆن لە دنیادا بەو ئاگرە سووتاون، لەدواڕۆژیشدا پێی دەسووتێندران، ئنجا دەفەرموێ: (إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ)، بەقسەکردن تەنیا لە سنووری پەسندو چاك دایە. کەواتە: هیچ بەرپرسێك بە قسەی ناکرێ، گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی بۆ ناکرێ لە شتی ناشەرعییو غەڵەتو پەڵەت دا، بەڵکو دەبێ دەستی بگیرێو یەخەی بگیرێو، ڕاست بکرێتەوە، وەك لەم فەرمایشتەدا دیارە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ}[1] واتە: چاکترین جیهاد، قسەیەکی دادگەرانەیە لەلای حوکمڕانێکی ستەمکار.



١) أخرجه أبو داود: ٧٧٨، وصححه الألباني.

## بڕگەی سێیەم: بەرپرس و حوکمڕانانی ستەمکار و لادەر سزای سەختیان هەیەو بەهەشتیان لێ قەدەغەیە:

ئایا بەرپرسان ئەگەر دڵسۆز نەبن، بۆ خەڵك‌و وڵاتیان، حوکمیان چییەو سزایان چۆنە؟ با تەماشا بکەین:

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً، يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ، وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ، إِلَّا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ}(١)

واتە: هیچ بەندەیەك، خوا (سبحانه وتعالى) کاری کۆمەڵە خەڵکێکی ناخاتە دەست، کاتێك کە دەمرێ، وا دەمرێ خیانەت‌و غەشی کردوە، لە خەڵکەکەی، ئەوە حەتمەن خوا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکا.

ئنجا بە تەماشا بکەین، دوو وەزیرەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): (ئەبوبەکر و عومەر) (خوا لێی ڕازی بێ)، چییان گوتوە لەو بارەوە.

أ- ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، کە هەڵدەبژێردرێ بە جێنشینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە وتاری یەکەمی دا، بەرنامەی حوکمڕانیی خۆی ڕوون دەکاتەوەو، لە نێو چەند قسەیەکی دا دەڵێ: {قَدْ وُلِّيتُ عَلَيْكُمْ وَلَسْتُ بِخَيْرِكُمْ، فَإِنْ أَحْسَنْتُ فَأَعِينُونِي، وإِنْ أَسَأْتُ فَقَوِّمُونِي}(٢).

---

١ ) أخرجه مسلم: ١٤٢.

٢ ) أخرجه ابن سعد في الطبقات الكبرى، ٣/١٨٣، وابن هشام في سيرته،ج٤، ص٣٩٣، ط١/ دار ابن الهيثم.

واتە: ئەوە من کراوم بە سەرپەرشتیار بەسەرتانەوە، بەڵام لە ئێوە چاکتر نیم، ئەگەر چاکەم کرد هاوکارم بن و، ئەگەر خراپەم کرد، ڕاستم بکەنەوە.

بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە چوار خەلیفەکانی فەرمووە خەلیفەکانی ڕاشیدەکان (الخلفاء الراشدين)، نەك وەك (عبدالملك)ی کوڕی (مەڕوان)، کە گوتبووی: هەر کەسێ پێم بڵێ: (اتّق الله) پارێز لەخوا بکە، سەری دەپەڕێنم. ئنجا ئایا ئەو جۆرە حوکمڕانییە چ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە هەیە؟!

ب- عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ) جێنشینی دووەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، گوتوویەتی: (أعينوني على نفسي- بالأمر بالمعروف والنهي عن المنكر).[1]

واتە: یارمەتییم بدەن لەدژی نەفسی خۆم، بەهۆی فەرمان بە پەسند کردنو ڕێگریی لە ناپەسند کردنەوە، لەگەڵم دا. یانی: یارمەتییم بدەن لە دژی نەفسی خۆم، واتە: هاوکارم بن و، فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەم لەگەڵدا بکەن! ئا ئەوە خەلیفەی ڕاشید و سەرڕاستە.



١) كنز العمال، ج٣، ص١٤٧.

## بڕگەی چوارەم: لەسەر خەڵك فەرزە لە بەرانبەر حوكمڕانی ستەمكاردا مل نەدەن:

١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوُا الظَّالِمَ، فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ، أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابٍ من عِندهِ}. [١]

واتە: هەر كات خەڵك (حوكمڕانی) ستەمكاریان بینی، دەستیان نەگرت، {لەستەم بیگێڕنەوە}، نیزیكە خوا لەلایەن خۆیەوە سزایەكی گشتییان بۆ بنێرێ، {بە خاسو خراپەوە، هەموویان پێكەوە سزا بدات}.

٢) هەر لەوبارەوە با ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بێنین، كە جاری دیكەش هێناومانە: {الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا: لِمَنْ يا رسول الله قَالَ: لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ}. [٢]

واتە: دینداریی دڵسۆزییە، بە تەنگەوە بوونو پەرۆشە، گوتیان: بۆ كێ ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)؟! فەرمووی: بۆ خواو، بۆ كتێبی خواو، بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و، بۆ پێشەواو بەرپرسانی مسوڵمانانو، بۆ مسوڵمانان بە گشتی.

---

١) أخرجه أبو داود: ٧٧٧، والترمذي: ٤٩٠، وصححه الألباني في الصحيحة.

٢) أخرجه أحمد: ١٦٩٨٢، ومسلم: ٥٥، وأبو داود: ٤٩٤٤.

٣) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَن اسْتَعْمَلَ رَجُلًا منْ عِصَابَةٍ وَفِيهم من هو أَرْضَى للهِ منْه، فَقَدْ خَانَ اللهَ ورَسُولَهُ والْمُؤْمنِين}. [(١)]

واتە: هەركەسێك پیاوێك لە كۆمەڵێكدا بكاتە بەرپرس، حوكمڕان، كە لەو باشتریان تێدا هەبێ، {كە زیاتر جێگای ڕەزامەندیی خوا بێ}، ئەوە ئەو كەسە خیانەتی كردوە لە خواو، لە پێغەمبەرەكەی و، لە بڕواداران.

ئنجا ئایا دەبێ لە بەرپرسانی ئەو وڵاتانەی ئێمە، چەندیان سەلامەت دەر بچن! كە هەر كامێكیان دێنێ خزمە گەندەڵەكەی خۆی، كوڕە گەندەڵەكەی، نەوە گەندەڵەكەی، یان ئەو كەسەی كە لە هۆزەكەیەتی، یام لە حزبە گەندەڵەكەی دایە، دەیكاتە بەرپرس بەسەر ملی مسوڵمانانەوە، كە لە مسوڵمانان دا هی وایە هەیە، پەنجەیەكی هەزاری وەك ئەو دێنێ، بەڵام لەبەرئەوەی بابای بوودەڵەی نزیكی، هاوكاریەتی بۆ زوڵمو گەندەڵیی و خراپە، دایدەنێ! بێگومان ئەوانە موخەننەتن بەرامبەر بە خواو، پێغەمبەری خواو، بڕواداران و، هەر كەسیش مل بۆ ئەو جۆرە كەسانە بدات، لە دنیا و قیامەت دا هەمان حوكمی وانی هەیەو، فەرموودەی خوا: ﴿ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾﴾الصافات. دەیانگرێتەوە، واتە: ئەوانەی ستەمیان كردوەو هاوشێوەكانیان (هاوكارانیان) و ئەوەی لەجیاتی خوا دەیانپەرست، وێكڕا كۆبكەنەوەو بەرەو ڕێی كڵپەی ئاگری دۆزەخ ڕێنماییان بكەن.

---

١) أخرجه الحاكم: ٧٠٢٣، هذا حديث صحيح الإسناد و لم يخرجاه، والمنذري في الترغيب والترهيب، ١٧٩/٣

## برگەی پێنجەم: زانایان لەسەر فەرمانبەریی كردن بۆ حوكمڕانانی ستەمكار و خۆسەپێن، یەكدەنگ نین:

وەك كۆتا قسەم لەو بارەوە، ویستم ئاماژەیەك بەوە بكەم كە لە وڵاتانی كەنداو و، لەو شوێنانەی كە حوكمی خۆسەپاندن و، بنەماڵەیی و میراتیی هەیەو، بەناوی ئیسلامەوە حوكم دەكەن، لە حاڵێكدا كە ئیسلام دژی حوكمی میراتیی و بنەماڵەییە، لەو وڵاتانە تەرویجی ئەو جۆرە حوكمڕانییە دەكەن، كە هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نیەو، ڕێك دژی قورئانە، بۆ نموونە: لە كتێبێكدا بەناوی (القيم الحضارية في السنن النبوية،)دا [1] هاتوە: (فَإِنَّ أَهْلَ العِلْمِ مُتَّفِقُونَ عَلَى طاعَةِ مِنْ تَغَلَّبَ عَلَيْهُمْ ، يَرَوْنَ نُفوذَ أَحْكامِهِ وَصِحَّةِ إمَامتِهِ، وَلَمْ يَخْتَلِفْ اثْنانِ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ فِي ذَلِكَ).

كە بە دڵنیایی ئەوە درۆیەكی گەورەیە، واتە: بێگومان زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە هەر كەسێك بەسەریاندا زاڵ بوو، دەبێ بڕیارەكانی جێ بەجێ بكرێن و، پێشەوایەتییەكەشی ڕاستە، دوو لە زانایان لەسەر ئەوە ناكۆكییان نەبووە.

دەڵێم: (سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ). كە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەك دەنگ بن، بڵێن: هەر كەسێك خۆی بەسەردا فەرزكردن و خستنیە ژێر ڕكێفی خۆیەوە، نیری خۆی خستە سەر شانیان، دەبێ بە قسەی بكەن! ئەوە درۆیەكی زۆر گەورەیەو، نە خوا وای فەرمووەو، نە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای

---

[1] ) ص ٦١٢.

فەرمووە، بەڵکو قسەیەکی پووچەو، ماڵی قەڵبەو سەر بە خاوەنیەتی و، لە ڕاستییدا ئەو جۆرە بیرۆکانە تەنیا بریتین لە ڕەواج پێدانی حوکمی میراتییو بنەماڵەیی، کە مسوڵمانانیان بەم حاڵو باڵە گەیاندوە، هەر لە سەردەمی ئومەوییەکانەوە تاکو ئەم ڕۆژگارە، مسوڵمانان چارەنووسیان بەدەست کەسانێکەوەیە، کە خۆیان دەسەپێنن و، حوکمی بنەماڵەیی و، میراتیی لەنێو مسوڵماناندا پیادە دەکەن، لە حاڵێکدا کە خوا فەرموویەتی: حوکم لە ئیسلامدا دەبێ بەڕاوێژ بێ و، دەبێ ڕای خەڵك بناغەو سەنگی مەحەك بێ، پاش پابەندیی بە قورئانو سوننەتو شەریعەتەوە، کە بێگومان لە ئەنجامی پابەندییشدا بە شەریعەتەوە: دادگەریی بەرقەرار دەبێ و، ڕێ لە ستەمکاریی و قۆرخکاریی و گەندەڵیی دەبەسترێ.

ئاڵقەی بیست و نۆیەم:

# ڕەوشت و ئەدەبەکانی مامەڵەی نێوان پیاوان و ئافرەتان

بەڕێزان!
لەبەر ڕۆشنایی چەند چەند ئایەتێکی قورئان و چەند دەقێکی سوننەت دا، کە لە هەشت (٨) خاڵدا دەیانهێنین, لە بواری چۆنیەتی مامەڵە پێکەوەکردنی پیاوان و ئافرەتانەوە، لە چوارچێوەی فراوانی کۆمەڵگادا، کۆمەڵێك ئەدەبو ڕەوشت، کە بەلامانەوە گرنگترن و، پێویستترن، دەخەینە ڕوو، ئەگەرنا مەوسووعەیەکی گەورەم داناوە لەو بارەوە، بەناوی: "ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەت دا".

١) با لەم دوو ئایەتە موبارەكەوە، دەست پێ بكەین، لە سوورەتی (النـور)-٣٠، ٣١-دا، خوا دەفەرمویّ:

﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ .

پێشتریش ئەم دوو ئایەتە موبارەكەمان هەر هێناون، بەڵام لێرەش هەوا بە كورتیی واتایان دەكەین، -واتە: شوێنی مەبەستیان بۆ ئێمە لێرەدا-.

خوا (سبحانه وتعالى) بە پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویّ: بە پیاوانی بڕوادار بفەرموو: لە نیگای چاوەكانیان بگرنەوە، نافەرمویّ چاویان دابخەن، (يُغمِضوا أبصارَهم)، دەفەرمویّ: ﴿يَغُضُّوا ﴾، (غَضَّ) یانی: (نَقَصَ)، بەڵام ئەگەر فەرمووبای: (يُغمضوا أعينهم) ئەوە شتێكی نەگونجاو و ناواقیعیی دەبوو، ئنجا: ﴿يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ﴾، لە نیگای چاوەكانیان بگرنەوە، واتە:

بەمەبەستەوە تەماشاى ئافرەتان نەكەنو، سەرنجیان نەدەن، بەڵام ئەگەر چاویان تێهەڵەنگوتن، ئەوە حوكمى جیایە، وەك دوایى باسى دەكەین.

﴿وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْ﴾، هەروەها پێشیان بڵێ با دامێنى خۆیان بپارێزن، پێشى دەفەرموێ: لە نیگاى چاویان بگرنەوە، دوایى دەفەرموێ: داوێنیان بپارێزن، چونكە لە ڕاستییدا بەهۆى نەزەرو ڕوانینى حەرامەوە، مرۆڤ پەلكێش دەبێ بۆ گوناهى گەورەتریش، كە زینایە.

﴿ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾، ئا ئەوە بۆ ئەوان پاكو چاكترەو، خواش شارەزاى ئەوەیە، كە دەیكەن.

ئنجا وەك چۆن پیاوان دەبێ لە نیگاى چاوى خۆیان بگرنو، داوێنى خۆیان بپارێزن لەبەرامبەر ئافرەتاندا، ئافرەتانیش بەهەمان شێوە: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾، هەروەها بە ئافرەتانى بڕواداریش بڵێ: با لە نیگاى چاوەكانیان بگرنەوەو، داوێنى خۆشیان بپارێزن.

﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، هەروەها با جوانیى خۆیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەى دەردەكەوێ، واتە: بە ناچاریى دەردەكەوێ، كە زۆربەى هەرە زۆرى ڕوونكەرەوان(مفسرين) و فەرموودەناسان (محدثين) و شەرعزانان(فقهاء) دەڵێن: ﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾: دەمو چاو و هەردووك دەستە، وەك لە فەرمایشتى پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) دیاریى كردوە, (القرطبي) دەڵێ: (أي ما يظهر عادة وعبادة)[1]، ئەوەى كە بە عادەت دەردەكەوێو لە

١ ) الجامع لأحكام القرآن، ج٦ ص١٥٢.

عیبادەتیشدا، ئاشکراشە: لە عیبادەتدا لەکاتی ئەنجامدانی نوێژدا، ئافرەت دەبێ ڕوو(دەم‌و چاو)و هەردووك لەپە دەستیشی دیار بن.

کەواتە: بە عادەتیش دەم‌و چاو و دەست، دروستە دیار بن، بۆ مامەڵەی ئافرەت لەگەڵ دەوروبەری دا.

﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾، با سەرپۆشەکانیان بەسەر سینگ‌و بەرۆکیاندا بدەن. ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ﴾، با جوانیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر بۆ مێردەکانیان، یان بابیان، ...هتد، واتە: مێردیان و مەحرەمەکانیان و ئافرەتان، قەیناکات ئەگەر جوانییانیان بۆ دەربخەن.

٢) هەر لەوبارەوە کە دەبێ ئافرەتان چۆن مامەڵە بکەن لەگەڵ پیاوان و، پیاوان چۆن مامەڵە بکەن لەگەڵ ئافرەتاندا؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خوای کارزان ئاوا فەرمانی پێ دەکا: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾﴾ .

واتە: ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم) بە هاوسەرەکانت بفەرموو، هەروەها بە کچەکانت، هەروەها بە ئافرەتانی بڕواداران، کە جیلبابەکانیان[1] لەخۆیانەوە بپێچن، لەخۆیان نزیکی بخەنەوە، ئا ئەوە نزیکترە بۆ ئەوەی بناسرێن، {بناسرێن

١ ) (جلابيب): کۆی (جِلباب)ە، واتە: ئەو پۆشاکەی لەسەر جل‌و بەرگ بەخۆدا دەدرێ، عەبایەکانیان، دەسماڵەکانیان، کۆڵوانەکانیان، چارشێوەکانیان.
الجلابيب: القُمُص والخُمر، الواحد: جلباب. مفردات ألفاظ القرآن، ص١٩٩.

بەچی؟! نەك بە شەخسیی، بەڵكو بە نەوعیی، بناسرێن كە ئەو ئافرەتە كە ئافرەتێكی پۆشتەو پەرداخە، ئافرەتێكی بە حەیاو حورمەتە، نەك بە شەخسیی بناسرێ كە كێیە؟، چونكە بەهۆی پۆشاكەوە ئافرەت وەك جۆر(نوع) دەناسرێ، كە ئافرەتێكی بە حەیاو حورمەتە، ئەگەرنا بەهۆی بێ پۆشاكییەوە، ئافرەت وەك شەخس دەناسرێ، دەبێ وریا بین!}.

بێگومان ئافرەت ئەگەر پۆشتەو بە حەیاو حورمەت بوو، دەناسرێ چۆنەو، خەڵك تەماعی تێ ناكات، ﴿فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾، ئەو كاتەش ئازار نادرێن، توانجو پلاریان تێ ناگیرێ، تەماعیان تێناكرێ.

﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، بەدڵنیایی خوا لێبوردەی میهرەبانە.

ئنجا ئەمەی خوا فەرموویەتی، تۆ تەماشابكە! ئەو ئافرەتەی بەرگێك لەبەر دەكا، كە: (أ) یان لەبەر تەنكیی، گۆشتی دەردەخات، (ب)یاخود هەموو جەستەی دانەپۆشیوە، (ج)یاخود لەبەر تەسكیی‌و تەنگیی ئەندامەكانی دەجەستێنی.

ئەو ئافرەتە بەو جۆرە پۆشاكەی، لە ڕاستییدا بە زمانی حاڵ بە خەڵكی دەڵێ: تەماشام بكەن، ئەگەرنا بۆچی وا دەكا! بۆیە وا دەكا، دەڵێ: تەماشام بكەن، فلان ئەندامەم چۆنە! سەرنجم بدەن بزانن چۆنم! وەك گۆشتی قەسابی خۆی خستۆتە گۆڕێ! بە تەئكید ئەوە توانجو پلاری تێ دەگیرێ و، ئازار دەدرێ، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ، لەپێش ئەواندا بە هاوسەرەكانت‌و كچەكانت و ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: خۆیان داپۆشن، ئەوە نزیكترە بۆ ئەوەی بناسرێن‌و تەماعیان تێ نەكرێ‌و ئازار نەدرێن.

٣) هەر لەوبارەوە با ئەم فەرمایشتەش بێنین، کە پێشتریش هێناومانە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك (ئەسمائی کچی ئەبووبەکری سددیق)ی (خوا لەخۆیو بابی ڕازی بی) بینی، پۆشاکێکی لەبەردا بوو، تەنك بوو، فەرمووی: {يَا أَسْمَاءُ! إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتْ الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ لَهَا أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلَّا هَذَا وَهَذَا وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ} [1]

واتە: ئەی ئەسماء! ئافرەت هەرکاتێ باڵغ بوو، ناگونجێ لێی ببینرێ، جگە لە ئێرەی و ئێرەی، ئاماژەی کرد بۆ دەموچاوی و بۆ هەردوو لەپە دەستی.

تەنیا دەبێ دەمو چاوی ببینرێو هەردوو لەپی دەستی و، ئەندامەکانی دیکەی دەبێ داپۆشرێن لە ئاست پیاوان دا.

٤) هەواڵدان بەوە، کە ئافرەتانێك پەیدا دەبن، پۆشاکێك دەپۆشن، نە وایە ڕووت بن، نە وایە پۆشتە بن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك هەواڵدانێك بەنادیار (إخبار بالغيب)، فەرمایشتێکی هەیە لەو بارەوە، دەفەرموێ: {صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ. وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مَائِلَاتٌ مُمِيلَاتٌ، رُؤُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا}. [2]

واتە: دوو جۆرە خەڵك، لەوانەی کە شایستەن بچنە دۆزەخ، نەمدیتون، {یانی: جارێ نەهاتوون} ، کۆمەڵە پیاوێکن، قەمچییان پێن، وەك کلکە مانگا وان، پێیان لە خەڵك دەدەن، {مەبەست ئەو جەللادانەیە کە لە زیندانەکاندا

١ ) أخرجه أبو داود: ٧٣٤، وصححه الألباني.

٢) أخرجه أحمد: ٨٦٥٠، ومسلم: ٢١٢٨.

ئەشکەنجەی خەڵك دەدەن و، بەزۆر ئیعتیرافیان پیّ دەکەن و، وا دەکەن، دان بە شتێکدا بێنن، کە نەیانکردوە، کە لەو سجنانەی هەرێمی کوردستانی خۆماندا شتی وا زۆر بووە، هەروەها لە سجنەکانی سەردەمی ڕژێمی بەعسداو، ئێستاش زۆرجار ئەو شتانەی سەردەمی ڕژێم دووبارە کراونەوەو دووبارە دەکرێنەوە، هەروەها لە سجنی هەموو دیکتاتۆرو طاغووتو حوکمڕانە میراتییەکاندا، ئەوانە هەن} .

ئافرەتانێکیش پۆشتەن و ڕووتیشن، خۆشیان لارن و، خەڵکیش لار دەکەن، {لە ڕێی ڕاست لادەدەن} ، قژی سەریان وەك دوەنگی حوشتر وایە، بەرزکراوەتەوە، ناچنە بەهەشتیّ و، بۆنیشی ناکەن، هەرچەندە بۆنەکەشی ئەوەندەو ئەوەندە دەڕوات.

تەماشا بکەن! (نِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ) ئافرەتانێك پۆشتەشن و ڕووتیشن، ئەمە دوو واتایان هەڵدەگریّ:

یەکەم: یان بەشێکی جەستەیان پۆشتەیەو، بەشێکی ڕووتە، وەك ئەوانەی کە: دەست و لاق و سینگ و بەرۆك و سەرو قژو گەردن و زۆربەی جەستەیان بەدەرەوەیەو، هەندێکیشیان داپۆشیوە.

دووەم: یاخود یانی: خۆیان داپۆشیوە، بەڵام وەك ڕووت بن وایە، ئەوانەی کە بەرگی تەسك و تەنگ لەبەر دەکەن، کە ئەندامەکانیان دەجەستێنیّ، هەروەك ڕووت بیّ وایەو، قەبارەی ئەندامەکانی و چۆنیەتییەکەیان دیارە!

ئنجا ئەوانە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەیانەوە دەفەرمویّ: (مَائِلَاتٌ مُمِيلَاتٌ) خۆشیان لادەرن و، دەیانەویّ خەڵکیش لابدەن.

نابینن! لەو کەناڵانەی تەوژمی عەلمانیی دەستەڵات و بڕیاربەدەست دا، چ باسە! کە دەیانەویّ ئەو کۆمەڵگایەی ئێمە زیاتر دابڕووخێنن و، لەخواو

پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دووربخەنەوە، دەیانەوێ گەنجەكانمان زیاتر بە لاڕێدابەرن، بۆ وێنە: بەرنامەیەك لە بازاڕ و شەقام ساز دەكەن، یان لە ستۆدیۆ چەند كوڕ و كچێك پێكەوە دادەنیشێنن، ئنجا پرسیاریان لێ دەكەن: وەرە بزانم تا ئێستا چەند كچ، یان چەند كوڕت خۆشویستوون؟ چیت كردوە؟ چۆنت كردوە؟ بەڕاستی ئەوە زۆر بێ مانایە، ئەو كوڕو كچە گەنجانە، یان هەرزەكارو تازە پێگەیشتووانە، لەجیاتی ئەوەی علیمیان فێر بكرێ، زانستیان فێر بكرێ، ئەدەب و ڕەوشتیان فێر بكرێ، بە خواوە پەیوەست بكرێن، شارەزاو ڕۆشنبیر بكرێن: فێری ئەوە بكرێن چۆن غەریزەكانی خۆیان تێربكەن! كە تەنانەت باڵندەكانو ئاژەڵەكانیش دەزانن چۆن غەریزەكانی خۆیان تێر بكەن، ئەوە عیلم نیەو هونەر نیە خەڵكی فێر بكەی! خوای كارزان نێرو مێی وا خولقاندوون، بەرەو یەكدی پەلكێش دەكرێن و، ئەوە پێویستیی بە فێركردنو بەرنامە بۆ دانان نیە، ئەگەر مەبەستیان ئەوە نەبێ، سەری خەڵك بە قوڕێ دا بكەن و، ئامانج ئەوە نەبێ: كە خەڵك زیاتر بە لاڕێدا ببەن و، ڕەوشتی خەڵك زیاتر دابڕووخێنن و، لە خوایان دوور بخەنەوەو، وەك خۆیانیان لێ بكەن، چونكە ئەوانەی پیس و خراپن، پێیان خۆشە هەموو خەڵك پیس و خراپ بێ.

خوای پەروەردگار لەبارەی گەلی (لوط)ەوە دەفەرموێ، دەیانگوت: ﴿ أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴾ النمل: ٥٦، واتە: (لووط)و شوێنكەوتووەكانی لە ئاوەدانییەكەی خۆتان دەربكەن، ئەوانە كۆمەڵێكی خۆپاكڕاگرن، دەیانەوێ بەپاكیی بژین، بۆیە دەریان بكەن، لەگەڵ ئێمەدا ناگونجێن.

بەڵێ، زیناکەر پێی خۆشە هەموو کەس زیناکەر بێ و، دز پێی خۆشە هەموو کەس دز بێ، بۆ ئەوەی بۆخۆشی تێدا ون بێ.

ئنجا ئایا لێرەدا بەپرسیێتیی بەرپرسانی وڵات چییە؟! بێگومان ئەوەیە، کە وەك چۆن کوڕ و کچەکانی خۆیان دەپارێزن، ئاگایان لە کوڕو کچەکانی هاووڵاتییانیش بێت، ئا ئەوەیە وڵات بەڕێوەبردن و، دڵسۆزیی بۆ خەڵك، نەك ئەوە کە کوڕو کچی خۆت حەوت دەرگات لەسەر داخستوون، کوڕو کچی خەڵکیش دێنی دەیکەیە مەیموونو هەڵیدەپەڕێنی و، بە کەناڵە جۆراوجۆرەکانت، بە ئاشکراو پەنهانەوە، کە بەپارەی حەرامی بە گەندەڵیی و ستەم وەسەرێکنراو, کاریان پێدەکەی، ڕەوشتی ئەو خەڵکە دادەڕووخێنی و، لە ئیمان و دین دایاندەشۆرێنی! ئایا ئەوە دڵسۆزییە بۆ خەڵكو وڵات؟! ئەگەر ڕاست دەکەی، وەك چۆن کوڕو کچەکانی خۆت پێیان دەخوێنی، دەیانپارێزی لە عەیبداریی‌و لە شتی ناشیرین، ئەدی بۆچی کوڕو کچی خەڵکیش ناپارێزی، بۆچی منداڵی خەڵك دێنی بەم شێوەیە بەرهەڵدای وڵاتی دەکەی؟!

٥) ئنجا هەر لەبارەی چۆنیەتی پێکەوە مامەڵەکردنی ژنو پیاوانەوە، بەتایبەت لە بواری تێکەڵیی یەکدی کردن دا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لاَ يَخْلونَّ رَجُلٌ بِامْرَأةٍ إلاَّ وَمَعَها ذُو مَحْرَمٍ} [1].

واتە: با هیچ پیاوێك بەتەنیا لەگەڵ ئافرەتێك نەبێ، مەگەر لەگەڵ مەحرەمێکدا، واتە خزمێکی کە پێی نەشێ: (بابی، برای، مامی، خاڵی، کەسێك کە مەحرەم بێ).

---

١) أخرجه البخاري: ٥٢٣٣، ومسلم: ١٣٤١.

٦) هەر لەوبارەوە فەرمایشتێکی دیکەش هەیە: {إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَرَأَيْتَ الحَمْوَ؟ قَالَ: الحَمْوُ المَوْتُ}[1].

واتە: خۆتان بپارێزن لە وەژوور کەوتن لە ئافرەتان، {واتە: بەتەنیا}، پیاوێك لە پشتیوانەکان، گوتی: ئەدی خزمی مێرد، ئەی پێغەمبەری خوا؟! فەرمووی: خزمی مێرد خراپترە.

(الحَمْوُ: قريب الزوج) (حمو) نیزیك و خزمی مێردە، کە ئەوە مەترسیی تووشبوونی گوناهی زیاترە، بەحوکمی بێ پەردەیی و ناسیاویی و زۆر تێکەڵیی.

٧) لەبارەی بەرگ و پۆشاکی ئافرەتان و پیاوانەوە، کە دەبێ چۆن بێ؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) المُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ}[2].

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەعنەتی کردوە، لەو پیاوانەی کە خۆیان وەك ژنان لێ دەکەن و، لەعنەتیشی کردوە لەو ژنانەی کە خۆیان وەك پیاوان لێ دەکەن.

واتە: لە هەڵسوکەوتیاندا، لە بەرگ و پۆشاك لەبەرکردنیاندا، لە هەموو ئەو شتانەدا، کە تایبەتمەندیی پیاوان و تایبەتمەندیی ژنانن.

ئنجا پیاوان و ئافرەتان دەبێ زۆر لێك وریا بن و، بەهۆی یەکدییەوە تووشی گوناه نەبن، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (مَا تَرَكْتُ بَعْدِي

---

١ ) أخرجه البخاري: ٥٢٣٢، مسلم: ٢١٧٢.

٢ ) أخرجه البخاري: ٥٨٨٥.

فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنْ النِّسَاءِ)[١] واتە: لەدوای خۆم هیچ بەڵایەك، یان هیچ تاقیكردنەوەیەكم بەجێ نەهێشتوە بۆ پیاوان، بەزەرڕتر بێ لە ئافرەتان.

یانی: پیاوان ئەگەر لە خۆیان وریا نەبن، بەهۆی ئافرەتانەوە، تووشی زیانباریی دەبن، تووشی لادان و خلیسكان بەرەو تاوان دەبن، هەروەها لە فەرموودەی دیكەدا هاتوە كە: بەهەمان شێوە ئافرەتانیش بەهۆی پیاوانەوە تووشی تاوان و خراپە دەبن، كەواتە دەبێ هەردووك لایان لە یەكدی وریا بن و، بە ئەدەبە شەرعییەكانو لە سنوورەكانی شەرعدا، پێكەوە مامەڵە بكەن.

٨) كۆتا دەق كە لەو بارەوە دەیهێنین، ئەوەیە كە ئافرەتان بۆیان هەیە لە هەموو كایە كۆمەڵایەتییو سیاسییەكاندا بەشدار بن، بەڵام بە ڕەوشتی بەرز و ئەدەبو حورمەتەوە، بە پۆشتەو پەرداخییەوە، بەشێوەیەك كە وەك مرۆڤ بێنە بەرچاو، نەك وەك مێیینەیەك، لەوبارەوەش ئەو دەقە دێنین:

{عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ نُخْرِجَهُنَّ فِي الْفِطْرِ وَالأَضْحَى: الْعَوَاتِقَ وَالْحُيَّضَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ، فَأَمَّا الْحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلاةَ وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِحْدَانَا لا يَكُونُ لَهَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ : لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا} [٢].

(أُمِّ عَطِيَّةَ) ئافرەتێكی هاوەڵە (خوا لێی ڕازی بێ) و، مەدینەییە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێكردین، كە لەڕۆژانی جەژنی ڕەمەزانو جەژنی قورباندا، كچان و ئافرەتانی كە لە بێ نوێژییشدان، {لە (حیض) دان} و، ئافرەتانی پشتی پەردەش، ببەینە دەرێ، ئنجا ئافرەتانێ كە بێ نوێژن، با ئەوان

---

١ ) أخرجه أحمد: ٢١٨٧٨، والبخاري: ٤٨٠٨، ومسلم: ٢٧٤٠.

٢ ) أخرجه مسلم: ٢٠٩٣.

نوێژ نەکەن، بەڵام با خێرو چاکەو بانگەوازی مسوڵمانان ببینن، (أم عطیة) دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) ئەدی لەکاتێکدا یەکێك لە ئێمە پۆشاکێك(جلباب)ی نابێ بەخۆیدا بدات؟ فەرمووی: با هاوەڵەکەی، یەکێك لە دەستە خوشکەکانی بیخاتە ژێر پۆشاك(جلباب)ەکەی خۆیەوەو، پێکەوە بڕۆن و، با بە پۆشاکەکەی خۆی، ئەویش داپۆشێ.

هەڵبەتە مەبەستی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەو فەرمایشت و فەرمانەی ئاشکرایە، بریتیە لە ڕاهێنانی ئافرەتان بە ورد و درشتەوە، لەسەر خواپەرستیی و ئەنجامدانی دروشمەکان و چوونەدەر و، چاوکرانەوەو شارەزابوون بە کۆمەڵگاو دەوروبەر و، خێر و شەڕی نێو خەڵك، تاکو دوایی بتوانن لە هەموو بوارەکانی ژیان و گوزەران و کایەکانی دین و ژیندا، ڕۆڵی خۆیان بگێڕن.

بەڕێزان!

ئایا دەبێ مسوڵمانان چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، لەگەڵ نامسوڵماناندا بکەن؟ بەهەموو شێوەکانیانەوە:
١- چ خاوەن کتێب بن، وەك: (جوولەکەو نەسڕانییەکان) و، (مەجووسییو سابیئییەکان)یش کە بەشێك لە زانایان بە خاوەن کتێبیان داناون، ٢- چ بتپەرست بن، ٣-چ مولحید بن، ٤-چ هەڵگەڕانەوە بن، ٥-چ مونافیق بن، ٦-چ کەسانێك بن، کە بانگەوازی خوایان پێ نەگەیشتوەو، بە (أهل الفترة) لە قەڵەم دەدرێن، کە ئەوانەش کەم نین و، ئەمڕۆ لەنێو مرۆڤایەتییدا کەسانێکی زۆر هەن: یان پەیامو بانگەوازی ئیسلامیان پێ نەگەیشتوە، یان بە هەڵگەڕاوەیی و، بە شێوێندراویی پێیان گەیشتوە، کە هەروەك پێنەگەیشتن وایە، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا، دەبێ مسوڵمانان چۆن مامەڵە بکەن؟

لەم ئاڵقەی سییەم و کۆتاییدا، باسی ئەو بابەتە دەکەین، ئەویش لەبەر تیشکی[1] چەند ئایەتێکی قورئانی بەپیزی خوای بەخشەر و، چەند دەقێکی ڕێبازی پێغەمبەری سەروەردا:

---

١) لە کتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا، بە ناوونیشانی: (نامسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیدا)، بەدرێژیی لەو بارەوە دواوین.

١) خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الممتحنة)دا، وەك بنچینەیەکی گشتی فێرمان دەکا، دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ الممتحنة: ٨، واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات، کەسانێك کە لەسەر دینتان لەدژتان نەجەنگاون و، لەماڵ و حاڵی خۆتان وەدەریان نەناون، لەگەڵیان چاکەکاربن و، هاوکارو بەخشەر بن، بەدڵنیایی خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن.

لێرەدا مەبەست لە (وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ) واتە: (تعطوهم قسطاً من أموالكم)، وەك لە هەندێك لە کتێبەکانی خۆمدا باسم کردوە:[١] (أقسط إليه) واتە: (أعطاه قسطاً من ماله)، واتە: بەشێك لە ماڵ و سامانی خۆی پێدا، واتە: (وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ) لێرەدا مەبەست پێی دادگەریی کردن نیە، چونکە دادگەریی لە هەموو حاڵاندا فەرزە، مامەڵەی پێ بکرێ لەگەڵ نامسوڵماناندا، بەڵام چاکەکاریی و بەخشندەیی و پێ بەخشین، مەرج نیە هەمیشە پێویست بێ.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەو نامسوڵمانانەی کە دژی دینتان نین و، دژی ژینتان نین، خوا لێتان قەدەغە ناکات، کە لەگەڵیاندا چاکەکار بن، {لە ڕووی مەعنەوییەوە} و، بەخشندەو بەخشەر بن لەڕووی ماددییەوە، بەدڵنیایی خوا ئەوانەی خۆش دەوێن، کە ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن، با بە نامسوڵمانانیش بێ.

---

١) بڕوانە: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) چاپی شەشەم/ ٢٠١٨ز.

٢) لە سوورەتی (البقرة)-٨٣-دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ﴾.

واتە: كام قسەیە چاكە، ئەوە بە خەڵك بڵێن، یانی: با هەم شێوازەكەی و هەم نێوەڕۆكەكەی، باشترین بێت.

چونكە مسوڵمان تەنیا قسەی باشی لێ دەوەشێتەوە.

٣) هەر لە سوورەتی (البقرة) -١٩٥-دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥ ﴾.

واتە: چاكەكاریی بكەن، بەدڵنیاییی خوا چاكەكارانی خۆش دەوێن.

ئنجا ئایا لەگەڵ كێدا چاكە بكەن؟ خوا بە ڕەهایی فەرموویەتی و دیاریی نەكردوە لەگەڵ كێدا چاكە بكەن، كەواتە: دەبێ مسوڵمانان بەگشتی و لەگەڵ هەموو كەسدا، لەگەڵ خەڵكدا بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە چاكەكار بن.

٤) لە سوورەتی (المائدة)-٨-شدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ٨ ﴾.

واتە: با ڕق هەڵسانتان لە كۆمەڵێك {لە نامسوڵمانان} واتان لێ نەكات: نا دادگەربن، دادگەربن ئەوە لە پارێزكارییەوە نزیكترە، بێگومان خواش شارەزای ئەوەیە كە دەیكەن.

بەڵێ، دادگەربوون لە هەموو حاڵاندا لەسەر مسوڵمانان فەرزەو، دەبێ بیكەنە بناغەی مامەڵەیان لەگەڵ نامسوڵماناندا، ئاشكرایە ئەگەر نامسوڵمانان شەڕ بە

مسوڵمانان بفرۆشن، دژی دینیان بن، دژی ژینیان بن، ئەوكاتە مسوڵمانان مولزەم نین چاكەیان لەگەڵ بكەن، چونكە كەس لە شەڕی شەكری نەبەخشیوەتەوە، بەڵام لەبواری مامەڵەدا، دەبێ مسوڵمانان هەوڵبدەن هیچ كەس لەوان چاكتر نەبێ، بەڵام بە نسبەت دادگەرییەوە لە حاڵەتی جەنگدا بن، یان لە حاڵەتی مامەڵەدا، لە هەموو حاڵاندا: دادگەربوونی مسوڵمانان فەرزە لەگەڵ نامسوڵماناندا، بێگومان لەنێوخۆشیاندا.

ئنجا با سەرنجی چەند دەقێكی سوننەت بدەین:

٥) سەرەتا با تەماشای ئەو دەقە بكەین، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كاتێك پەیمان دەبەستێ لەگەڵ نەسرانییەكانی (نەجران)دا، لەدرێژەی چەند فەرمایشتێكی دا دەفەرموێ: {لأَنِّي أَعْطَيْتُهُمْ عَهْدَ اللَّهِ عَلَى اَنْ لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ، وَعَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا عَلَيْهِمْ بِالْعَهْدِ اَلَّذِي اسْتَوْجَبُوا حَقَّ اَلذِّمامِ والذَّبِّ عَنْ الحُرْمَةِ، وَاسْتَوْجَبُوا أَنْ يَذُبَّ عَنْهُمْ كُلَّ مَكْروه حَتَّى يَكونَ لِلْمُسْلِمِينَ شُرَكاءَ فِيَما لَهُمْ وَفِيَما عَلَيْهِمْ} [١]

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: چونكە من بەڵێنی خوام پێداون، {واتە: بە نەسرانییەكانی (نەجران)}، كە هەمان ماف كە مسوڵمانان هەیانە، ئەوانیش هەیان بێ و، هەمان ئەرك كە لەسەر مسوڵمانانە، لەسەر ئەوانیشە، هەروەها هەمان ئەرك كە ئەوان لەسەریانە، لەسەر مسوڵمانانیشە، بەپێی ئەو پەیمانەی كە ئەوان كردوویانەتە مافی خۆیان كە بەڵێنیان لەگەڵ ببرێتە سەر و، بەرگریی بكرێ لە حەیاو حورمەتیان، {یاخود: بەرگریی بكرێ لەو شتانەیان كە

---

١) (محمد حميد الله، مجموعة الوثائق للعهد النبوي للخلافة الراشدة، ص ١٨٨، ط٨، الوثيقة ٩٧، نسختان لمكتوب النبـي إلى نجران).

تایبەتمەندیی ئەوانن} ، هەروەها بەپێی ئەو پەیمانە کردوویانە بە مافی خۆیان و لەسەر مسوڵمانانیان پێویست کردوە، کە هەموو خراپەیەکیان لێ بگێڕدرێتەوە، تاکو وەك مسوڵمانان هاوبەش دەبن، لەوەدا کە هەیانەو، لەوەشدا کە لەسەریانە.

واتە: لە مافەکانو لە ئەرکەکاندا، وەك مسوڵمانان یەکسان دەبن.

٦) ئنجا با دەقێکی دیکەش بێنینەوە هەر لە سوننەتدا، کە ئەمیان قسەی (عەلی کوڕی ئەبی تالیبە) (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: (إِنَّمَا قَبِلُوا عَقْدَ الذِّمَّةِ لِتَكُونَ أَمْوالُهُمْ كَأَمْوالِنا وَدِماؤُهُمْ كَدِمائِنا)[1].

واتە: خاوەن کتێبەکان بۆیە قبووڵیان کردوە هاوپەیمان بن لەگەڵ مسوڵماناندا، تاکو ماڵو سامانیان وەك ماڵو سامانی ئێمە بێ و، خوێنیشیان وەك خوێنی ئێمە بێ.

٧) ئنجا بە تەماشای نوێنەری سوپای ئیسلام بکەین، لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب دا (خۆا لێی ڕازی بێ)، (ریبعی کوڕی عامیر) کە دەچێت لەگەڵ ڕۆستەم فەرماندەی سوپای فارس دا ڕووبەڕوو دەبێتەوەو، لێی دەپرسێ: بۆچی هاتوون؟ ئەویش ئاوا وەڵامی دەداتەوە:

(نَحْنُ قَوْمَ ابْتَعَثَنا اللَّهُ لِنَخْرُجَ مِنْ شَاءَ مِنْ عِبادَةِ العِبادِ إِلَى عِبادَةِ اللَّهِ، وَمَن جَوْرِ الأَدْيانِ إِلَى عَدْلِ الإِسْلامِ، وَمِن ضِيِّقِ الدُّنْيا إِلَى سَعَةِ الدُّنْيا والْآخِرَةِ).[2]

---

١ ) (بدائع الصنائع، للكاساني، ج٧، ص ١١١) و(السير الكبير للشيباني، ج٣، ص٢٥٠).

٢ ) (تأريخ الأمم والملوك، الطبري، ج٢، ص١٠٦-١٠٧)، و(البداية والنهاية، لابن كثير، ج٧، ص٤٩-٥٠) و (الكامل في التأريخ، لابن الأثير، ج٢، ص ٦٣-٦٤).

واتە: ئێمە کۆمەڵێکین خوا ناردووینی، ڕەخساندووینی، تاکو هەر کەسێك کە خوا بیەوێ: لە کۆیلایەتیی بۆ بەندەکان دەربازی بکەین، بۆ بەندایەتیی بۆ خواو، لە ستەمی ڕێچکەکان دەربازی بکەین، بۆ دادگەریی ئیسلام و، لە تەسکیی‌و تەنگیی دنیا بیهێنینە دەرێ، بۆ فراوانیی دنیاو دوارۆژ.

٨) ئنجا لە (مجموعة الوثائق)دا، لەو پەیمانەی کە پێی دەگوترێ: (الوثيقة)، یان (الصحيفة)، کە بە سەرژمێرێك: لە (٤٧) بڕگەو، بە یەکێکی دیکە: لە (٥٢) بڕگە (بەگوێرەی درێژیی و کورتیی بڕگەکان)، پێکهاتوە، لە بڕگەیەکیاندا دەڵێ: (لِلْيَهُودِ دِينُهُمْ وَلِلْمُسْلِمِينَ دِينَهُمْ ، مُوَالِيهُمْ وَأَنْفَسُهُمْ إِلَّا مِنْ ظُلِمٍ وَأَثِمَ فَإِنَّهُ لَا يوْتَغُ إِلَّا نَفْسَهُ وَأَهْلَ بَيْتِهِ).[1]

واتە: جولەکەکان دینی خۆیان بەڕێوە دەبەن و، مسوڵمانانیش دینی خۆیان بەڕێوە دەبەن، ئەوانەی لەگەڵیانن‌و خۆشیان، مەگەر کەسێك ستەم بکات و، گوناه بکات، ئەوە هەر خۆی‌و نیزیکەکانی زیانبار دەکات و دەفەوتێنێ.

٩) لە بڕگەیەکی دیکەدا کە بڕگەی (٤٥)ە، دەڵێ: (وَأَنَّ عَلَى اليَهُودِ نَفَقَتَهُمْ وَعَلَى الْمُسْلِمِينَ نَفَقَتَهُمْ، وَأَنَّ بَيْنَهُمْ النَّصْرُ عَلَى مِنْ حارَبَ أَهْلَ هَذِهِ الوَثِيقَةِ ، وَأَنَّ بَيْنَهُمْ النُّصْحَ والنَّصيحَةَ والْبِرَّ دُونَ الإِثْمِ).[2]

واتە: جوولەکەکان مەسرەف کێشانی خۆیانیان لەسەرەو، مسوڵمانانیش مەسرەف کێشانی خۆیانیان لەسەرەو، پێویستە هەموو ئەوانەی کە ئەم وەثیقەیان ئیمزا کردوە، یەکدەست بن لە دژی هەر کەسێك کە جەنگ لەدژی

---

١ ) مجموعة الوثائق:٤٤.

٢ ) مجموعة الوثائق:٤٥.

ئیمزاکەرەکانی ئەم پەیماننامەیەدا دەکات و، پێویستە پێکەوە دڵسۆز بن و، پێکەوە چاکەکار بن و، خۆیان لە گوناه لەگەڵ یەکدیدا بپارێزن.

کەواتە: بەکورتیی مامەڵەی مسوڵمانان لەگەڵ نامسوڵمانان دا، ئەوەیە کە وەك مسوڵمانان مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەن، لە هەموو ئەرك‌و مافەکانیاندا جگە لە تایبەتمەندییە دینییەکانیان.

دیارە ئەم بابەتەش بابەتێکی فراوانەو، من بەرگی چوارەمی مەوسووعەی: (ئیسلام‌و دەوڵەتداریی) بەناوی: "نامسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی دا"م بۆ تەرخان کردوەو، لەوێ بە تەفصیل باسمان کردوە.

لێرەش کۆتایی بە توێژینەوەکەمان لەبارەی: {ڕەوشت و ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان}ەوە دێنین و، شتێکی ئاشکرایە -وەك چەند جارێك دووبارەمان کردۆتەوە- کە هەرکام لەو ڕەوشت و ئەدەبە بەرز و پەسندانەی بواری هەڵس و کەوت و ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان، ئەگەر بویسترێ مافی تەواوی پێ بدرێ، حەوجێی شوێنێکی تەرخانکراوە، بەڵام ئێمە هەوڵمان داوە هێڵە گشتییەکان و بنەما سەرەکییەکانی، ئەو ڕەوشت و ئەدەبانە بخەینە ڕوو.

٢٩/ جمادي الأولى ١٤٤١ك

٢٠٢٠/١/٢٤ز

هەولێر

# کورتەیەک لە مێژووی ژیانی مامۆستا عەلی باپیر



- ناو: عــەلی بــاپیر وەتمان.
لەدایکبــووی: ســـاڵی (١٩٦١ز)، لەقەزای پشــدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.
- زانیــارییە ئیســلامییەکانی لە پەیمانگــای ئیســلامیی (ڕانــیە و سـلێمانیی) و لــەلای زانایــانی کوردســتانی عێــراق و کوردســتانی ئێــران بەدەســتهێناون، لەســاڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپیٚزی لەبەر کردوە.
- لەساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوەو ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.
- لەساڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و...هتد.
- لەساڵی (١٩٨٧ز) دا پاش ساڵانێك لە خەباتی ئاشکراو نهێنیی پەیوەست لەگەڵ {بــزووتنەوەی پەیوەنــدیی ئیســلامیی}دا، چــۆتە چیــا و دەســتی بەخەبــاتی چەکــداریی کــردوە لە چوارچێــوەی بــزووتنەوەی ئیســلامیی دا، کە لەچەنــد ناوچەیەکی کوردستاندا بنکەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعس و، هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.

- لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.
- لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١ز) داو وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەست و ئامانجەکانی ڕاپەڕینی جەماوەریی و ناساندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی دا.
- تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوەو، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیەنراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.
- لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوەو، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)ی لە دوازدە کتێب و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسی و، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بووە.
- تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) بەرهەمی هەیە لە: مەوسووعەو کتێبو نامیلکە، لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی‌و عەقیدەو فیقهو حوکمو سیاسەتو تەزکیەی نەفسو ئەخلاقو، بەرپەرچدانەوەی بیرو ڕێچکە نامۆیەکانو...هتد)دا.
- لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.
- کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەسالانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز)داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.
- ئێستا پرۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردوەو، تا ئێستا چەند بەرگێکی لێ چاپو بلاوکراوەتەوە.

بۆ زانینی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:

www.alibapir.net

# بەرهەمەكانی دانەر

| ژ | كتێبەكان | بەرواروچاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | أ / كتێبە كوردییەكان | | |
| | قورئانو سونەت | | |
| 1 | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر رۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| 2 | با لە خزمەت قورئاندا بین، {كۆی هەردووك كتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| 3 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەكەم: سوورەتەكانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| 4 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| 5 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| 6 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چـاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| 7 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بـەپێز، بەرگی پێنجەم: سـوورەتی: (الأنعـام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 8 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بـــەرگی شەشـــەم : ســـوورەتی: (الأعـــراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| 9 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| 10 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| 11 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بەرگی نـۆیـەم: سـوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| 12 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بەرگی دەیـەم: سـوورەتی: (هود) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| 13 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بـــەرگی یـازدەیـــەم: ســـوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| 14 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بـــەرگی دوازدەیـەم: ســوورەتەکانی: (الرعد، إبراهیم، الحجر) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| 15 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بەرگی: (١٣) سوورەتی: (النحل) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| 16 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بەرگی: (١٤) سوورەتی: (الإسراء) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| 17 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێـز، بەرگی: (١٥) سوورەتەکانی: (الکهف) و (مریم) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 18 | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 19 | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | **بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی** | | |
| 20 | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| 21 | ڕێبازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامل: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |
| 22 | پرۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامییانە | چاپی یەك/١٩٩٥ | دواتر خرایە نێو کتێبی: (پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی) |
| 23 | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| 24 | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی چوار/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| 25 | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش/٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیی و تورکیی و فارسییش |
| 26 | خواناسیی، ئایین، ئیمان (درەوشاوەیی ئیسلام و پووچەڵیی ئیلحاد) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی سێ/٢٠٢٠ | |
| 27 | ناوە هەرەجوانەکانی خوا "سبحانە وتعالى" | چاپی یەك /٢٠١٣ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **مەوسووعەی : ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ)** | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| 28 | بەرگی یەکەم: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| 29 | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| 30 | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەتو لەپەرستراوێتییدا | | |
| 31 | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| 32 | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | |
| 33 | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| 34 | مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |
| 35 | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئالقە لە هەفتەنامەی (هاوڵاتی)و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئالقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| 36 | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢ چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| 37 | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طەحاویی | چاپی دوو/٢٠١٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 38 | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 39 | سیکۆلاریزمو دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبیو، شێوەزاری کرمانجیی |
| 40 | درەوشاوەیی ئیمانو پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماكو عەقڵو زانستو وەحییدا | چاپی یەك/٢٠١٩<br>چاپی دوو/٢٠٢٠ | |
| | **مەوسووعەی:**<br>**بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحییو واقیعدا** | | |
| 41 | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەتو سەر گوزشتەو سەرچاوەکانو گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| 42 | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| 43 | کتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| 44 | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| 45 | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| | **زنجیرەی:**<br>**باچاکتر ئیسلام بناسین!** | | ئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسووعەی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە |
| 46 | ئاڵقەی یەکەم: سەلماندنی بوونی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| 47 | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران "علیهم الصلاه والسلام" | چاپی یەك/١٩٨٩<br>چاپی دوو/١٩٩٠ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 48 | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| 49 | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | | دوایی خرایە ناو کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان) |
| 50 | بیررو بڕوا | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| | **فیقهی ئیسلامیی** | | |
| | **مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ)** | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| 51 | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاك‌و خاوێنیی | | |
| 52 | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| 53 | بەرگی سێیەم: زەکات‌و ماڵ بەخشین | | |
| 54 | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج‌و عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| 55 | بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| 56 | جەژن و یادو بۆنەکان‌و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| 57 | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە |
| 58 | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ‌و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار** | | |
| 59 | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| 60 | ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێردراوە بۆ زمانی عەرەبیو فارسییش |
| 61 | تەزکیەو تەبایی‌و، یەکڕیزیی‌و برایی | چاپی یەك/١٩٩٨ | |
| 62 | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| 63 | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخانو، وازهێنان لە گوناه و سەرپێچیی‌و، گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| 64 | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| 65 | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دوارۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 66 | گیانی ژیان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 67 | مەوسووعەی: ڕەوشتو ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| 68 | ئەدەبو ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لەبەر ڕۆشنایی وەحیی‌و عەقڵدا | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **بانگەوازو كاری ئیسلامیی** | | |
| 69 | كۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| 70 | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید كێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی چوار/٢٠٢٠ | |
| 71 | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| 72 | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| 73 | بزووتنەوەی ئیسلامییو قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| 74 | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| 75 | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەكانی كوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| 76 | بزووتنەوەی ئیسلامییو ئاسۆیەكی گەشو ڕوون، بنەما شەرعییەكان و بنچینە ئەخلاقییەكان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |
| 77 | ئیسلامو كێشە هەنووكەیی یەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| 78 | زانایانی ئیسلام كێنو چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| 79 | كۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانجو هەڵوێستەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| 80 | هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی دا و، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| 81 | چۆن لە جیهاد تێ بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 82 | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| 83 | جیهاد لەڕێی خوادا/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین و لەسەر جەنگ کردنمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| 84 | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| 85 | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| 86 | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و كاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| 87 | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| 88 | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>**ئاڵقەی یەکەم:** بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>**ئاڵقەی دووەم** : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| 89 | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| 90 | با لادان و تاوانی پەرگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 91 | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 92 | هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | |
| 93 | کێ شایستەی مینبەرو میحرابە؟ | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| | **زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی** | | |
| 94 | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| 95 | ئاڵقەی دووەمو سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| 96 | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەرەبیی |
| | **وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان** | | |
| 97 | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| 98 | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 99 | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکیمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد** | | |
| 100 | کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| 101 | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| 102 | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی سێ/٢٠٠٥<br>چاپی چوار/٢٠١٨ | |
| 103 | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| 104 | حاڵەتی ئیسلامیی لە کوردستاندا | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| 105 | جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | **سیاسەت و حوکمڕانیی** | | |
| 106 | چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | **مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی**، (٤ **بەرگ**) | چاپی یەك / ٢٠١٤ | |
| 107 | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| 108 | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| 109 | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان): یاسادانان جێبەجێکردن دادوەریی | | |
| 110 | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| 111 | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| 112 | قورئانو پاکسازیی‌و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| 113 | گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا | چاپی یەك/ ٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠١٩ | |
| 114 | واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆکارو چارەسەر | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| 115 | ئافرەتی مسوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی‌و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ چاپی دووەم / ٢٠٠٣ | |
| 116 | مەوسووعەی : ئافرەت‌و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢ بەرگی یەك‌و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| | **مێژوو** | | |
| 117 | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| 118 | چەند مەلۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 119 | بەرکولێکی کاروچالاکیی و ڕووداوەکانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی وەرگێردراوە |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| 120 | ستووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆر حسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| 121 | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بلاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| 122 | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان** | | |
| 123 | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| 124 | با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 125 | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێک دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 126 | چۆنیەتی بوونە پێشەنگو بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 127 | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 128 | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| 129 | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنجو ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 130 | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 131 | بانگەواز بۆ لای خودا چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| 132 | قوتابیان لەم هەلو مەرجەدا، پێویستە چۆن بنو چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| 133 | واقیعی هەرێمی کوردستان ، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| 134 | سروشتو پایەکانی خێزانو مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرعو عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| 135 | کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| 136 | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| 137 | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواروچاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 138 | لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی : هەبوونو نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| 139 | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| 140 | ڕەوەندی کورد لە هەندەرانو ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| 141 | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| 142 | گەنجو قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| 143 | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | ب/کتێبە عەرەبییەکان | | |
| | موسوعة :<br>الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الاولى/٢٠١٥ | |
| 144 | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | |
| 145 | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| 146 | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| 147 | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| 148 | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| 149 | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| 150 | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| 151 | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| 152 | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| 153 | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| 154 | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ط الثانية/٢٠١٩ | |
| 155 | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| 156 | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح عهم | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| 157 | نقض فكرة التطرف | ط الاولى/٢٠١٦-لندن، ط الثانية/ ٢٠١٧، - القاهرة (نقض التطرف ودحض افكار المتطرفين) | |
| 158 | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | - |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 159 | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| 160 | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى /٢٠١٦ | |
| 161 | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| 162 | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩<br>ط الثاني/٢٠١٣ | |
| 163 | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| 164 | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| 165 | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الاولى/ ٢٠٠٥<br>ط الثانية/ ٢٠٢٠ | |
| 166 | الأصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١<br>ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| 167 | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| 168 | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى<br>والثانية/٢٠١٨ | |
| 169 | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى /٢٠١٧ | |
| 170 | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| 171 | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى /٢٠١٨ | |

## ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن

| | |
|---|---|
| 172 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز/: تاکو سوورەتی: (الذاریات) خوا پشتیوان بێ کارکردن تێیدا بەردەوام دەبێ تا کۆتایی قورئان |
| | **زنجیرەی: مسوڵمانینە! با باشتر تێبگەین‌و پێبگەین کە لە: (١٢) کتێب پێکهاتوە** |
| 173 | بەرگی دووەم: هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی |
| 174 | بەرگی سێیەم: چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگاو پاکسازییی‌و چاکسازیی تێداکردنی |
| 175 | بەرگی چوارەم: بەرەو بانگەوازێکی ڕاست‌و ڕەسەن |
| 176 | بەرگی پێنجەم: پایەکانی بووناسیی‌و، ڕوونکردنەوەی ئیمان |
| 177 | بەرگی شەشەم: خواپەرستیی, تەزکیە, تەقوا |
| 178 | بەرگی حەوتەم: بنەما گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان |
| 179 | بەرگی هەشتەم: تایبەتمەندییە ئیمانیی‌و فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان |
| 180 | بەرگی نۆیەم: ڕەوشتبەرزیی دروشمی سەرەکیی جەماوەری مسوڵمانان |
| 181 | بەرگی دەیەم: چوار بابەتی سیاسی گرنگ‌و هەستیار |
| 182 | بەرگی یازدەیەم: بنچینە گرنگەکانی تەبایی‌و یەکڕیزیی مسوڵمانان |
| 183 | بەرگی دوازدەیەم: بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست‌و هاوسەنگ |
| 184 | قورئان‌و سوننەت وەك ڕوح‌و جەستە تێکهەڵکێشن |

# نێوەڕۆک

ئاڵقەی حەوتەم :



ئاڵقەی هەشتەم :



ئاڵقەی نۆیەم :



ئاڵقەی دەیەم :



ئاڵقەی یازدەم :



ئاڵقەی دوازدەیەم :



ئاڵقەی سێزدەیەم :



ئاڵقەی چواردەیەم :



ئاڵقەی پازدەیەم :

ئاڵقەی بیست و پێنجەم :



ئاڵقەی بیست و شەشەم :



ئاڵقەی بیست و حەوتەم :



ئاڵقەی بیست و هەشتەم :



ئاڵقەی بیست و نۆیەم :



ئاڵقەی سییەم :